# پرۆژەی

# بەرنامەی فیکری ی

# کاری ئیسلامی

سەرچاوەی وەرگرتن ، تێڕوانین ، بیروباوەڕ ، تێگەیشتن ، بناغەی کۆبوونەوە ، بنچینەکانی کاری ئیسلامی ، شێوازەکانی کاری ئیسلامی ، توێشووی ڕێگا ، دۆستانی پشتیوان ، دوژمن و ناحەزان ، ئامانج ، مەبەست .

نووسینی: عەلی باپیر

١٤١٧ ك                ١٩٩٦ ز

هەولێر

# پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی

سەرچاوەی وەرگرتن، تێڕوانین، بیروباوەڕ، تێگەیشتن، بناغەی کۆبوونەوە، بنچینەکانی کاری ئیسلامی، شێوازەکانی کاری ئیسلامی، توێشووی ڕێگا، دۆستانی پشتیوان، دوژمن و ناحەزان، ئامانج، مەبەست.

. . .

نووسینی: عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤١٧ ك ١٩٩٦ ز

هەولێر

# پێشکەش بێ

بەو وەچەو جیلە ئیسلامی یەی کەلەکوردستان‌و شوێنەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامدا بەعەقڵی تیژو بەهۆش‌و دڵی پڕ جۆش‌و خرۆشەوەو بەعەزمێکی پۆڵایینەوە بڕیاریان داوەو هەستاونە سەرپێ‌و کەوتوونە ڕێ‌و دەڵێن : هەتا بەرنامەو حوکمی خوای دادگەرو میهرەبان نەکەینە فەرمانڕەوای ژیان ناسرەوین‌و ناوەستین ، بەئومێدی ئەوە کەئەم نووسراوە بتوانێ بەرچاویان ڕوونترو ڕێگایان ناچووغترو پێیان چەسپاوترو بازنەی برایەتی یان فراوانترو ڕیزی خەباتیان مەحکەمتر بکات . . .

■ ■ ■

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

ئیسلامی یە بەڕێزو خۆشەویستەکان! ئەم پێشەکی یە دەرگای چوونەژوور ئەم کتێبەیەو بەپەسندم زانی بۆئەوەی سێناتر مەبەستەکانی وەربگیرێنو هەزم بکرێن هەر مەبەستێکی لەخاڵێکی سەربەخۆدا بنووسین کەسەرجەم مەبەستو باسەکانی لە (١٠) خاڵاندا پێشکەش دەکرێن:

## ١- گرنگیو پێویستی بەرنامە (منهج) بۆ ڕاپەڕاندنی هەر ئیشوکارێک:

بەرنامە بۆ ئیشوکار وەك ڕەگوڕیشە بۆ درەختو بناغە بۆ دیوار وایە، وەلەڕاستیدا هەرکەسێك بیەوێ لەجێبەجێکردنی کارێکدا سەرکەوتوو بێو ئەو ئامانجەی کەتێیدا ڕەچاوکراوە دەستگیر بکات، حەتمەن دەبێ پێش هەنگاونان (بەرنامە)ی ئەنجامدانی ئەو کارەی لەبەرچاو ڕوونو ئاشکرا بێت ئەگەرنا کارەکەی نەسەردەگرێو نەبەرێش، وەخاوەنەکەی جگە لەماندووبوونو ڕەنج بەزایەچوونو دەم لەپرووشبوون هیچ ئاکامێکی دیکەی نابێت، هەربۆیەش خوای کاربەجێ بەپێغەمبەری پێشەوامانی فەرمووە: ﴿ قل هذه سبيلي: أدعوا إلى الله على بصيرة أنا ومن اتبعني.. ﴾ يوسف (١٠٨) هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ثم جعلناك على شريعة من الأمر فاتبعها ولاتتبع أهواء الذين لايعلمون ﴾ الجاثية (١٨) دیسان فەرموویەتی: ﴿ ..لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا ﴾ المائدة (٤٨).

پێشینانیشمان ڕەحمەتیان لێبێ کەگوتوویانە: (شوغلا بکە ب ئەساس ئاڤلی نە نەکەت وەسواس).

## ٢- ئایا قورئانو سوننەت بەس نین کەبەرنامەی کاری ئیسلامی بن؟

بەڵێ... هەرکاتێك نووسینو پێشکەشکردنی بەرنامەیەك بۆ کاری ئیسلامی بکرێ. ئەم پرسیارە لەدڵو مێشکی هەندێ کەسدا سەرهەڵدەداتو ئێمەش ئاوا وەڵامی دەدەینەوە:

با، قورئانو سوننەت بەرنامەی تێرو تەواون بۆکاری ئیسلامی، بەڵام قورئانو سوننەت بەرنامەو پەیڕەوی گشتیی کارو خەباتی ئیسلامین بەدرێژایی زەمانو بەپانایی زەمین، کەواتە پێویستە بۆ هەر قۆناغێکو هەر ژینگە (بیئة) و کۆمەڵگایەك، بەرنامەیەکی تایبەت

لەو بەرنامە گشتی یەی قورئان‌و سوننەت هەڵهێنجین، بۆئەوەی وەڵام بەقەدەر پرسیارو کاڵا بارتەقای باڵاو قرباکەوتن بەپێی سکاڵا بێت‌و پڕ بەپێستی یەکتر بن.

بەڵێ...قورئان‌و سوننەت ئایین‌و بەرنامەی ئوممەتی ئیسلامین بەدرێژایی ڕۆژگارو بەپانایی جیهان، بەڵام بێگومان دەقەکانی قورئان‌و سوننەت جۆراوجۆرن‌و یاسار حوکمی جیاجیایان تێدان تاکو جێگای چارەسەری هەموو ئەو کێشەو گرفتە جۆراوجۆرو جیاجیایانەیان تێدا ببێتەوە کەلەقۆناغ‌و کۆمەڵگاو بارودۆخە جۆراوجۆرو جیاجیایەکانەوە پەیدا دەبن، بۆ وێنە: لەبواری هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتار لەگەڵ دوژمن‌و ناحەزاندا خوای کاربەجێ لەقورئانی‌دا فەرموویەتی:

- ﴿ فاصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين إنا كفيناك المستهزءين ﴾ الحجر (٩٣-٩٤).
- ﴿ ألم تر إلى الذين قيل لهم كفوا ايديكم واقيموا الصلاة وآتوا الزكاة ﴾ النساء (٧٧).
- ﴿ أذن للذين يقاتلون بانهم ظلموا وان الله على نصرهم لقدير ﴾ الحج (٣٩).
- ﴿ فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم ﴾ البقرة (١٩٤).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا قاتلوا الذين يلونكم من الكفار وليجدوا فيكم غلظة واعلموا أن الله مع المتقين ﴾ التوبة (١٢٣).
- ﴿ ..وقاتلوا المشركين كافة كما يقاتلونكم كافة واعلموا أن الله مع المتقين ﴾ التوبة (٣٦).
- ﴿ فإذا انسلخ الأشهر الحرم فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم وخذوهم واحصروهم واقعدوا لهم كل مرصد فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم إن الله غفور رحيم ﴾ التوبة (٥).

جاشتێکی ئاشکرایە کەناگونجێ هەموو ئەم دەقانە پێکەوە لەیەک کات‌و شوێن‌و لەقۆناغێک‌دا پیادە بکرێن، چونکە هەرکامێکیان تایبەتە بەحاڵێک‌و بەبارودۆخێکی تایبەتی‌یەوە.

## ٣- ئایا بەرنامەو پەیڕەوی لایەنە ئیسلامی یەکانی پێشوو بەس نین بۆ کاری ئیسلامی ئێمەش؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: وەک لەخاڵی دووەم‌دا گوتمان هەرکام لەبزووتنەوەو کۆمەڵە ئیسلامی یەکان بەگوێرەی داخوازی‌و پێداویستی یەکانی ئەو بارودۆخ‌و قۆناغە تایبەتی یەی کەتێیدا بوون، بەپێی ئیجتیهادی خۆیان لەقورئان‌و سوننەت بەرنامەو پەیڕەوی کارو چالاکی خۆیانیان هەڵهێنجاوەو دیاری کردووە. کەواتە: بەرنامەی کارو خەباتی هەر بزووتنەوەو کۆمەڵێکی ئیسلامی هەرچەندە هەر لەقورئان‌و سوننەتەوە وەرگیراوە، واتە هەرچەندە سەرچاوەی هەموویان یەکە، بەڵام جیاوازی‌و

تایبەتمەندییەکانی بارودۆخ و قۆناغی هەر کامێکیان لەلای ئەوانی تر، لەلای ئێمەش، وای کردووە کەمەگەر وەک ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکی ئیسلامی و بەشێک لەبەرهەم و کەلەپووری زانا و پێشەوایانی پێشینانمان، ئەگەرنا ناگونجێ دەقاودەق و مووبەموو، هیچ کام لەو بەرنامەو پەیڕەوانە لەقۆناغ و کۆمەڵگایەکی تردا دووپات بکرێتەوە.

بەکورتی ئەم بارودۆخەی ئێستامان و حەل کردنی کێشەو گرفتەکانی پێویستی بەدەرمان و چارەسەرێک دەکات لەدەرمانخانەی قورئان و سوننەت بۆی سازبکرێ و بگیرێتەوە، کەهەتا ئێستا بەو شێوەو چۆنییەتی و ئەندازەو تایبەتمەندییانەوە کەبارودۆخ و قۆناغی ئێمە داخوازی دەکات هیچ کەس سازی نەکردووەو ئەوە ئەرکی ئێمەیە کەبەو کارە مەزنە هەستین، بەڵام لەبەر تیشکی ئەزموونگەلی تاڵ و شیرینی جۆراوجۆری کار و خەباتی ئیسلامیدا.

## ٤- بۆچی ئەم کتێبە ناونراوە: پرۆژەی بەرنامەی فیکری کاری ئیسلامی؟

لەوەڵامدا دەڵێین: چونکە ئەم هەوڵ (محاولة)ە بۆ ڕوونکردنەوەی جۆر و چۆنیەتی ئەنجامدانی کار و چالاکی و جموجۆڵی ئیسلامی بە (هەنگاو)ێک و جۆرێک لە (اجتهاد) و تێگەیشتن دەزانین لەو بارەوە. نەک شتێکی کامڵ و تەواو و وتەو وێژەو مشتومڕ و هەڵسەنگاندن هەڵنەگر. بۆیە ئەو ناوەمان لێناوە بەهیوای ئەوە کەبەهەوڵ و هەڵسەنگاندنی دڵسۆزان ببێتە شتێکی کامڵ و جێگای یەکدەنگی زۆربە یان هەموان.

کەوابێ: باهەموو لایەک بزانن کەبەسینگێکی فراوانەوە چاوەڕێی هەر جۆرە پێشنیار و ڕەخنەو تێبینییەک دەکەین، بەڵام لەگەڵ دوو ئامۆژگاریدا:

یەکەم: دوای چاک تێگەیشتن و قووڵ ڕۆچوون و وردبوونەوە بێ.

دووەم: لەپشت پەردەی ڕەش و تاڵەوە تەماشا نەکات و سەرەتا سینەی خۆی پاک بکاتەوە، دیارە ئەم دوو ئامۆژگارییەش هاوکارییەکی باش دەکەن بۆ چاکتر پێکان و لەنیشانەدان.

## ٥- ئامانج لەنووسینی ئەم پرۆژەیە چییە؟

ئامانج لەنووسین و پێشکەش کردنی ئەم پرۆژەیە ئەوەیە کەلاوانی کەم ئیسلامییە بەڕێزەکان لەجۆری تێگەیشتن و ئەزموونگەلی یەکێک لەڕێبوارانی ڕێگای کار و جموجۆڵی ئیسلامی شارەزا بن. بەشکم ئەوە خوایە یارمەتییان بدات بۆ زیاتر ئاشنابوون بەو ڕێبازەو چاکتر سەردەرچوون و پتر بەرچاو ڕۆشن بوون لەو بوارەدا. دیارە کارکردنیش بۆ ئیسلام و هەوڵدان بۆ بەرپاکردنی لەواقیع و ژیان و گوزەرانی خەڵکیدا. ئەرکێکی هێندە مەزن و بارێکی هێندە قورس و کارێکی هێندە پڕ مەترسی و شەمەجۆر و بەزەحمەتە. کەبەرچاوڕوونی و شارەزایی هەر لەدەستپێکردنی یەکجار گرنگ و پێویستە.

## ٦- ئەم کتێبە بۆکێ نووسراوە؟

لەڕاستیدا - پێم وایە - هەرکەسێك ئەم کتێبە بخوێنێتەوە کەم و زۆر لێی بەهرەمەند دەبێ، بەڵام ئەم کتێبە زیاتر بۆ ئەوانە نووسراوەو ئەوانەی تێدا ڕەچاوکراون کە بە (ئیسلامییەکان) ناسراون بەهەر جۆرو شێوەیەك لەجۆرو شێوە شەرعییەکانی کاری ئیسلامی سەرگەرمی کارو چالاکین و لەنێو هەراو جەنجاڵ و جەنگەڵ و چڕوخوردی ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤزادەکاندا بوێرانە بەدەنگێکی زوڵاڵ و دلێر خەڵکی بەرەولای خواو بەرنامەکەی بانگ دەکەن و بەڕاشکاوی و بێباکانە پێیان دەڵێن: پەرستراو (معبود) ی هەق بەس خودایەو بەرنامەی ڕاست و ڕەوای ژین تەنها ئیسلام و موحەممەدیش ﷺ تاقە پێغەمبەرێکە کەچاکترین و دوایین نوسخەی دانستەی هیدایەت و شەریعەتی خودای بۆ مرۆڤایەتی پێدا ڕەوانەکراوە، شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو پێشەواو سەرورەش بەهیچ شێك قەرەبوو (تعویض) ناکرێتەوە، بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوارۆژیش تەنهاو تەنها لەڕێگای وی یەوە مسۆگەر دەبێ چ لەسەر ئاستی تاك و چ لەسەر ئاستی کۆمەڵیش.

## ٧- بەشەکانی ئەم کتێبەو حیکمەتی ڕیزکرانیان بەم شێوەیە:

ئەم کتێبە سەرجەم لەم دوازدە (١٢) بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە:

| | |
|---|---|
| بەشی یەکەم: | سەرچاوەی وەرگرتن (مصدر التلقي). |
| بەشی دووەم: | تێڕوانین (التصور). |
| بەشی سێیەم: | بیرو باوەڕ (العقيدة). |
| بەشی چوارەم: | تێگەیشتن (الفهم). |
| بەشی پێنجەم: | بناغەی کۆبوونەوە (أساس التجمع). |
| بەشی شەشەم: | بنچینەکانی کاری ئیسلامی (قواعد العمل الإسلامي). |
| بەشی حەوتەم: | شێوازەکانی کاری ئیسلامی (أساليب العمل الإسلامي). |
| بەشی هەشتەم: | توێشووی ڕێگا (زاد الطريق). |
| بەشی نۆیەم: | دۆستانی پشتیوان (الأولياء الناصرون). |
| بەشی دەیەم: | دوژمن و ناحەزان (الأعداء). |
| بەشی یازدەهەم: | ئامانج (الهدف). |
| بەشی دوازدەهەم: | مەبەست (الغاية). |

حیکمەت و هۆی ڕیزکرانی ئەم باس و بابەتانەش بەم چەشنەی سەرەوە ئاوایە:

یەکەمین هەنگاوی دەست بەکاربوونی کەسێك یان کۆمەڵێك کەدەیەوێ کار بۆ ئایینی خوا بکات، هەبوونی بەرنامە (منهج) یکەو ئەمیش بەبێ سەرچاوە پەیدا نابێ، بۆیە دیاریکردنی (سەرچاوەی وەرگرتن) کراوەتە بەشی یەکەم.

پاشان جۆری تێڕوانینی ئینسان دەربارەی بوون (الوجود)، یەکەمین شتە کەئینسان

لەبەرنامەیەکی چارەڕوان دەکات، بۆیە ئەمیش کراوەتە بەشی دووەم.

ئنجا هەڵوێستر شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ (بوون) دا دووەمین شتە کەلەبەرنامەیەك چاوەڕوان دەکرێ ڕوونی بکاتەوە، بۆیە مەسەلەی بیروباوەڕ (عقیدە) یش لەڕوانگەی ئیسلامەوە بۆتە بەشی سێیەم.

ئنجا جۆری تێگەیشتنو حاڵیبوون لەبەرنامەو ئایین نۆرەی مەنتیقی خۆی دەگاتە سەر، چونکە هەرچەندە سەرچاوەی ئایین وەرگرتنت دیار بێو بەهۆی جۆری تێڕوانینەوە بزانی شوێنت لەئیعرابی بوونەدا چییەو کوێیەو، لەسۆنگەی بیروباوەڕیشەوە بزانی کەدەبێ هەڵوێستت چۆن بێ، بەڵام هەتا جۆرە تێگەیشتنو شارەزاییەکی ڕاستو تەواوت دەربارەی ئایین نەبێ ناتوانی بەشێوەیەکی ڕاستو ڕەوان بجووڵێتو دینداری بکەیت!

لەدوای (تێگەیشتن) یش لەبەشی پێنجەمدا باسی (بناغەی کۆبوونەوە) کراوە چونکە بابای موسڵمان باهەموو قۆناغەکانی: (سەرچاوەی وەرگرتن) و (تێڕوانین) و (بیروباوەڕ) و (تێگەیشتن) یشی بەچاکیو سەلامەتی بڕیبێ، بەڵام هەتا خۆیو براو خوشکانی تری لەسەر بناغەیەکی ڕاستو درووستو شایستە کۆنەبنەوەو نەهۆنرێنەوەو جۆش نەدرێن، دیارە باری گەورەو گرانو کاری هەمەلایەنەو فراوانی ئیسلامیان بۆ هەڵناگیرێو بۆ جێبەجێ ناکرێ.

ئنجا لەبەشی شەشەمدا باسی ئەو پایەو بنچینانە کراوە کە کارو خەباتی ئیسلامییان لەسەر بنیاد دەنرێو، لەبەر ڕۆشنایی واندا ئەنجام دەدرێ.

شێوازەکانی کاری ئیسلامیش بۆیە کراوەتە بەشی حەوتەم چونکە کارو چالاکیی ئیسلامی تەنها لەقۆناغێکو دوواندا ئەنجام نادرێو، شتێك نیە کەبەشەو ڕۆژێك سەروبەر بگرێ. جادیارە بەگوێرەی جیاوازی قۆناغەکانی کار شێوازو ئامرازەکانیشی دەگۆڕێنو، ڕوونکردنەوەی جۆرو چۆنیەتی شێوازو ئامرازەکانی قۆناغە جیاجیار یەك لەدوای یەکەکانی کاری ئیسلامیش یەکجار گرنگە بۆ بەهەڵەداندچوونو سەرەنگری نەبوون لەبارەوە.

ئنجا - بێگومان - هەموو ڕێبوارێك حەوجێی بەهەڵگرتنی توێشوو و زادو زەخیرەی ڕێگا هەیە، تاکو بەسەلامەتی ڕێ ببڕێو بەسەرکەوتوویی بگاتە هەوارو مەنزڵ، بۆیە بەشی هەشتەمیشمان کردۆتە: (توێشووی ڕێگا).

پاشان لەبەشی نۆیەمو دەیەمدا دوو مەسەلەی هەرە گرنگی ئیسلام لەبواری سیاسیو کۆمەڵایەتیدا (دۆستایەتیو دوژمنایەتی - الولاء والبراء -) توێژراونەتەوە پێناسەی دۆستو پشتیوانەکانی کارو کۆمەڵی ئیسلامیو دوژمنو ناحەزەکانیشی کراوەو تیشکیان خراوەتە سەر.

وەلەکۆتاییدا لەبەشی یازدەهەمو دوازدەهەمدا ئامانجو مەبەستی کۆمەڵی خواو کاری ئیسلامی ڕوون کراونەتەوە، چونکە لەڕووی ڕیزکردنی کاتی (الترتيب الزمني) یەوە

(ئامانج) دوایین قۆناغی دنیایی کارو خەباتی ئیسلامییەو (مەبەست) یش دوایین قۆناغیەتی و بەرهەم و ئەنجامیەتی لەدوارۆژدا، کەیەکەمیان لەبەرپاکردنی ئایین (إقامة الدین) دا، دووەمیشیان لەڕەزامەندیی خواو بەهەشتی ڕازاوەو بەریندا خۆی دەنوێنێ.

## ٨- سەرچاوەی ئەم کتێبە چین؟

سەرچاوەی بەندە بۆ نووسینی ئەم کتێبە ئەمانەن بەریز:

یەکەم: قورئانی بەرزو مەزن و بەرێزو پڕپیت و پیرۆزی خوای پەروەردگار.

دووەم: سوننەتی پێغەمبەری پێشەواو سەروەر ﷺ.

سێیەم: بەرهەم و کەلەپووری زاناو پێشەوایانی ڕابردوو و هاوچەرخ دوای هەڵسەنگاندن و گوڵبژێر.

چوارەم: تێگەیشتن و ئەزموونگەل (تجارب) ی خۆم لەبارەی ئیسلامەوە، لەبواری کارو خەباتی ئیسلامیدا.

## ٩- ئەم کتێبە:

ئەنجام و بەرهەمی بیرکردنەوەو رامان و لێکۆڵینەوەو نزاو پاڕانەوەی چەند ساڵێکەو هیوادارم بەسەرپێیی موتالا نەکرێ و گرنگی و بایەخی شایستەی خۆی پێبدرێ و ئەوەندە کاتەی لەگەڵ بەسەر ببرێ کەبایی لێحالیبوون و هەزم کردنی و . ئەگەر توانای بوو . هەڵسەنگاندنی بکات.

## ١٠- لەکۆتایی ئەم پێشەکییەشدا دەڵێم:

خودایە! ئەی پەروەردگاری میهرەبان و بەخشەر! ئەی دەرووکەرەوەی یارمەتیدەر! بەلوتف و کەرەمی خۆت دەستمان بگرەو ڕێنماییمان بکەو سەرکەوتوومان بکە، کەبەهۆی بەندایەتی کردن بۆتۆوە خۆمان وا لێبکەین و شایستەی ئەوە بین جێگای ڕەزامەندیی تۆ بین و بتوانین هەموو قۆناغەکانی کارو خەباتی ئیسلامی ببڕین و، هەموو پلەو خاڵەتەکانی هەڵبوێرین، هەتا لەژیانی دنیاماندا ئامانجی بەرزی (بەرپاکردنی ئایین) جێبەجێ دەکەین و لەدوارۆژیشدا بەباڵاترین (مەبەست) دەگەین کەڕەزامەندیی و دیداری خواو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیە، تاکو بەختەوەری ئێرەو سەرفرازو بەمراد گەیشتووی ئەوێ بین.... ئامین.

براتان

عەلی باپیر

■ ■ ■

# مەبەست لەسەرچاوەی وەرگرتن

مەبەست لەسەرچاوەی وەرگرتن ئەو سەرچاوەیەیە کەئینسانی موسڵمان و کۆمەڵی خوا (جل جلالە) بەرنامەو پەیڕەو (المنهج والنظام) ی ژیانیانی لێوەردەگرن، هەر لەتێڕوانین و بیروباوەڕو جۆری تێگەیشتن لەئایین و شێوازو بنچینەکانی کاری ئیسلامییەوە بگرە هەتا ناسینی دۆست و پشتیوان و دوژمن و ناحەزان و زانینی بناغەی کۆبوونەوەو توێشووی ڕێگاو ئامانج و مەبەست و... هتد.

جاشتێکی ڕوون و ئاشکرایە کەتاقە سەرچاوەیەك شایستەی ئەوەبێ کەبەرنامەو پەیڕەوی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵی لێوەبێ بەس ئەو زاتە بەرزو بێوێنەو هاوتایەیە کەسەرچاوەی پەیدابوونی ئینسان و هەموو شتێکی دیکەشە، واتە (خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار). بەڵام ئاسمان و ڕێسمان زۆر لێك دوورن و عارەب گوتەنی (أين الثرى من الثريا! ) خوای بەرزو مەزن و پەروەردگارو بێهەڵەو پەڵەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاك و پەسند لەکوێ و ئینسانی کەم و گچکەو دروستکراو لەکوێ!! بەڵام ئەوەی لای ئێمە خەیاڵێکی مەحاڵە لای خوا شتێکی بەتاڵە، بۆیە دەبینین خوای کاربەجێ بەهۆی (وحی) یەوە ئەو مەتەڵەی حەل کردووە.

بەڵێ... خوای پاك و بێوێنە لەڕێگای (وحی) یەوە بەفریشتە پاك و بێگەردەکانی پەیام و بەرنامەی خۆی پەیتا پەیتا بۆ ئینسانانی بەرزو هەڵبژاردە - پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام - ناردووەو ئەوانیش پەیام و بەرنامەی خوایان لەدووتوێی وتارو کردەوەو ڕەفتاری پێغەمبەرانەیاندا بەخەڵکی ڕاگەیاندووەو پێشانیان داون. هەتا دوایین نوسخەی وەحی و چاکترین و تەواوترین بەرنامەو پەیڕەوی خوا بۆ گەورەترین پێغەمبەری پێشەوا (محمد ﷺ) هات و بەم جۆرە ئایینی کۆتاییی خوا لەکتێبی خۆی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (القرآن والسنة) دا ڕاگەیەنرا.

کەواتە...

تاقە سەرچاوەیەك کەدەبێ ئینسان هەر لەوەوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی وەربگرێ ئایینی ئیسلامە ﴿ - ورضيت لكم الإسلام دينا ﴾ المائدة (٣)، ئیسلامیش بریتییە لەو وەحییە ڕاستەوخۆ (قورئان) و ناڕاستەوخۆ (سوننەت) یەی کەلەسەر زمان و لەڕێی کردەوەو بڕیارەکانی موحەممەدەوە ﷺ ڕاگەیەنراوە.

دەتوانین ئەم هۆیانەی خوارەوەش بکەینە بەڵگەی ئەوە کەبۆچی دەبێ ئینسان بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی تەنها لەخوارە بۆ بێوبەس دەبێ لەو سەرچاوە ڕوون و زوڵاڵە وەربگرێ:

**یەکەم:**

لەبەسەرهاتی یەکەمین ئینسان (ئادەم - علیه السلام -) دەفامرێتەوە کەئینسان ئەگەر پابەندی بەرنامەو هیدایەتی خوا نەبێ، گیرۆدەی تەڵەو داوی ئیبلیس ئەگریس دەبێ،

چونکە ئادەم و هاوسەرەکەی هەتا بەپێی ڕێنوێنییەکانی خوا بەڕێوە دەچوون ژیانێکی زۆر بەختەوەرانەو بێدەردەسەرییان دەبردە سەرو بێ گیروگرفت و بەڵا بوون، بەڵام دوای ئەوەی لەقسەو فەرمانی خوا دەرچوون و کەوتنە ژێر ڕکێفی هێزی کێشندەی وەسوەسەی ئیبلیسی پیس، دووچاری سەرگەردانی بوون و بێسالاربوون، وەهەتا جارێکی دیکە لەگەڵ خوای پەروەردگاریان ئاشت نەبوونەوەو لەلاڕێبوون و سەرەڕۆیی پەشیمان نەبوونەوەو نەکەوتنەوە سەرخەت و ڕێبازو ژێر سێبەری لوتفی ئەو، لەشپرزەیی و ژینتاڵی قوتاریان نەبوو، ئەمەش کورتەی سەرگوزشتەی یەکەمین ئینسان و بابی هەموومان سەلامی خوای لێبێ:

﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا الا إبليس أبى. فقلنا ياآدم أن هذا عدو لك ولزوجك فلايخرجنكما من الجنة فتشقى. إن لك ألا تجوع فيها ولاتعرى. وإنك لاتظمؤا فيها ولاتضحى. فوسوس إليه الشيطان قال ياآدم هل أدلك على شجرة الخلد وملك لايبلى؟ فأكلا منها فبدت لهما سوءاتهما وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة وعصى آدم ربه فغوى. ثم اجتباه ربه فتاب عليه وهدى ﴾ طه (١١٦-١٢٢) .

بەڵێ تەجرەبەی تاڵی یەکەمین ئینسان سەلماندی کەئینسان بەبێ ڕێنوێنی خوا ناتوانێ ژیانێکی درووست و بەختەوەرانە بەرێتەسەر ﴿ وعصى آدم ربه فغوى ﴾، چونکە شەیتان هەموو دەمێ بۆ ئینسان لەبۆسە (کمین) دایەو مرۆڤیش حاڵی لەدوو لایان خاڵی نییە؛ یان دەبێ (ڕەببانی) بێ یان دەبێتە (شەیتانی)! بەڵام کاری ئینسان بەوە چاك بووە کەهەروەك چۆن ئامادەیی فریوخواردن و خلیسکانی هەیە ﴿ فأزلهما الشيطان ﴾ البقرة(٣٦)، ئامادەیی گەڕانەوە (توبە) و دووبارە وەرگرتنەوەی ڕێنوێنیشی هەیە: ﴿ فتلقى آدم من ربه كلمات فتاب عليه ﴾ البقرة (٣٧).

کەواتە: هەر لەدوای تەجرەبەی تاڵ و بەسوود و سوێی یەکەمین ئینسان سەرەنجام و چارەنووسی مرۆڤایەتی ئاوای لێهات کەخوا دەفەرموێ: ﴿ فإما يأتينكم مني هدى ـ فمن تبع هداي فلا يضل ولايشقى ومن أعرض عن ذكري ـ فإن له معيشة ضنكا ونحشره يوم القيامة أعمى ﴾ طه (١٢٣-١٢٤).

**دووەم:**

ئینسان یەك جار لەدنیا دەژیت و بەس یەك تاقە دەرفەتی تاقیکردنەوەی هەیە، مادام وابێ پێویستە ئەم ژیانە کەتاقە هەڵ و دەرفەتێکە بۆی ڕەخساوە جارێکیتر چاوی پێی ناکەوێتەوە، لەسەر بنچینەی هیدایەت و بەرنامەیەکی ڕاست و درووست و مسۆگەرو جێی متمانەو دڵنیایی تەواو بەرێتە سەر، چونکە کەسێك تاقە دەستمایەیەکی هەبێ زۆر بەتەنگییەوە دەبێ کەکاسبی و سەودایەکی پێبکات جێی قازانج بێ، ججای تەمەنی ئینسان لەسەر زەوی کەبۆ ئەو بەقیمەتترین دەستمایەیە چونکە دەستمایەی بوون

(وجود)بەتی‌و چاکترین قازانج یان گەورەترین زیانیشی پێوە بەندە کەژیانی هەمیشەیی بەهەشت یان دۆزەخی نەبڕاوەیە!!

جائێمە دەبینین ئەو بیردۆزەو بۆچوونانەی لەعەقڵ‌و ئەزموونی مرۆڤەوە پەیدا دەبن زۆر زوو چەوتی‌و ناتەواوی‌یان دەردەکەوێ‌و لەگەڵ فیطرەتی ئینسان‌و رەوتی ژیانیدا ناگونجێن‌و ناچارە ئەوان قرێ دەدار پەنا دەباتە بەر هەندێکی دیکەو... ئیدی هەروەها، بۆ وێنە سەرنج بدە مێژووی هەرکام لە: لیبرالیزم، مارکسیزم، کابیتالیزم، ناسیونالیزم، ئەکزێستانیسیالیزم... هتد.

کەواتە، پێویستە ئەو رێبازو رێنموونی‌و بەرنامەیەی کەئینسانی پێ بەرێوە دەچێ‌و ژیانی کۆمەڵگای پێ رێك دەخرێ، لەسەرچاوەیەکەوەبێ کەخاوەنی زانیاری‌یەکی تێروتەواو بێ‌و رابردوو وئێستاو داهاتووی ئینسان‌و ژیانی لێ دیار بێ، وەدەبێ هیدایەت‌و بەرنامەی ژیانی ئینسان لەسەرچاوەیەکەوە بێ کەئینسان لەسەرووی خۆیەوە ببینێ‌و لێی دڵنیا بێ‌و پێی پشت ئەستوور بێ‌و جێی شەرم‌و سام‌و رێزی بێ، جابێگومان ئەو سەرچاوەیەش بەس خودای پاك‌و تاك‌و زانار کاربەجێ‌یە.

**سێ‌ یەم:**

بەس خودا بەدیهێنەرو نەخشێنەرو پەروەردگارو ژێنەرو مرێنەرو زیندووکەرەوەو لێپرسەرەوەو سزادەرو پاداشت دەرەوەی ئینسانەو هەر ئەویش مافی ئەوەی هەیەو شایستەی ئەوەیە کەئینسان رێنمایی بکات‌و ژیان‌و گوزەرانی رێك بخات‌و پێی بڵێ ئاوا بکەو ئاوا مەکەو ئەوە چاکەو ئەوە خراپە، چونکە هیچ کەس هێندەی خودای بەدیهێنەر هەقی بەسەر دروستکراوەکەیەوە نیەو هیچ کەسیش هێندەی وی ئینسان ناناسێ‌و رێزی لێ‌ناگرێ‌و ئەمیەتی پێ‌نادات‌و خۆشی ناوێ، ئەمەش چەند دەقێك بۆ سەلماندنی هەر کام لەم چوار مەسەلانە:

- ﴿ الا يعلم من خلق وهو اللطيف الخبير ﴾ الملك (١٤)، بەڵێ... هیچ کەس وەك دروستکەر (خالق) دروستکراو (مخلوق) ناناسێ.
- ﴿ وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة ﴾ البقرة (٣٠)، ﴿ ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا ﴾ الإسراء (٧٠)، ﴿ وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل بشرا من طين فإذا سويته ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين فسجد الملائكة كلهم أجمعون ﴾ ص (٧١-٧٢).
- لە (مسند) ی ئیمام ئەحمەدی کوری حنبەلدا هاتووە کەژمارەی ئەو پێغەمبەرانەی خودا بۆ مرۆڤایەتی رەوانی کردوون (١٢٤٠٠٠) سەدو بیست‌و چوار هەزارە، دیارە ئەمەش ئەوپەری بایەخ‌پێدانی خوا بۆ مرۆڤ دەگەیەنێ، دیسان خوای پەروەردگار رای‌گەیاندووە کەهەرچی لەبوونەوەردا هەیە بۆ ئینسانی رام‌و مەیسەر کردووە:

﴿ وسخر لكم مافي السموات ومافي الأرض جميعا منه إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ﴾ الجاثية (١٣).

■ بۆ ئیسپاتی ئەوەش كەخودای بەرزو مەزن لەهەموو كەس زیاتر ئینسانی خۆش دەوێ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بەنموونە دێنینەوە: عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: قدم رسول الله ﷺ بسبي فإذا امرأة من السبي تسعى إذ وجدت صبيا في السبي اخذته فالزمته ببطنها فأرضعته فقال رسول الله ﷺ : ﴿ أترون هذه المرأة طارحة ولدها في النار؟ ﴾ قلنا: لا والله، فقال: ﴿ الله أرحم بعباده من هذه بولدها ﴾ متفق عليه.

بەڵێ... خۆشەویستی‌و سۆزی دایك بۆ جگەرگۆشەكەی لەهەموو جۆرە سۆزو بەزەیی‌و خۆشەویستی‌یەكی دیكە بەتین‌ترە كەچی خۆشەویستی‌ی خودا لەو جۆرە خۆشەویستی‌یەش زیاترو بەجۆش‌ترە.

•

**چوارەم:**

ئینسانە بۆ بەندایەتی بۆ خواكردن‌و تاقی‌كردنەوە درووست كراوە وەك خوای بێ‌وێنە فەرموویەتی: ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦) وە فەرموویەتی: ﴿ الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا ﴾ الملك (٢)، جابێگومان بەس خودای بەدیهێنەرو پەروەردگاریشی دەتوانی ڕێڕوونی‌ی بكات‌و ژیانی ڕێك بخات، چونكە هەر ئەو دەزانێ چۆن‌و بەچی دەبێتە بەندەیەكی چاك‌و وەفادارو جێی ڕەزامەندی‌ی وی‌و چۆن‌و بەچی لەتاقی‌كردنەوەی ژیانی دەردەچێت، هەربۆیەش ئەوانەی كەلەهیدایەتی خوا بێ‌بەش دەبن‌و لەڕێبازی وی لادەدەن سەرەڕای ئەوەی كەبەندەیەكی سپڵەو بێ‌وەفا دەردەچن‌و دووچاری تووڕەیی‌و سزای خوا دەبن لەئینسانەتیش دەشۆرێن‌و دەچنە ڕیزی ماڵات: ﴿ ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والإنس لهم قلوب لايفقهون بها ولهم أعين لايبصرون بها ولهم آذان لايسمعون بها أولئك كالأنعام بل هم أضل أولئك هم الغافلون ﴾ الأعراف (١٧٩)، بگرە دەبنە خراپترین جانەوەر: ﴿ إن شر الدواب عند الله الذين كفروا ﴾ الأنفال (٥٥)، بەڵكو ئینسانی خوانەناس‌و لارێ‌و سەرگەردان هێندە بەزەلكاوی نزمی‌و پەستیدا دەچێتە خوارو ئەوەندە بەچاڵی بەدحاڵی‌دا شۆڕ دەبێتەوە كەهیچ شتێك تۆزی ڕێگاشی ناشكێنێ، وەك خودای دادگەرو بالآدەست فەرموویەتی: ﴿ لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم ثم رددناه أسفل سافلين إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات ﴾ التين (٤-٦).

**پێنجەم:**

ئەو بوونەوەرو دەوروبەرەی كەئینسانی تێدا دەژی‌و بۆی مەیسەر كراوە ووردو درشتی لەلایەن خودای پەروەردگارەوە نەخشەو بەرنامەی بەڕێوەچوونی بۆ دیاركراوە وەك خودای زانا لەسەر زمانی موسا (عليه السلام) لەوەڵامی فیرعەوندا فەرموویەتی: ﴿ ربنا الذي

اعطى كل شيء خلقه ثم هدى ﴾ طه (٥٠)، جاهەر بۆئەوەی دەنگی ئینسان لەنێو دەنگی کۆرسی کائیناتدا ناسازو ڕێزپەڕو بۆڕ نەبێ‌و ڕەوتی لەڕەوتی بوونەوەر جیا نەبێ وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ أفغير دين الله يبغون وله أسلم من في السموات والأرض طوعا وكرها وإليه يرجعون ﴾ آل‌عمران (٨٣)، وەهەم بۆ ئەوەی ئێرانی لەگەڵ دەوروبەرو بوونەوەردا تێك نەچێ‌و دەرگاو دەروازەکانی خێرو بەرەکەتی ماددی‌و مەعنەوی لەسەر دانەخرێن وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت أيدي الناس ليذيقهم بعض الذي عملوا لعلهم يرجعون ﴾ الروم (٤١) ، وەفەرموویەتی: ﴿ ولو أن أهل القرى آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض ﴾ الأعراف (٩٦).

بەڵێ.. لەبەر هەر کام لەم هۆیانە پێویستە ئینسانیش هەر لەو سەرچاوەیەوە بەرنامەی پەیڕەوی ژیانی وەربگرێت کەئەخشەو بەرنامەی سەرلەبەری کائیناتی لێوە دەرچووە، جائەو کاتە هەروەك چۆن هەڵەو پەڵەو نارێکی لەهاتن‌و چوون‌و بەڕێوەچوونی کائیناتی دیکەی بوونەوەردا نابینرێ بەهۆی پابەندی‌یان بەئەخشەو بەرنامەی خواوە، لەژیان‌و گوزەرانی ئەویشدا نابینرێ، خوای پەروەردگار لەوبارەوە کەبوونەوەر بەهۆی بەڕێوەچوونی بەپێی بەرنامەی خوداوە ئەوپەڕی یاساداری‌و ڕێك‌و پێکی تێدایەو هیچ کەم‌و کوڕی‌یەکی تێدا نیە فەرموویەتی: ﴿ الذي خلق سبع سموات طباقا ماترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور. ثم ارجع البصر كرتين ينقلب إليك البصر خاسئا وهو حسير ﴾ الملك (٣-٤).

# چەند تێبینی‌یەکی گرنگ دەربارەی سەرچاوەی وەرگرتن

## تێبینی‌ی یەکەم:

ڕەنگە ئەو پرسیارە بێتە دڵی زۆر کەسەوە کە: باشە ئەوە شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کەدەبێ بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی ئینسان لەڕێگای ڕەحی‌یەوە لەلایەن خواوە بێت، بەڵام کوا بەچ بەڵگەیەك دەسەلمێنرێ کەدوایین ئایین‌و بەرنامەو پەیڕەوی خوا بۆ مرۆڤ لەقورئان‌و سوننەتدا تەجەللای کردووەو کورت هەڵاتووە؟ ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

(١) لەزۆر جێگای قورئانیدا خوا فەرمانی پێ‌کردووین کەفەرمانبەری خۆی‌و پێغەمبەرەکەی کە موحەممەدە ﷺ بکەین، بۆ وێنە:

■ ﴿ ومن يطع الله والرسول فأولئك مع الذين أنعم الله عليهم من النبيين

والصديقين والشهداء والصالحين وحسن أولئك رفيقا ﴾ النساء (٦٩).

- ﴿ قل أطيعوا الله والرسول فإن تولوا فإن الله لايحب الكافرين ﴾ آل‌عمران (٣٢).
- ﴿ قل أطيعوا الله وأطيعوا الرسول فإن توليتم فإنما عليه ماحمل وعليكم ماحملتم وأن تطيعوه تهتدوا وما على الرسول إلا البلاغ المبين ﴾ النور (٥٤).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا لاتقدموا بين يدي الله ورسوله واتقوا الله إن الله سميع عليم ﴾ الحجرات (١).
- ﴿ ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ الأحزاب (٧١).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم فإن تنازعتم في شئ فردوه إلى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر ذلك خير وأحسن تاويلا ﴾ النساء (٥٩).

شایانی باسە کەئەم ئایەتەی دوایی تاقە شوێنێکە لەقورئانیدا کەوێرای فەرمانبەری بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ داوا لەبڕیارداران کراوە کەفەرمانبەریی کاربەدەستانی خۆشیان بکەن بەڵام لەگەڵ دوو جیاوازیی گرنگدا:

یەکەم: وشەی (اطیعوا) بۆ (اولی الأمر منکم) دووبارە نەبۆتەوە.

دووەم: فەرمان بەبڕیارداران کراوە کە لەکاتی کەوتنە کێشەو جیاوازییەوە بگەڕێنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ ، وەلەمەوە دەردەکەوێ کەمەسەلە لەفەرمانبەری کردن بۆ لێپرسراوو کاربەدەستانیش هەر جێبەجێ‌کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ ، ئینجا شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە کەمەبەست لەفەرمانبەری‌کردنی خواو پێغەمبەر کارکردنو بەڕێوەچوونە بەپێی ڕێبڕوونی یاساکانی قورئانو سوننەت، چونکە بەس لەڕێی قورئانەوە دەزانین خوا چیی لێمان دەوێو تەنها لەڕێی سوننەتیشەوە دەزانین پێغەمبەرمان ﷺ فەرمانی لەسەر چییە.

(ب) هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ لەچەند فەرموودەیەکیدا پێی ڕاگەیاندووین کەگوێڕایەڵو فەرمانبەری کتێبی خواو سوننەتی ئەو بین بۆ وێنە:

- عن جابر رضي الله عنه قال: كان رسول الله ﷺ إذا خطب احمرت عيناه وعلا صوته واشتد غضبه حتى كانه منذر جيش يقول: صبحكم ومساكم ويقول: ﴿ بعثت أنا والساعة كهاتين ﴾ ويقرن بين اصبعيه السبابة والوسطى ويقول: ﴿ أما بعد فإن خير الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد وشر الأمور محدثاتها وكل بدعة ضلالة ﴾. رواه مسلم.
- وقال ﷺ : ﴿ تركت فيكم أمرين لن تضلوا ماتمسكتم بهما: كتاب الله وسنة رسوله ﷺ ﴾ رواه مالك.

(ج) شایەتمان (أشهد ان لاإله إلا الله واشهد ان محمدا رسول الله) بۆیە کلیلی کردنەوەی دەرگای ئیسلامو موسڵمانەتییە چونکە شایەدی دانو دان پێدا هێنانی ئینسانە بەیەکتایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ ، جادیارە تایبەتی‌ترین

تایبەتمەندی خوا ئەوەیە کەبەتەنیا بەندایەتی بۆ بکرێو بپەرسترێو بەشێکی سەرەکیو گرنگی بەندایەتیکردنو پەرستنیش بریتییە لەپابەندی‌ی بەو بەرنامەو پەیڕەوە کەئەو پەرستراوە دایناوە، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ حوکمڕانیو بەرنامەدانان (الحکم والتشریع) یشی وەك پەرستن تایبەت کردووە بەخۆیەوە وەك دەفەرموێ: ﴿ إن الحکم إلا لله، أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ﴾ يوسف (٤٠) ، ﴿ أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله ﴾ الشورى (٢١)، ﴿ ألا له الخلق والأمر تبارك الله رب العالمين ﴾ الأعراف (٥٤).

وەتایبەتیترین تایبەتمەندی پێغەمبەرایەتی (أخص خصائص النبوة) ش بریتییە لەگوێڕایەڵیو فەرمانبەری بۆکران، خوای بێوێنە لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا من رسول إلا ليطاع بإذن الله ﴾ النساء (٦٤).

## تێبینیی دووەم:

هەرچەندە قورئانو سوننەت هەر پێکەوە باس دەکرێنو وەك دوو تای تەرازوویەك دێنە بەرچاو، بەڵام نابێ لەم ڕاستییانەش بێئاگابین:

(أ) قورئان (متن) ی ئیسلامەو سوننەت لێکدانەوە (شرح)یەتی، کەواتە کەسێك بیەوێ لەئیسلام شارەزا بێت پێویستە لەسەرەتاوە بەقورئان (متن) دەست پێبکاتو دوایی بێتە سەر سوننەت (شرح) نەك بەپێچەوانەوە.

(ب) قورئان زیاتر هێڵە سەرەکیو بنچینەییەکانو مەسەلە گشتییەکان باس دەکات، بەڵام سوننەت وردە بابەتو مەسەلە تەفصیلییەکان، کەواتە دەگونجێ لەڕێی سوننەتەوە بەوردی مەسەلەیەکی وەك (ویردی دوای نوێژە فەرزەکان) حاڵی بین، بەڵام بەپێی قورئانو لەڕێی ئەمەوە نەبێ بابەتێکی گشتیو سەرەکی وەك یەکتایی خوا (توحید الله) لەهەرسێك لایەنی: پەروەردگاریتی (الربوبیة) و پەرستراویتی (الألوهیة) و ناوو سیفەتەکان (الأسماء والصفات) دا لێی ناکۆڵرێتەوەو ڕوون ناکرێتەوە.

(ج) قورئان هەمووی لەیەك پلەی (سند) ی دایەو هەمووی (متواتر) ە، بەڵام سوننەت جۆری زۆرن، دیسان قورئان وەحیی ڕاستەوخۆی خوایە بەڵام سوننەت ناڕاستەوخۆیە.

(د) قورئان بەسەر سوننەتدا حاکمەو سوننەت لەخزمەتی دایە، بۆیە هیچ کاتێك سوننەتی

صەحیح لەگەڵ قورئاندا تێك ناگیرێن، کەوابێ هەرکاتێك دژایەتی لەنێوان دەقێکی سوننەت‌و ئایەتەکانی قورئاندا بینرا، ئەگەر بە (تأویل) کردنی یەکێکیان دژایەتی‌یەکە لاچوو ئەوا باشە ئەگەرنا ناچارین دەست بەرداری ئەو دەقە بین‌و بڵێین: (ئەم دەق ـ نص ـ ە بەحەڵە ڕەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کەوتووەو هی ئەو نی‌یە).

بەڵێ... قورئان ئەم پلە ئیمتیازانەی بەسەر سوننەتدا هەن بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانی قورئان بەسێنایی مەبەستیان لێ دەفامرێتەوە: ﴿ ولقد يسرنا القرآن للذكر فهل من مدكر ﴾ القمر (٤٠)، بەڵێ لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەبێ تێگەیشتن لەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ و لەدەرگای ئەو بەرێزەوە نەبێ ناتوانین بەتەواوی بچینە نێو جیهانی قورئانەوە، بەتایبەتی لەحاڵەتی کردەیی‌و لەکاتی گۆڕین‌و چاککردنی واقیعدا، چونکە (قسەو ڕەفتارو ڕەوشت‌و کارو بڕیارەکان‌و ژیان‌و گوزەرانی پێغەمبەر)[1] تەرجەمەو لێکدانەوەی کردەیی‌و زیندووی قورئانە هەربۆیەش خودای پەروەردگار پێی فەرموە: ﴿ وأنزلنا إليك الذكر لتبين للناس ما نزل إليهم ولعلهم يتفكرون ﴾ النحل (٤٤) .

## تێبینی سێیەم:

ئەو بەرهەم‌و کەلەپوورەش کەزاناو پێشەوایانی ئیسلام لەبەر تیشکی قورئان‌و سوننەتدا بەرهەمیان هێناوە دەبێ ئاوا ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ:

**یەك:**

هەر مەسەلەیەك زاناو پێشەوایانی ئیسلام ـ بەتایبەتی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ‌و ئەو دوو وەچە (جیل) یەی دوای وان (أهل القرون الثلاثة) کە (السلف الصالح) یان پێ‌دەگوترێ ـ لەسەری ڕێك کەوتبن‌و بەزاراوەی شەرع (إجماع) یان لەسەر کردبێ ئەوە ئەو مەسەلەیەش لەڕووی بەڵگەیی‌و حوکمەوە لەدوای قورئان‌و سوننەتەوە دێ‌و کەس مەودای (دان‌و چاو پێدا گێڕانەوەی نیە، واتە هەرچەندە ئەو جۆرە مەسەلانە لەڕووی چۆنیەتی پەیدابوونیانەوە بەبەشێك لەکەلەپوورو بەرهەمی زانایان دادەنرێ، بەڵام لەلایەنی بەڵگەیی (حجة)و حوکمەوە لەکەلەپوور هەڵدەوێرێن‌و لەسەر ڕای

---

(١) ئەمەی نێوان دوو کەوانەکە پێناسەی (سوننەتە) بەپێی زاراوی شەرعی کەلەرموودەناسان (محدثون) لەسەری ڕێك کەوتوون، بڕوانە: السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي، دكتور مصطفى السباعي، ل٤٨، هەروەها سەرنجی (أهل السنة والجماعة معالم الإنطلاقة الكبرى) ی محمد عبدالهادي المصري بەد، ل١٠٣.

زۆربەی زانایان وەك بەشێك لەئایین سەیر دەكرێن بەڵام بەمەرجێك لەگەڵ دەقەكانی قورئانو سوننەتدا دژ نەوەستنو تێك نەگیرێن ئەگەرنا هەروەك چۆن قورئانو سوننەت لەرووی بەڵگەبییەوە یەكسانن بەڵام لەچەند روویێكی دیكەوە لێك جیانو قورئان حاكمو چاودێرە بەسەر سوننەتداو قورئانو سوننەتیش حاكمو چاودێرن بەسەر تێكڕای كەلەپوورو بەرهەمی زانایاندا تەنانەت ئەو جۆرەشی كەلەڕێی یەكدەنگی (إجماع) یەوە پەیدا بووە.

**دوو :**

بەڵام ئەو بیرو بۆچوونو هەڵوێستە جیاجیانەی كەزانایان لەرێگەی كۆشش (إجتهاد)ێكی راستو دروستەوە بەرهەمیان دێنن و لەقورئانو سوننەت هەڵیان دێنجن، ئەوە بەكەلەپوورێكی گرنگو بەقیمەت حیسێب دەكرێنو، هەرچەندە موسڵمان بەحەتمی لەسەریان پێویست نیە كەپێیانەوە پابەند بن . چونكە بەشێك نین لەئایین . بەڵام شتێكی پەسندو چاكەو بگرە گەلێ جار پێویستیشە كە وەك شەرحو لێكدانەوەی قورئانو سوننەت رەفتاری لەگەڵ بكەنو لێی بەهرەمەند بنو بیكەنە چرایەك بۆ تێگەیشتنی چاكترو راستترو ئاسانتر لەقورئانو سوننەت، وەبۆشیان هەیە گوڵبژێری تێدا بكەنو ئەو بیرو رایانە هەڵبژێرن كەلەگەڵ واقیعی خۆیانو رەوتی ژیانیاندا دەگونجێ، هەروەها بۆیان هەیەو بگرە لەسەریشیان پێویستە كەبیرو هۆشی خۆشیان بخەنە كارو ئەوانیش وەك پێشینە رەسەنەكانیان لەبەر تیشكی قورئانو سوننەتدا بیرو بۆچوونی نوێو تازە بۆ چارەسەركردنی واقیعی كۆمەڵگاكەیان بەرهەم بێننو، ئەوانیش لێكدانەوەو بۆچوونەكانی خۆیان بخەنە پاڵ كەلەپووری رەسەنی پێشینانیانەوەو زیاترو چاكتر بەهێزو پێزی بكەن.

**سێ :**

بەڵام هەروەك چۆن قورئان بەسەر سوننەتدا حاكمو چاودێرە لەگەڵ ئەوەشدا كەلەڕێی سوننەتەوە نەبێ ناگونجێ وەك پێویست لەقورئان تێبگەین، وەگەلێك جار سوننەت حوكمو یاسای نوێژ دەخاتە روو كە لەقورئاندا باس نەكراون، بەرهەمو كەلەپووری زانایانیش لەژێر حوكمو چاودێری قورئانو سوننەت دایەو بەو مەرجە قبووڵ دەكرێو دەبێتە جێی پشت پێبەستنو سوود لێوەرگرتن كەلەگەڵ دەقێكی قورئانو سوننەتدا دژ نەوەستێ. ئنجا وەك ئیمامی مالیك فەرموویەتی: (كل یؤخذ منه ویرد علیه إلا صاحب هذا القبر) واتە جگە لەپێغەمبەر ﷺ هەموو كەس قسەی لێ وەردەگیرێو بۆشی رەت دەكرێتەوە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ كە تێكڕای بەرهەمو كەلەپووری زانایان هەر ئەم حوكمەی هەیە كەرابرد، جا چ لەبواری روونكردنەوەی ئەو دەقانەی قورئانو سوننەتدا بێ كەلەبارەی بیروباوەڕو تێڕوانین (العقیدة والتصور)ەوە دەدوێن. وەپێی دەگوترێ (علم

العقائد) یان (علم الکلام)، وە چ لەبواری لێکدانەوەو تەفسیری ئەو دەقانەدا بێت کەدەربارەی یاسا کردەیی‌یەکان (الأحکام العملیة) ەوە هاتوون کەبریتی‌یە لە (علم اصول الفقه) یان لەبواری شیکردنەوەی ئەو دەقانەی قورئانو سوننەت دا بێ کەلەلایەنی ئەخلاقیو مەعنەوی دەدوێنو پێی دەگوترێ (التربیة والسلوك) یان (التزکیة) یان (التصوف).

بەلاّم وەك پێشتریش گوتمان پێویستە لەکاتی سوود وەرگرتن لەبەرهەمو کەلەپووری زانایاندا وردو وریا بینو بزانین کە ئەو بەرهەمو کەلەپوورە هەرچەندە دەورێکی گرنگو کاریگەر دەبینێ لەتێگەیشتنی ئاییندار ئاسانکەرو ڕێنیشاندەرو یاریدەدەرێکی بایەخ دارو پێویستە، بەلاّم بریتی‌یە لەتێگەیشتن (فهم) ی ئەو بەڕێزانە لەئایین نەك خودی ئایین، دیارە ئینسانیش هەرچەندە زاناو داناو وردو وریا بێ مەگەر پێغەمبەر بێ دەنا دیسان هەر پارێزراو (معصوم) نیەو ناگونجێ خۆمان تەسلیمی هەموو بیروراو بۆچوونو تێگەیشتنەکانی بکەین.

بەتایبەتیش لەبواری (تصوف و عیرفان) و (علم الکلام) دا پێویستمان بەوردیو وریایی‌یەکی زیاتر دەکات، چونکە بەرهەمو کەلەپووری (تصوف) هەرچەندە گەوهەرو مرواریی چاكو بەلیمەتی وای تێدان کەبەدەگمەن نەبێ لەشوێنێکی تر چنگ ناکەون، بەلاّم گەلێك جاریش خڵتەو خاڵو شتی سەیرو سەمەرەشی تێکەڵ بووە، کەلەگەڵ ڕووحی ئیسلامو چەندان ئایەتو فەرموودەدا تێك دەگیرێن، کەبەشێکیان ئینسان بەرەو بێ‌بڕوایی (کفر) و هاوبەش پەیداکردن دەبەن، بەشەکەی دیکەش ئینسان دوورچاری گۆشەگیریو ژیانی ڕەبەنیو مەیدانی کۆمەڵگا بەجێ‌هێشتنو درووستکردنی واقیعێکی ئەفسانایو پووچو بۆشی دەکەن.

هەروەها (علم الکلام) یش گەلێك جار زۆر لە ڕووحی هەمەلایەنەو واقیع‌بینانەی قورئانو سوننەت دوور کەوتۆتەوەو، گیرۆدەی داوی فەلسەفەی زۆرو بۆری یۆنانی بووە.

## تێبینی‌ی چوارەم:

کەدەڵێین بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی ئینسان چ‌تاك چ‌کۆمەڵ بەس دەبێ لەخواوە بێ، مانای وانیە کەئینسان بۆی نیە لەبیرکردنەوەو تێڕەڕامانو ئەزموونی خۆیو خەڵکی زانیاری وەربگرێ، چونکە ﴿ الحکمة ضالة المؤمن ﴾ وەقورئان پڕپڕە لەفەرمان پێ‌کردنو هاندانی ئینسان بۆ سەرنج‌داناو بیرکردنەوە لەبوونەوەرو دیاردە سروشتی‌یەکانیو دۆزینەوەی یاساو نهێنی‌یەکانیان، وەك:

- ﴿ قل انظروا ماذا في السموات والأرض ﴾ یونس (١٠١).
- ﴿ فلینظر الإنسان إلى طعامه ﴾ عبس (٢٤).
- ﴿ أولم ینظروا في ملکوت السموات والأرض وماخلق الله من شيء ﴾ الأعراف

(١٨٥).

■ ﴿ فلينظر الإنسان مم خلق ﴾ الطارق (٥).

■ پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ أنتم أعلم بأمور دنياكم ﴾ رواه البخاري.

بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەئەو برە زانیارییەی کە دراوە بەمرۆڤ ﴿ وما أوتيتم من العلم إلا قليلا ﴾ الإسراء (٨٥). بەس ئەوە ناکات کە پەی پێ بەهێڵە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی پەیڕەو بەرنامەی ژیانی بەرێو لێی حاڵی بێ کە چییەو لەکوێوە هاتووەو بۆچی درووست کراوە. چ کاریگەری لەسەر زەوی پێسپێردراوەو دەبێ پەیوەندیی لەگەڵ خواو خەڵکو بوونەوەرو دەوروبەردا چۆن بێ و بەچ شێوەیەك ڕەفتارو هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکاتو ژیانی تایبەتیو گشتیو ماددیو مەعنەوی خۆیو کۆمەڵگاکەی چۆن ڕێك بخاتو سەرەنجام چی لێدێو بۆ کوێ دەچێو... هتد.

بەڵێ دەبێ بەرنامەو پەیڕەوی ژیانو بەڕێوەچوونی ئینسان لەسەرچاوەیەکەوە بێ کەهەمووو نهێنییەکانی ئینسانو ژیانو بوونەوەر بزانێ، دیارە ئەویش بەس زانیاری بێسنووری خوایە بۆیەش خوای پەروەردگارمان فەرموویەتی: ﴿ قل أنزله الذي يعلم السر في السموات والأرض إنه كان غفورا رحيما ﴾ الفرقان (٦).

کەواتە: لەڕوانگەی ئیسلامەوە عەقڵی ئینسانو ئەو زانیارییو شارەزاییەی کەبەرهەمی دێنێ بەسەرچاوەی وەرگرتنی عیبادەتو بەرنامەی ژیانی دانانرێو ئەو مافەی پێ ڕەوا نابینرێ، چونکە ئەو توانایەی تێدا نیە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پشتگوێ خرابێو گرنگیو ئەمینی شایستەی پێنەدرابێ، چونکە ئینسان هەر بەهۆی عەقڵو شارەزاییەوە دەتوانێ خوا بناسێو بڕوای پێبێنێو ئاینو بەرنامەکەشی لێوەربگرێو تێی بگاتو پەیڕەوی لێبکات.

## کورتەی قسان:

ئیسلام بەعەقڵو بیروهۆشی ئینسان ڕانابەرموێ بۆی ببێتە (سەرچاوەی وەرگرتن)، بەڵام بەتاڵە وەسیلەو ئامرازی وەرگرتنو تێگەیشتنو پەیڕەوی لێکردنی (سەرچاوەی وەرگرتن - ئاین - ) ی دەزانێو هانیشی دەدات کەهەتا دەتوانێ ئەسپی خۆی تاوبدات لەزیاترو چاکتر زانینو ناسینی هەردووك کتێبی خوێنراوە (مقروء) و بینراو (منظور) ی خودا کەئاینو بوونەوەرن.

■ ■ ■

# ڕێ‌خۆشكردن

وەك لەبەشی یەكەمدا گرتمانەو ڕوونیشمان كردەوە سەرچاوەی وەرگرتن (مصدر التلقي) مان لەدەربارێكدەوە وحی‌و پەیامی بێ‌هەڵەو پەڵەو تێرو تەواوی خوایە، كەئەویش لەقورئانی بەپێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزدا ﷺ تەجەللای كردووەو كورت هەڵاتووە، كەواتە بابچینە خزمەت ئەو دوو سەرچاوە ڕوونو بێ‌چەندو چوونەو بزانین تێڕوانینی ڕاست‌و درووست دەربارەی بوون (الوجود) واتە (خواو ئینسان‌و ژیان‌و بوونەوەر) چی‌یەو چۆنە؟!

## بەندی یەكەم: خوا (سبحانه وتعالى)

### ( الله لاإله إلا هو الحي القيوم )

زاتی تاك‌و بێ‌وێنەو هاوەڵ‌و وەچەو هاوسەرو هاوتا، خوای بەبەزەیی‌ی بەخشندەی بەدیهێنەرو پەروەردگار (عز وجل) كەهەر ئەو خاوەنی بوونی زاتی‌و ڕاستەقینەیەو بێ‌نیازە لەغەیری خۆی‌و هەموو شتێكیش وەدیهێنراوو چاو لەدەستی ئەویە، لەقورئان‌و سوننەتدا لەزۆر جێیان باسی كراوەو لەڕێی خستنەڕووی ناوە چاكەكانی‌و سیفەتە بێ‌وێنەكانی‌و كردەوە بەجێیەكانی‌و یاسا تێرو تەواوەكانی‌و درووستكراوە ڕێك‌و پێكەكانی‌یەوە بەخەڵكی ناسێنراوە، جا لەسۆنگەی ئەوەوە كەئێمە لەبەشی سێیەمدا - كەتەرخان كراوە بۆ توێژینەوەو ڕوونكردنەوەی بیروباوەڕ (العقيدة) - باسی خواناسی‌و چۆنیەتی بڕوا بەخوا هێنان دەكەین، لێرەدا بەس بەخستنەڕووی چەند خاڵێكی گرنگ بەكورتی وازدێنین:

**یەكەم:**

خوا بەدیهێنەرو ڕێكخەرو بەڕێوەبەری هەموو شتێكە، چونكە بەس ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارەو غەیری ئەو هەرچی‌یە هەر لەلایەن ئەوەوە درووستكراوەو كاڵای بوون (وجود) ی پێ‌بەخشراوە بۆ وێنە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ قل من رب السموات والأرض قل الله قل أفاتخذتم من دونه أولياء لايملكون لأنفسهم نفعا ولاضرا قل هل يستوي الأعمى والبصير أم هل تستوي الظلمات والنور أم جعلوا

لله شركاء خلقوا كخلقه فتشابه الخلق عليهم قل الله خالق كل شئ وهو الواحد القهار ﴾ الرعد (١٦).
وەفەرموویەتی: ﴿ خلق السموات بغير عمد ترونها وألقى في الأرض رواسي أن تميد بكم وبث فيها من كل دابة وأنزلنا من السماء ماء فأنبتنا فيها من كل زوج كريم هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين من دونه بل الظالمون في ضلال مبين ﴾ لقمان (١٠-١١).
وەفەرموویەتی: ﴿ إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض في ستة أيام ثم استوى على العرش يغشي الليل النهار يطلبه حثيثا والشمس والقمر والنجوم مسخرات بأمره ألا له الخلق والأمر تبارك الله رب العالمين ﴾ الأعراف (٥٤).
وەفەرموویەتی: ﴿ سبح اسم ربك الأعلى الذي خلق فسوى ﴾ الأعلى (١-٢).

**دووەم:**

خوا تاک و بێ‌نیازو بێ‌ڕۆڵەو باب و دایک و بێ‌هاوتایە: ﴿ قل هو الله أحد الله الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحدا ﴾ الإخلاص (١-٤).
وەخوا هاوسەری نیە: ﴿ وأنه تعالى جد ربنا ما اتخذ صاحبة ولا ولدا ﴾الجن(٣)، وەهیچ شتێک وەک خوا نیە: ﴿ ليس كمثله شئ وهوالسميع البصير ﴾ الشورى (١١).

**سێ‌یەم:**

خوا (جل جلاله) هەروەک چۆن لەزاتیدا بێ‌وێنەو هاوتایە لەناوو سیفەتەکانیشیدا هەروایە، وەهەروەک چۆن بیروهۆشی ئینسان توانای سەرەدەری‌کردنی نیە لەماهیەتی زاتی خواداو لەرێی دەقەکانی قورئان‌و سوننەتەوە نەبێ دەرووست، نیە هیچی دەربارە بگوترێ ئەگەرنا تەفەنگ بەتاریکی‌یەوەنانە، ناوو سیفەتەکانیشی بەهەمان شێوە، چونکە ناوو سیفەتی هەرشتێک وەک زاتەکەیەتی، وەئایەتی ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ یش هەم زات‌و هەم سیفەتەکانی خواش دەگرێتەوە.

**چوارەم:**

هەموو شتێک، بەواتایەکی دیکە هەموو دروستکراوەکان کەتێکرای بوون (وجود)ێک پێک‌دێنن بێجگە لەخوای بەدیهێنەریان، هەروەک چۆن بۆ پەیدابوون (إیجاد) یان پەکیان لەسەر خوا کەوتووە بەبێ ئەو نابن، بۆ بەرێوەچوون‌و بەردەوامبوونیشیان بەهەمان شێوە، هەربۆیەش خوای کاربەجێ لەسەر زمانی موسا (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ﴿ ربنا الذي أعطى كل شئ خلقه ثم هدى ﴾ طه (٥٠).

**پێنجەم:**

خوا بەمەبەستی تاقی‌کردنەوە ئینسانی لەدنیادا واهەڵخستووە دروست‌کردووە

کەنەتوانێ خوا ببینێو دەرکی ماهیەتی بکاتو ڕاستەوخۆ بیناسێ، بۆیە دەبێ لەرێی دروستکراوو شوێنەوارەکانیەوە کەئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی ناوو سیفەتەکانێ، وەبەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەرلێ ناسینی بدات، خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ لاتدركه الأبصار وهو يدرك الأبصار وهو اللطيف الخبير ﴾ الأنعام (١٠٣) ،هەروەها فەرموویەتی: ﴿ سنريهم آياتنا في الآفاق وفي انفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق أولم يكف بربك أنه على كل شئ شهيد ﴾ فصلت (٥٣).

**شەشەم:**

بەلاّم لەدوارِۆژدا خوا خۆی پیشانی بەندە چاکەکانی دەداتو بێبڕوا دۆزەخی‌یەکانیش لەدیداری خۆی بێبەش دەکات، چونکە لەلایەکەوە بەهەشت جێگای تاقی‌کردنەوە نیەو لەلایەکی دیکەشەوە گەورەترینو چاکترین نیعمەتی بەهەشتو بەرزترین هیواو ئاواتی بڕواداراینی بریتی‌یە لە شادبوون بەدیداری خوا، خوای (ذوالجلال والإكرام) لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وجوه يومئذ ناظرة إلى ربها ناظرة ﴾ القيامة (٢٢.٢٣).

وەدەربارەی بێبەش‌بوونی بێبڕوایان لەدیداری خودا فەرموویەتی: ﴿ كلا إنهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون. ثم إنهم لصالوا الجحيم ﴾ المطففين (١٥.١٦).

لەو دوو ئایەتەوە دەردەکەوێ کەئازارو ئەشکەنجەی بێبڕوایان بەهۆی بێبەش‌بوونیان لەدیتنی خوادا گەورەترو بەئێش‌ترە لەچوونە نێو ئاگری دۆزەخ، چونکە یەکەم جار دەفەرموێ لەدیتنی خوا بێبەشو پەردەپۆش دەکرێن، ئنجا دەفەرموێ: دواێ دەخرێنە نێو کڵپەی دۆزەخەوە!!

هەڵبەتە فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی دیتنی خوا لەدوارِۆژدا لەلایەن بڕوادارانەوە زۆرن تەنانەت (ابن تيمية) فەرموویەتی: (ئەو فەرموودانە گەیشتوونە پلەی . تواتر .)[1]، ئەمەش نموونەیەك لەو فەرموودانە: عن ابي هريرة ان اناسا قالوا لرسول الله ﷺ : يارسول الله! هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال رسول الله ﷺ : ﴿ هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟ قالوا: لا يارسول الله، قال: هل تضارون في رؤية الشمس ليس دونها سحاب؟ قالوا: لا يارسول الله. قال: إنكم ترونه كذلك ﴾ متفق عليه.

**حەوتەم:**

خوا (سبحانه وتعالى) خاوەنی هەموو سیفەتو ناوێکی چاكو بەرزو پەسندە، وەك فەرموویەتی: ﴿ ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها وذروا الذين يلحدون في أسمائه

---

(١) بڕوانە: أهل السنة والجماعة معالم الإنطلاقة الكبرى، ل٨٩.

سیجزون ماکانوا یعملون ﴾ الأعراف (١٨٠)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ولله المثل الأعلى في السموات والأرض وهو العزیز الحکیم ﴾ الروم (٢٧).

وەخوا لەهەموو جۆرە هەڵەو پەڵەو کەمو کوڕیو ناتەواوییەك بەرییە دەڵێ قورئانیش لەوبارەوە یەکجار زۆرن ، بڕوانە: ﴿ تسبح له السموات السبع والأرض ومن فیهن وان کل شیئ إلا یسبح بحمده ولکن لاتفقهون تسبیحهم إنه کان حلیما غفورا ﴾ الإسراء (٤٤).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وقل الحمد لله الذي لم یتخذ ولدا ولم یکن له شریك في الملك ولم یکن له ولي من الذل وکبره تکبیرا ﴾ الإسراء (١١١).

ژمارەی ئەو ناوە بەرزو چاکانەش نەوەدو نۆ (٩٩) یە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ان لله تسعة وتسعین إسما مائة إلا واحدا من أحصاها دخل الجنة انه وتر یحب الوتر ﴾ متفق علیه.

**هەشتەم:**

هەروەك چۆن دیتنو بەدیدار شادبوونی خوا چاکترینو گەورەترین نیعمەتی بەهەشتە بۆ برواداران، ناسینو بڕوا پێبوونو خۆشویستنو شەرمو سام لێکردنو رازو نیاز لەگەڵ کردنو پاڕانەوەو داوای لێبووردن کردنو پشت پێبەستنو یادکردنو کاربۆکردنو...بەکورتی پەرستن (عبادة) ی خواش لەژیانی دنیادا چاکترینو بەرزترینو شیرینترین نیعمەتە، هەربۆیەش خوای میهرەبانو بەخشندە ناسینو بڕوا پێبوونو پەرستنی خۆی لەسەر بەندەکانی پێویست کردووە چونکە دەزانێ کەبەبێ ئەوە هەم خۆیان دەدۆڕێننو لەقیس دەچێو هەم چاکترینو بەرزترین نیعمەتی دنیاو قیامەتیان لەدەست دەچێت خوایە، بەلوتفی خۆت لەو نیعمەتە هەرە بەرزو مەزنو بێوێنەیە لەدنیاو قیامەتدا بەهرەمەندمان بکە، ئامین.

بەبێ خواناسین ئینسانو ژیانو بوونەوەر بێ مەعناو پووچو بۆشن، بابزانین بۆچیو چۆن؟!

خوا هەروەك چۆن دروستکەرو پەروەردگاری هەموو شتێکەو وردو درشتو بینراوو نەبینراوو زانراوو نەزانراوی بوونەوەرو کائینات لەوەوە بوونەو خاوەنی بوونو سەریان لەدەریای نەبوون (عدم) دەرهێناوە، بەهەمان شێوەش بەبێ ناسینو بڕوا پێهێنانی وی هیچ شتێك، ئینسان، ژیان، بوونەوەر... هیچ مەعناو بایەخێکیان نابێو دەبنە شتی پووچ ربۆش!!

چونکە تەنها بەهۆی خواناسینو یەکتاپەرستییەوە ئینسان بەراستی خۆی دەناسێو دەزانێ چییەو کێیەو، لەکوێوە هاتووەو بۆچیو، بۆ کوێ دەچێو چۆنو بۆ؟!

وەهەر لەبەر تیشکی خۆری بڕوا بەخوابووندا ئینسان لێی حاڵی دەبێ کەژیانی دنیا چییەو بۆچی وەخسێنراوەو پێویستە چۆن بەسەر ببرێ؟!

دیسان بەس لەڕوانگەی بیری خواناسییەوە ئینسان تێدەگات کەحیکمەت و هۆی خولقاندنی ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕە چییەو، چۆن و بۆچی درووستکراوەو سەرەنجامی چی دەبێ؟!

ئەگەرنا بەبێ خواناسین و بڕوا پێهێنانی ئینسان مەعنا و حیکمەتی بوونی خۆی و ژیان و بوونەوەرو دەوروبەر نازانێ و، هەرجارە بۆ تەفسیرکردنی هۆو حیکمەتی ئەو شتانە پەنا دەباتە بەر بیردۆزێك کەدەبێ هەر لەبازنەیەکی داخراودا بخولێتەوەو لەئاکامدا خۆی و ژیان و بوونی لەبەرچاو دەبێزرێ و، لەچلێتاری ئاژەڵیزمی داروین و سێکسی فرۆید و گەدەپەرستی مارکس دا دەتلێتەوە، ئەوە هیچ کەلیمەت و ڕێزی خۆی لەدەست دەدا بگرە هەر ناوی خۆیشی ئەراسزش دەکات، هەربۆیەش خوای دادگەرو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ ولاتكونوا كالذين نسوا الله فانساهم أنفسهم أولئك هم الفاسقون ﴾ الحشر (١٩)، واتە: وەك ئەوانە مەبن کەخوایان لەبیرچۆتەوە ئەویش خۆیانی لەبیر بردوونەوە، ئەوانەن لەڕێ دەرچوواں.

دیارە هەر بۆیەش خواناسین (معرفة الله) بەبناغەو بنچینەی تێڕوانینی ئیسلامی دادەنرێ، کەتاقە تێڕوانینی ژیرانەو زانستانەی ڕاست و واقیعییە، چونکە وەك گوتمان: هەروەك چۆن بەبێ خوا (جل جلاله) پەیدابوونی ئینسان و ژیان و بوونەوەر مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر گریمان پەیدابوون (إیجاد) یشیان بەبێ خوا تەفسیر بکرێ خودی بوون (وجود)ەکەیان دەبێتە شتێکی پووچ و بێحیکمەت و بێمەعنا، هەربۆیەش هەموو ئەوانەی کەلەبەر هەر هۆیەك بووە بەهیان لەگەڵ خوادا تێك چووەو لەسەر خەت و ڕێبازی وی ترازاون بۆ تەفسیرکردنی بوون و ژیانی خۆیان پەنایان بردۆتە بەر ئەو بیردۆزە پووچانەی کەبەچاوی ئاژەڵ و دڕندەو دەعبار کرم و مەگەز تەماشای مرۆڤ دەکەن و، دەوروبەرو بوونەوەریش بەشاری بێخاوەن و بەرهەمی ڕێکەوت و سرووشت لەقەڵەم دەدەن و هەرجارە بەزمێك ساز دەکەن و بەندێك بەخۆیان دەدەن.

بەڵێ... بەڕاستی بەس لەسایەی خواناسی و ئایین دا ئینسان خۆی و دەوروبەرو بوونەوەر دەناسێ و جێگای خۆی لە (إعراب) ی بوونەوەردا دەدۆزێتەوەو دەزانێ بۆچی درووستکراوەو چ ئەرکێکی پێسپێرراوەو دەبێ چی بکات و چی نەکات؟ هەربۆیەش خوای زانار دادگەر بەزۆری وەسفی حاڵی پەریشان و شپرزەی بێبڕوار خوانەناسان بە وشەی (ضالين) یان (ضلوا) یان (في ضلال مبين) وە (في ضلال بعيد)... دەکات، چونکە ئەو کەسە کەخوای پەروەردگاری ناناسێ نەك ڕێگا بەڵکو هەر خۆیشی لێ ون دەبێ، ئاخر وشەی (ضل) لەئەسڵدا بەمەعنای ونبوونە، (ضالة البعيد) واتە: حوشتری بزربوو، (الحكمة ضالة المؤمن) واتە: زانیاری چاك و ڕاست (حیکمەت) شتێکە لەئینسانی بڕوادار بزربووەو بەدوایدا دەگەڕێ بیدۆزێتەوە.

ئنجا وەك گوتمان بەهۆی خوا نەناسینەوە نەك هەر مرۆڤ بەڵکو تێکڕای بوونەوەر دەبێتە شتێکی پووچ و بەتاڵ و بۆش، ئەمەش دەقی قورئانیی لەسەرە کەدەفەرموێ:

﴿ وماخلقنا السماء والأرض وما بينهما باطلا ذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار ﴾ ص (٢٧)، واتە: وەئاسمانو زەوی‌و ئەوەی نێوانیانمان بەخۆڕایی‌و بەلاش درووست نەکردوون. ئەمە واتە ئەم جۆرە بۆچوونو هەڵوێستە لەئاقار بوونەوەردا گومانی ئەوانەیە کەبێ‌بڕوان جا سزای سەخت لەئاگری دۆزەخ بۆ بێ‌بڕوایان ساز کراوە.

هەربۆیەش خوای میهرەبان ئاوا چۆنیەتی پاڕانەوەو ڕازو نیازی بەندە ژیرو تێگەیشتروەکانی‌و بەرهەمو ئەنجامی یادی خواو بیرکردنەوەیان لەدرووستکراوەکانی خوا دەخاتەڕوو: ﴿ إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الألباب الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والأرض ربنا ماخلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار ﴾ آل‌عمران (١٩٠-١٩١).

دەبینین کەبەرهەمو ئەنجامی یادی بەگەرمو کوڵی خواو سەرنج‌دانو بیرکردنەوە لەدرووستکراوەکانی بریتی‌یە لەدان‌پێداهێنانو شایەدی‌دان بەم ڕاستی‌یە گرنگو مەزنەدا: ﴿ ربنا ماخلقت هذا باطلا ﴾ پەروەردگارمان ئەم - بوونەوەر - ەت بەخۆڕایی‌و بێ حیکمەتو مەعنا نەخوڵقاندووە پاکی بۆتۆ - لەکاری بێ‌حیکمەتو پووچ ..

کەواتە: دەتوانین بڵێین: خواناسی‌و بڕواداری هەروەك چۆن بریتی‌یە لەڕێزگرتنو بەگەورەگرتنی خوا (سبحانه وتعالى) بەهەمان شێوەش ڕێزو حورمەت دانانیشە بۆ ئینسانو ژیانو بوونەوەریش، بەڵام بەپێچەوانەوە بیری پووچی بێ‌بڕوایی هەروەك چۆن بێ‌ڕێزی‌و سپڵەیی‌یە بەرامبەر بەخواو سیفەتە بەرزەکانی، بێ‌ئەدەبی‌و گێلێتی‌و بێ‌حورمەتی کردنیشە بەبوونەوەرو ژیانو ئینسان، وەزەرب هێنانیشە بەسەر هەموو کردەوەو خەسڵەتە چاكو پەسندەکانیشدا، هەربۆیەش خوای کاربەجی دوای ئایەتی: ﴿ وماخلقنا السماء والأرض ومابينهما باطلا ﴾ یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ أم نجعل الذين آمنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الأرض أم نجعل المتقين كالفجار ﴾ ص (٢٨).

چونکە ئەگەر خوا نەبێ‌و لێ‌پرسینەوەو سزاو پاداشت نەبێ بڕوادارانی کردارپەسند لەگەڵ تێکدەرانی ناپەسند، پارێزکارانو تاوانباران هەردووکیان دەچنە نێو تەرازوویەکەوەو یەکسان دەبن!!

# بەندی دووەم : ئینسان

## ( وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة )

ئینسان سەرتۆپی کائیناتەو شاگوڵی باخی بوونەوەرە، جائەوە لێرەدا هەروا بەکورتی لەڕوانگەی تێڕوانینی ئیسلامییەوە لە چەند خاڵێکدا کەسایەتی ئەو دروستکراوە ڕێزلێگیراوو سەرسوڕهێنەرە دەخەینەڕوو:

**یەکەم:**

ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەوی وەك پەروەردگارمان فەرموویەتی: ﴿ وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة ﴾ البقرة (٣٠)، واتە خوای کاربەجێو بێنیاز مرۆڤی لەسەر زەوی کردۆتە جێگیری خۆیو ئاوەدانکردنەوەو هەڵسووڕاندنی کاروباری دنیای پێسپاردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿ هو أنشأكم من الأرض واستعمركم فيها ﴾ هود (٦١).

**دووەم:**

ئینسان لەچاکترینو تەواوترین شێوەو پێکهاتنی ماددیو مەعنەویدا خوڵقێنراوە: ﴿ لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم ﴾ التين (٤)، وەلەلایەن خودایشەوە ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتی لێگیراوەو بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا هەڵبژێرراوە: ﴿ ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا ﴾ الإسراء (٧٠).

**سێیەم:**

ئینسان لەدوو بەشی سەرەکیو لەیەك جیا پێکهاتووە، یەکەم خاکی سەر زەوی، دووەمیش گیانێکی خوایی: ﴿ إذ قال ربك للملائكة إني خالق بشرا من طين. فإذا سويته ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين ﴾ ص (٧١-٧٢). ڕەنگە حیکمەتی ئەو دوو توخم (عنصر)ە لەیەك جودا بگرە دژ بەیەکەش ئەوەبێ کە ئینسان بتوانێ لەتاقیکردنەوی ژیانی دنیایدا چ بەرەو بەرزی بەهۆی چاکیو پاکییەوە، چ بەرەو نزمی بەهۆی پیسیو بەدکارییەوە هێندە بڕوا هەتا لەچاو ون دەبێو، لەفریشتان بەرێزترو لەئاژەڵو دڕندەو شەیتانان خراپترو کەمتربێ!

**چوارەم:**

ئادەم سەلامی خوای لێبێ کەیەکەمین ئینسانو بابی هەمووانە بەفەرمانی خوا هەموو فریشتەکان کڕنووشی ڕێزگرتنیان بۆ بردووە، ﴿ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم

فسجدوا إلا إبليس أبى واستكبر وكان من الكافرين ﴾ البقرة (٣٤).

**پێنجەم :**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئیبلیس لەعنەتی خوای لێبێ لەگەڵ فریشتەکاندا کڕنووشی بۆ ئادەم نەبردو ڕێزی لێنەگرت، خوا لێی تووڕە بوو وتەفرینی لێکردو لەبەزەیی و لوتفی خۆی بێبەشی کرد: ﴿ قال فاهبط منها فما يكون لك ان تتكبر فيها فاخرج إنك من الصاغرين ﴾ الأعراف (١٣).

دیارە لەم بەسەرهاتەشدا ئەوپەڕی ڕێزگرتن و خۆشەویستی‌ی خوا بۆ ئینسان دەردەکەوێ.

**شەشەم :**

خوا (عز وجل) لەنێو هەموو بوونەوەردا ئەرکێکی گرنگ و نازارەی وای بەئینسان سپاردووە کەهیچ شتێکی دیکەی تر بوونەوەر توانای هەڵگرتنی ئەو بارەو جێبەجێکردنی ئەو کارەی نیە: ﴿ إنا عرضنا الأمانة على السموات والأرض والجبال فابين أن يحملنها واشفقن منها وحملها الإنسان إنه كان ظلوما جهولا ﴾ الأحزاب (٧٢).

**حەوتەم :**

لەوەوە دەردەکەوێ کەئینسان پلەو پایەیەکی یەکجار بەرزو گرنگی هەیە کەهیچ دروستکراوێکی دیکە نایگاتێ، کەهەرچی لەبوونەوەردا هەیە بۆی ڕام و مەبەستی کراوەو ڕێشمەکەی وەدەست وی دراوە: ﴿ وسخر لكم مافي السموات وما في الأرض جميعا منه إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ﴾ الجاثية (١٣).

**هەشتەم :**

ئینسان، هەروەها (جن) یش، بۆ حیکمەت و مەبەستێکی یەکجار بەرزو گرنگ خولقێنراوە کەبریتی‌یە لەبەندایەتی‌کردن بۆ خوا (العبودية لله) چونکە بەختەوەری دنیاو دوارۆژو کامڵبوونی ئینسان بەس لەو ڕێیەوە دێتە دی، ئەگەرنا خوا دەوڵەمەندو بێنیازە لەغەیری خۆی چونکە هیچ خەسڵەتێکی چاکو پەسند نیە نەبێ هەتا چاوەڕوانی بکات، وەبۆخۆی خاوەنی هەموو شتێکەو هیچ شتێك نیە نەیبێ، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ماأريد منهم من رزق وماأريد أن يطعمون ان الله هو الرزاق ذو القوة المتين ﴾ الذاريات (٥٦-٥٨).

**نۆیەم :**

ئینسان هەر هەتا ئەوکاتە ئەو شانوشکۆو پلەو پایە بەرزەی دەبێ و ڕێزو حورمەتی

دەپارێزرێ هەتا حیکمەتی خولقێنرانی خۆی کەبەندایەتی کردنە لەخۆیدا دێنێتە دی و بەڕاستی دەبێتە بەندە (عبد) ی خوا و، ئەو ئەرکەی پێی سپێرراوە جێبەجێی دەکات کەئەرکی (خەلیفایەتی) یە، ئەو سپاردەیەی کەخوا تەسلیمی کردووە چاک هەڵی دەگرێ و دەیپارێزێ، ئەگەرنا بەهۆی لادان و سەرپێچی یەوە دەچێتە ریزی ئاژەڵ و بگرە خراپتریش وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والإنس لهم قلوب لايفقهون بها ولهم أعين لايبصرون بها ولهم آذان لايسمعون بها أولئك كالأنعام بل هم أضل أولئك هم الغافلون ﴾ الأعراف (١٧٩).

مەڵکو ئینسان بەهۆی پچڕاندنی پەیوەندی بەندایەتی لەگەڵ خواداو هەڵگەڕانەوەی لەیاسای گشتی (النظام العام) ی بوونەوەرو سرووشت (فطرة) ی خۆی، لەهەموو جانەوەرو درندان خراپتر دەبێ: ﴿ إن شر الدواب عند الله الذين كفروا فهم لايؤمنون ﴾ الأنفال (٥٥).

بگرە ئینسانی لارێ و بێبڕوا هەر لەهەموو شتێك خراپتری لێ دێ و کەپێشتر بەهۆی هەڵگرتنی سپاردەی خواو جێبەجێ کردنی ئەرکی خەلیفایەتی و هێنانەدی خەسڵەتی بەرزی بەندایەتی یەوە لەهەموو کائینات دا هەڵبژاردەو تاق و نازارە بوو، ئێستا بەهۆی سپڵەیی و بێوەفایی یەوە دەچێتە پلەی هەرە نزم و پەستەوە: ﴿ لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم ثم رددناه أسفل سافلين. إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات ﴾ التين (٤-٦).

# بەندی سێیەم : ژیان ( الحیاة )

## ( الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم )

تێڕوانینی ئیسلام دەربارەی ژیان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا زۆر بەگوشراوی دەخەینە روو:

**یەکەم:**

ئەسڵ و بنچینەی ژیان ئاوەو هەموو زیندەوەرو گیاندارانی سەرزەوی بەشێوەیەکی سەرەکی لەئاو درووست بوون، خوای زیندووی هەرگیز نەمر فەرموویەتی: ﴿ وجعلنا من الماء كل شئ حي أفلا يؤمنون ﴾ الأنبياء (٣٠). وەفەرموویەتی: ﴿ والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ومنهم من يمشي على أربع ﴾ النور (٤٥).

ژیانی ئینسانیش لەسەر زەوی مەیدانی تاقی کردنەوەیەتی بەهۆی ئەنجامدانی ئەو

بەندایەتی‌یەوە کەلەلایەن خواوە لەسەری پێویست کراوەو، هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە قورسەی کەپێی سپێرراوەو جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو جێگرایەتی‌یەی کەپێی خەلات کراوە، خوای دادگەر لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا وهو العزيز الغفور ﴾ الملك (٢).

**دووەم :**

ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کەجێی تێدا تاقی‌کردنەوەی ئینسانە یەکجار گرنگ‌و بایەخدارەو پێویستە ڕێزی لێ‌بگیرێ‌و ئەو پەڕی گرنگی‌و ئەمیەتی پێ‌بدرێ، هەربۆیەش خوای زاناو تراناو لەسەر زمانی بەندە خواناس‌و چاکەکانی فەرموویەتی: ﴿ ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ﴾ البقرة (٢٠١)، بەلآم لەم ڕووەوە کەڕابواردنێکی کەم‌و کورتەو جێی دڵ پێ‌بەستن نیە، پێویستە وەك گاڵتەو یاری‌ی منداڵان سەیری بکرێ وەك خوای بێ‌وێنە فەرموویەتی: ﴿ إعلموا انما الحياة الدنيا لعب ولهو وزينة وتفاخر بينكم وتكاثر في الأموال والأولاد كمثل غيث أعجب الكفار نباته ثم يهيج فتراه مصفرا ثم يكون حطاما وفي الآخرة عذاب شديد ومغفرة من الله ورضوان وماالحياة الدنيا إلا متاع الغرور ﴾ الحديد (٢٠).

کەواتە، گرنگی‌و قیمەتی ژیانی دنیا بەس لەو ڕووەوەیە کەئینسان خوای تێدا بپەرستی‌و بەندایەتی تێدا بکات، جاهەرکاتێك ئەو جەوهەرو حەقیقەتە لەژیانی ئینساندا نەما، ئینسان‌و ژیانەکەشی دەبێتە گرێزی قرێزك‌و فلسێکی قەلپ ناهێنێ، کەواتە مەبەست لەفەرمودەی خوا :﴿ إنما الحياة الدنيا لعب ولهو- ﴾ ژیان‌و گوزەرانی کەسانێکە کەتەنها دیوی ڕواڵەتی‌و ماددی‌ی ژیانی دنیا دەبینن‌و لەدیوەکەی دیکەی یان ڕاستتر بڵێین لەکاکڵ‌و حەقیقەتەکەی بێ‌ئاگان: ﴿ يعلمون ظاهرا من الحياة الدنيا وهم عن الآخرة هم غافلون ﴾ الروم (٧)، هەربۆیەش لەبەندی یەکەمی ئەم بەشەدا گوتم: (هەروەك چۆن بەبێ خوا «جل جلاله» پەیدابوونی ئینسان‌و ژیان‌و بوونەوەر مەحاڵ‌و چاوەڕوان نەکراوە، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر گریمان پەیدابوون «إیجاد» یشیان بەبێ خوا تەفسیر بکرێ خودی بوون «وجود»ەکەیان دەبێتە شتێکی پووچ‌و بێ‌حیکمەت‌و بێ‌مەعنا).

بەڵێ... ئینسان بەبێ خواناسین‌و خواپەرستی دەبێتە ئاژەڵ‌و دڕندەو بگرە خراپترین‌و نزمترین شت، ژیانەکەشی دەبێتە گاڵتەو یاری‌ی منداڵانەو گرێزی قرێزك، هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ الا ان الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ماذكر الله وما والاه وعالما ومتعلما ﴾ رواه الترمذي وقال حسن.

**سێیەم :**

ژیانی دنیا بریتی نیە لەتاقە دەرفەتی ژیانی ئینسان، بەڵکو یەکێکە لەقۆناغەکانی‌و پێشەکی (مقدمة) یەکەو دوایی لەقۆناغەکانی دیکەدا ئەنجام (نتیجة) ەکەی دێ :﴿ وهو

الذي يتوفاكم بالليل ويعلم ماجرحتم بالنهار ثم يبعثكم فيه ليقضى أجل مسمى ثم إليه مرجعكم ثم ينبئكم بما كنتم تعملون ﴾ الأنعام (٦٠).

وەلەڕاستیدا ئەگەر ژیانی ئینسان بەس ئەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیا بێ، دەبێتە شانۆگەرییەکی بێ تام و چیرۆکێکی بێ ئەنجام دیارە ئەمەش لەخوای کاربەجێ ناوەشێتەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ أفحسبتم انما خلقناكم عبثا وانكم إلينا لاترجعون. فتعالى الله الملك الحق لاإله هو رب العرش الكريم ﴾ المؤمنون (١١٤-١١٥).

**چوارەم:**

ئینسان کەچاکترین درووستکراو و ئەمانەت پێسپێرراو و ئەرکی خەلیفایەتی پێ خەڵاتکراوی خوایە، بۆ ئەم ژیانە کەم و کورت و زووتێپەڕەی دنیا درووست نەکراوە، بەڵکو وەك گوترا ئەمە بەس مەیدان و دەرفەتی تاقیکردنەوەیەتی و ئینسان بۆ ژیانێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە خوڵقێنراوە کەلەدوارۆژدا دەیبینێ وەك ئەنجام و بەرهەمی ئەم ژیانە دنیاییەی، ئەو ژیانە نەبڕاوەیەش یان بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت و بەرینە، یانیش دۆزەخی بڵێسەداری بەتین: ﴿ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات أولئك هم خير البرية جزاؤهم عند ربهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها أبدا رضي الله عنهم ورضوا عنه ذلك لمن خشي ربه ﴾ البينة (٧-٨)، وەفەرموویەتی: ﴿ ومن يعصي الله ورسوله فإن له نار جهنم خالدين فيها أبدا ﴾ الجن (٢٣).

**پێنجەم:**

هەروەك چۆن شادی و بەختەوەری و ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت بەرهەم و ئەنجامی ژیانی خواپەرستانەو، خەم و پەژارەو ژیانی بەژانی بێ پسانەوەی دۆزەخ بەری تاڵی ژیانی نائیسلامییانەو دنیاپەرستانەیە، خۆشی و بەختیاریی ڕواڵەتی و دەروونی و ناخۆشی و ژینتاڵیی تاکی و کۆمەڵیی ئەم دنیایەش هەر زادەو بەرهەمی خواپەرستی و دنیا پەرستییە، خوای دادگەر و میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ فإما يأتينكم مني هدى فمن تبع هداي فلا يضل ولايشقى. ومن أعرض عن ذكري فإن له معيشة ضنكا ﴾ طه (١٢٣-١٢٤).

**شەشەم:**

مادام ژیانی دنیا مەیدان و دەرفەتی تاقیکردنەوەی ئینسان بێ و، بابەت و ماددەی تاقیکردنەوە (إمتحان) ەکەش بریتی بێ لەبەڕێوەبردنی ئەرکی خەلیفایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، کەواتە: گۆشەگیری و دنیانەویستی و لەپەراوێزی کۆمەڵگادا ژیان بەسەربردن لەڕوانگەی ئیسلامەوە شتێکی پووچ و هەڵەیە هەربۆیەش خوای زانا و کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وابتغي فيما آتاك الله الدار الآخرة ولاتنس نصيبك من الدنيا

وأحسن كما احسن الله إليك ولاتبغ الفساد في الأرض إن الله لايحب المفسدين ﴾ القصص (٧٧).

حەوتەم :

هەروەك چۆن وازلەدنیاهێنانو گۆشەنشینی بەبیانووی ژیانی دوارۆژ هەڵبژاردنو دنیا بەکەم گرتنەوە شتێکی هەڵەیەو ئیسلام رەتی دەکات، زیاد لەپێویست بەدنیاوە خەریكبوونو زیادەڕۆیی کردنیش لەگوزەرانو رابواردندا بەهەر بەهانەیەك بێ هەر هەڵەو لادانە، هەربۆیەش پێشەوامان ﷺ بەزۆری لەپاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: ﴿ اللهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ﴾ متفق عليه.

وەك دەبینین بەرلەوەی داوای خێرو چاکەی دوارۆژ بکات، خێرو چاکەی ژیانی دنیای داواکردووە.

کۆتایی ئەم بەندەش بەمودرعایە گرنگەو بەرزەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کەدەفەرموێ :
﴿ اللهم اصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري، واصلح لي دنياي التي فيها معاشي واصلح لي آخرتي التي فيها معادي، واجعل الحياة زيادة لي في كل خير، واجعل الموت راحة لي من كل شر ﴾ رواه مسلم.

وەك دەبینین ئەو پێشەوا رەندو پەسندە ﷺ دوای ئەوەی بۆچاكبوونی ئاینی لەخوا دەپاڕێتەوە پارێزراو لەهەموو گیروگرفتو بەڵایەك کەمایەی هاتنەوەی هەموو هیوار ئاراتێکە، یەکسەر داوا لەخوا دەکات کەئەو ژیانە دنیاییەشی بۆ چاكبکات کەگوزەرانی تێدا دەکات، ئینجا دوای ئەوە لەخوا دەپاڕێتەوە کەئەو دوارۆژەی بۆچاك بکات کەبۆلای دەگەڕێتەوە، پاشان داوا لەخوای پەروەردگاری دەکات کەژیانی دنیای بۆ بگێڕێ بەمایەی پەیدابوونو زیادبوونی هەموو خێرو چاکەیەك وەمردنیشی بۆ بگێڕێ بەرزگارکەرو مایەی ئاسوودەیی لەهەر جۆرە خراپەیەك.

# بەندی چوارەم : بوونەوەر

## ( خلق السموات والأرض وما بينهما في ستة أيام )

تێڕوانینی ئیسلامییانەی خۆشمان دەربارەی بوونەوەر لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت دەکەینەوە:

یەکەم :

بوونەوەر بەزاراوەی قورئان راتە (حەوت ئاسمانەکانو زەوییو ئەوەی دەکەوێتە

بڕوانیانەوە). دیارە تائێستا ئیـــان نەیتوانیوە شتێکی سەرگەرو جۆری دڵنیایی دەربارەی حەوت ئاسمانەکان (سبع سموات) هەوە بزانن و لەقورئانەو سوننەتیشدا شتێکی وا لەو بارەوە نەهاتووە.

دووەم:

مادام زەوی یەکێکە لەخۆرەکەکانی دەوری ڕۆژو ئەمیش ئەستێرەیەکە لەئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان (مجرة درب التبان)، کەواتە هەرکاتێك لەقورئاندا وشەی (سموات) یان (سبع سموات) یان (سماء) بەکاردێ زەویش دەگرێتەوە، بەواتایەکی دی: هەرکام لەم سێ وشانە بەواتای بوونەوەر (کون) دێن بەزاراوەی زانیاری ئەمڕۆ.

سێ یەم:

ئاسمانەکان و زەوی، واتە بوونەوەر بەرلەوەی ئەم دیمەنەی ئێستای لەلایەن خواوە وەربگرێ هەمووی پێکەوە لکاوو پێکەوە جۆشدراو بووە: ﴿ أولم ير الذين كفروا ان السموات والأرض كانتا رتقا ففتقناهما ﴾ الأنبياء (٣٠).

چوارەم:

بوونەوەر لەئەسڵدا گازێك بووە لەشێوەی دوکەڵ (دخان) دا: ﴿ ثم استوى إلى السماء وهي دخان ﴾ فصلت (١١)، واتە: ئەو ماددەو کەرەستە خاوەی کەبوونەوەری لێ پێك هاتووە لەسەرەتاوە لەشێوەی گازێکی پڕژوبڵاودا بووە.

پێنجەم:

بوونەوەر (ئاسمانەکان و زەوی) لەماوەی شەش قۆناغاندا ئەم شێوەیەی ئێستای وەرگرتووە: ﴿ إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض في ستة أيام ﴾[1] الأعراف (٥٤).

---

(١) چونکە (یوم) لەزمانی عارەبیدا هەروەك چۆن بۆ شەوو ڕۆژی سەر زەوی کە (٢٤) سەعاتە بەکاردێ بەمەعنای موتڵەقی کاتیش بەکار دێ: (یوم لك ویوم علیك) یان ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە. لەقورئانیشدا (یوم) یەکسانە بە (١٠٠٠) ساڵ: ﴿ إن يوما عند ربك كألف سنة مما تعدون ﴾ الحج (٤٧)، ﴿ يدبر الأمر من السماء إلى الأرض ثم يعرج إليه في يوم كان مقداره ألف سنة مما تعدون ﴾، وە (یوم) یەکسانە بە (٥٠٠٠٠) ساڵ: ﴿ تعرج الملائكة والروح إليه في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة ﴾ المعارج (٤).

کەواتە: یەك (ڕۆژ) یانی ماوەیەك لەکات چ کەم بێ وەك (٢٤) سەعات یان زۆر وەك (١٠٠٠) ساڵ و (٥٠٠٠٠) ساڵ و کەمتر و زیاتر. ئنجا مادام خوداش دیاری نەکردبێ ئێمەش بۆمان نیە دەبێ بڵێین شەش قۆناغ.

**شەشەم:**

ئەم بوونەوەرە ئەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردەکاری تێدا ڕەچاوکراوە هەتا بڵێی باسادار (منظم) و بێ کەم و کوڕییە: ﴿ الذي خلق سبع سموات طباقا ماترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور. ثم ارجع البصر كرتين ينقلب إليك البصر خاسئا وهو حسير ﴾ الملك (٣-٤).

**حەوتەم:**

ئاسمانی یەکەم و نزیك لەئێمەی دانیشتووانی سەر زەوی بەئەستێرەو خۆرەکانی ڕازێنراوەتەوەو کراوەتە چراخان، وەلەپێدابەرزبوونەوەو سەرکەوتن و گوێ گرتنی شەیتانەکانیش پارێزراوەو پەرژین کراوە وەك خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ إنا زينا السماء الدنيا بزينة الكواكب وحفظا من كل شيطان مارد لايسمعون إلى الملإ الأعلى ويقذفون من كل جانب دحورا ولهم عذاب واصب إلا من خطف الخطفة فاتبعه شهاب ثاقب ﴾ الصافات (٦-١٠)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ولقد زينا السماء الدنيا بمصابيح وجعلناها رجوما للشياطين ﴾ الملك (٥).

کەواتە: زۆر نزیکە کەهەرچی بەچاوە ڕووت و بەدووربینەکان دەبینرێ لەئەستێرەو کەهکەشانە دوورو نزیکەکان هەمووی ئاسمانی یەکەم یان بەشێکی ئەو ئاسمانە بێ.

**هەشتەم:**

هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی (بوونەوەر) دایە خوا بۆ ئینسانی ڕام کردووە کەسوودی لێ وەربگرێ و لەژیان و گوزەرانی دنیایدا لێی بەهرەمەندبێ: ﴿ وسخر لكم ما في السموات وما في الأرض جميعا منه ان في ذلك لأيات لقوم يتفكرون ﴾ الجاثية (١٣).

**نۆیەم:**

وای دەچێ و زۆر نزیکە ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕو زەبەلاح و سنوور نادیارە تێکڕا شانۆ (مسرح) یێك بێ بۆ تاقی کردنەوەی ئینسان وەخابێ، چونکە لەلایەکەوە خوای بەخشەر دەفەرموێ: هەرچی لەبوونەوەر دایە بۆ ئێوەم مەیسەر کردووە، وەلەلایەکی دیکەشەوە ڕای دەگەیەنێ کەهەرکات لەگەڵ کۆتایی پێهاتنی ژیانی ئینسان لەسەر زەوی ئاسمانەکانیش وەك تۆمارێك دەپێچرێنەوەو دەگێڕرێنەوە سەر حاڵەتی پێشوویان: ﴿ يوم نطوي السماء كطي السجل للكتب كما بدأنا أول خلق نعيده وعدا علينا إنا كنا فاعلين ﴾ الأنبياء (١٠٤).

هەروەها خوای میهرەبان و دادگەر ڕایگەیاندووە کەڵەڕۆژی دواییدا هەم ئاسمانەکان و هەم زەویش (واتە تێکڕای بوونەوەر) دەگۆڕێن و بەشێوەو چۆنیەتی یەکی دیکە دروست

دەکرێتەوە: ﴿ يوم تبدل الأرض غير الأرض والسموات وبرزوا لله الواحد القهار ﴾ إبراهيم (٤٨).

دەیەم:

ئەم بوونەوەرەو هەموو ئەو کائیناتەی تێیدایە تێکڕا ملکەچو پابەندی ئەو نەخشەو بەرنامەیەن کەلەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆیان دیاری کراوە، وەتاقە مەخلوقێك کەتوانای لەیاسا دەرچوونو سەرەڕۆیی. لەبەشێکی ژیانیدا . پێدرابێ ئینسانە[1]ئەویش بەمەبەستی تاقی‌کردنەوەی: ﴿ أفغير دين الله يبغون وله أسلم من في السموات والأرض طوعا وكرها وإلينا يرجعون ﴾ آل‌عمران (٨٣)، ﴿ لاالشمس ينبغي لها أن تدرك القمر ولاالليل سابق النهار وكل في فلك يسبحون ﴾ يس (٤٠).

یازدەهەم:

دوو جۆرن لەو دروستکراوە بەسەنە، خوای فەرموویەتی: ﴿ فلا أقسم بما تبصرون وما لاتبصرون ﴾ الحاقة (٢٨،٢٩).

ئەم بوونەوەرە بەس بریتی نیە لەدیوە بینراوو بەرهەستەکەی بەڵکو دیوێکی پەنهانو نابەرهەستیشی هەیە کەلەریشتەو پەری (الملائكة والجن)ن.

ئەمە بەکورتی تێروانینی ئیسلامی بوو دەربارەی مەسەلە گرنگو سەرەکییەکانی بوون (خوا سبحانه وتعالی‌و ئینسانو ژیانو بوونەوەر).

بەڵێ...ئەمەیە تێروانینو جیهانبینی‌ی ئیسلامی، جیهانبینییەك کەبەڕاستی سەدا سەدمان هەیە لەڕاستی‌و تەواوییدا، چونکە هەر لەو سەرچاوەیە هاتووە کەئینسانو ژیانو بوونەوەری هێناونە دی.

■ ■ ■

بێتواتە/سەرئەشکەوتان

١٤١٣.ك

---

(١) ژمارە جند (جن) یش لەو مەسەلەیەدا وەك ئینسانن.

# دوو پێشەکیی کورت

## یەکەم: جیاوازیی نێوان تێڕوانین و بیروباوەڕ:

دەتوانین لەچەند خاڵێکدا جیاوازیی نێوان تێڕوانین و بیروباوەڕ بخەینەڕوو:

١. تێڕوانین بریتییە لەچۆنیەتی ناسینی بوون (کیفیة معرفة الوجود) بەڵام بیروباوەڕ بریتییە لەجۆرە هەڵوێستێک دەربارەی بوون (نوع من الموقف حول الوجود).

٢. تێڕوانین بەبێ بیروباوەڕیش دەبێ، بەڵام بیروباوەڕ بوونی بەهەبوونی تێڕوانینەوە بەندەو، هەتا ئەو نەبێ ناگونجێ پەیدا بێ، کەواتە ڕێدەکەوێ تێڕوانینێکی ڕاست و دورووست هەبێ بەڵام بیروباوەڕی لەگەڵ نەبێ یان بیروباوەڕێکی پووچەڵی لەگەڵ بێ.

٣. تێڕوانین سەرچاوەو کانگای هەڵقوڵین و پەیدابوونی بیروباوەڕە، واتە تێڕوانین چۆنچۆنی بێ بیروباوەڕیش هەروا دەبێ، مەگەر بەدەستی پێچەوانەی داخوازیی تێڕوانین بجووڵێتەوە.

٤. هەرچەندە بیروباوەڕ لەتێڕوانینەوە هەڵدەقوڵێ بەڵام ئەوەی دەکرێتە پێوەرو تەرازووی ئینسان (بیروباوەڕ) یەتی نەک تێڕوانینی، چونکە وەک گوتمان تێڕوانین واتە ناسینی بوون وەک خۆی (معرفه الوجود کما هو)، بەڵام بیروباوەڕ بریتییە لەهەڵوێستی مرۆڤ بەویستی خۆی، جادیارە ناسینی واقیعی بوون بەتەنها هیچ ئازایەتی یان نائازایەتی ئینسان ناگەیەنێ، چونکە هەموو ئامرازەکان ناسین و پەیبردن بە (بوون) بەهەموو کەس دراون و هەموویان - چاک و خراپ - دەتوانن (بوون وەک خۆی) بناسن، بەڵام ئەوەی چاکی و خراپی ئینسانی لێوەردەگیرێ و دەبێ بەهۆی خۆشویستران و ڕێزلێگیرانی یان بوغزێنران و زەبوونکرانی ئەو بیروباوەڕەیەتی کەبەویستی خۆی دیاری دەکات، نەک وەک تێڕوانین کەبێویستی وی لەواقیع هەڵبهێنجرێ و وەربگیرێ.

٥. کەواتە بەبیروباوەڕ بڕوادارو بێبڕوا، موسڵمان و کافر، لەیەک جیا دەکرێنەوە نەک بەتێڕوانین، چونکە دەبینی موسڵمانێک و کافرێک وەک یەک (بوون) یان ناسیوەو دەزانن کەخوایەکی بەدیهێنەرو پەروەردگار ئەم (بوون) ەی هێناوەتە دی و سەرپەرشتیی دەکات، بەڵام موسڵمانەکە لەگەڵ داخوازییەکان (مقتضیات) ی تێڕوانینەکەدا ڕاست دەکات و ئەو تاقە بیروباوەڕە ڕاستەی کە لێی هەڵدەقوڵێ دەیکاتە بیروباوەڕو هەڵوێستی خۆی، کەچی نامووسڵمانەکە ئامادەی وەرگرتنی ئەو تاقە ئەنجام و بەرهەمە ڕاست و تێڕوانینەکە نابێ.

چاکترین نموونەش بۆ ئەم جۆرە حاڵەتە هەڵوێستی (ئیبلیس) بوو دەربارەی خوای پەروەردگاری خۆی کەهەرچەندە تێڕوانینەکەی بریتیبوو لە :﴿ خلقتني من نار وخلقته من طين ﴾ الأعراف (١٢)، بەڵام هەڵوێستەکەی بریتیبوو لە ﴿ أبى واستكبر وكان من

الكافرين ﴾ البقرة (٣٤).

هەروەها هەڵوێستی دارودەستەی فیرعەون کەخوای مەزن لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ فلما جاءتهم آياتنا مبصرة ظلموا بها وقالوا هذا سحر مبين. وجحدوا بها واستيقنتها أنفسهم ظلما وعلوا فانظر كيف كان عاقبة المفسدين ﴾ النمل (١٣-١٤).

دەبینین هەرچەندە لەدەروونی خۆیاندا (يقين) یان هەبووە لەڕاستی موسا و بەڵگەکانیدا ﴿ واستيقنتها أنفسهم ﴾، بەڵام بەهەڵوێست بێبڕوایی یان نیشان داوە ﴿ وجحدوا بها ﴾.

هەروەها هەڵوێستی (عمرو بن هشام) کە بە( ابو الحكم) ناسرابوو و دوایی بە (ابو جهل) شوورەتی دەرکرد، کەدەیگوت: دەزانم و دڵنیام کەموحەممەد مادام قەت لەگەڵ ئێمەدا درۆی نەکردووە بەناوی خوداشەوە درۆ ناکات، بەڵام تیرەی ئێمە (بنو عبدالشمس) لەگەڵ تیرەی (بنو هاشم) دا هەر پێشبڕکێمان بووە ئێمە پێغەمبەرێک لەکوێ بێنین؟! نەخێر ئامادەنین بەدوای پێغەمبەری ئەوان بکەوین.

یان ئەوانەی کەبەدوای (مسيلمة الكذاب) کەوتبوون دەیانگوت: خۆ دەزانین کە (مسيلمة) درۆ دەکات بەڵام: ﴿ الكذاب ربيعة أحب إلينا من صادق مضر ﴾!

## دووەم: گرنگی و پلەوپایەی بیروباوەڕ لەئیسلامدا

بیروباوەڕ (العقيدة) لەئاینی ئیسلامدا بەرزترین پلەوپایەی هەیەو گرنگترین بەشیەتی، چونکە بناغەو بنچینەی هەموو بەشەکانی دیکەیەو. ئەگەر ئیسلام بەخانوویەک دابنێین بیروباوەڕ بناغەکەیەتی و، ئەگەر وەک درەختێک تەماشای بکەین بیروباوەڕ ڕەگ و ڕیشەیەتی و، ئەگەر بەجەستەیەکی بچوێنین بیروباوەڕ پەیکەری ئێسکیەتی.

هەربۆیەش نزیکەی سێ لەسەر چاری قورئان (٣/٤) کەلەشاری مەککەی پیرۆزدا هاتۆتە خوار سەرلەبەر دەربارەی بیروباوەڕو بنچینە گرنگەکانیەتی و، لەشاری مەدینەی پڕ نووریش دیسان جار لەدوای جار تەئکیدی بەردەوام لەسەر ڕوونکردنەوەو چەسپاندنی کراوە.

وەهەر بۆیەش تەمەنی هەرە بەرزوپیرۆزی (٢٣) ی ساڵەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ، (١٣) ساڵی ڕەبەقی بۆ چەسپاندن و ڕوونکردنەوەی ئەو مەسەلە گرنگ و مەزنە تەرخان کراوە.

کەواتە: پێویستە دڵنیاو سۆگەر بین کەدامەزراندن و بنیاتنانی بیروباوەڕ لەدڵ و عەقڵی کۆمەڵێکدا کەدەوریستری کۆمەڵگایەکی ئیسلام و کیان و قەوارەیەکی ئیسلامیان لێ پێکبهێنرێ، یەکەمین و گرنگترین هەنگاوە، پێش ئەوە نابێ هیچ هەنگاوێکی دیکە بنرێ ئەگەرنا کارەکە پووچەڵ و بێ کاکڵ دەبێ و دەبێتە خوری و سەرناگرێ.

وەدەبێ دڵنیاو مسۆگەربین کەهەتا بیروباوەڕ قوڵتروپتەوترو دامەزراوتر بێ، پابەندیو مسوڵمانەتیش چاکترو ساغترو تەواوترو هەمەلایەنتر دەبێ.

ئێستاش دەچینە سەر ئەسڵی مەبەست:

وەك گوتمان ئەگەر تێڕوانین (تصور) بریتی‌یە لەناسینی بوون (الوجود) بەشێوەیەکی ڕاست‌و درووست‌و واقیعی - لەسنووری توانای ئینساندا . بیروباوەڕ (ئایدیۆلۆژی) بریتی‌یە لەعەقڵیەتی ئینسان دەربارەی بوون (الوجود) لەبەر تیشکی ئەو تێڕوانینەدا.

جائێستا ئێمە خوا پشتیوانبێ بیروباوەڕی ئیسلامی‌یانەی خۆمان کەزادەو هەڵقوڵاوی تێڕوانینمانە . دیارە وەك پێشتریش گوتمان ئەمانیش‌و هەموو شتێکی دیکەشمان هەر لەوەحی‌و پەیامی بێ‌هەڵەوپەڵەی خواوە هەڵدەقوڵێ . لەم پێنج بەندەی خوارەوە بەکورتی دەخەینەڕوو:

بەندی یەکەم: پێناسەی بیروباوەڕ.

بەندی دووەم: زیادکردن‌و کەم‌بوونی ئیمان.

بەندی سێیەم: چۆنیەتی دامەزراندنی بیروباوەڕو هاتنە نێو ئیسلامەوە.

بەندی چوارەم: پایەکانی بیروباوەڕ.

بەندی پێنجەم: چۆنیەتی کافربوونی ئینسان‌و هەڵوەشانەوەی شایەتمان.

## بەندی یەکەم:

# پێناسەی بیروباوەڕ (ئیمان ، عەقیدە)

بەپێویستی دەزانم بەرلەهەموو شتێك پێناسەیەکی پوختی بیروباوەڕ بکەین ئینجا بێینە سەر مەسەلەکانی دیکە.

زانایانی ئیسلام دەربارەی حەقیقەتی وشەی (ئیمان) دوو ڕایان هەن:

(أ) کەئیمان بریتی‌یە لەبەڕاست‌دانان (تصدیق) ی بەدڵ‌و دانپێداهێنان (إقرار) ی بەزمان‌و کردەوە بەئەندامەکان (التصدیق بالجنان والإقرار باللسان والعمل بالأرکان). دیارە ئەمەش قسەی زۆربەی هەرە زۆری جەماوەری مسوڵمانانە کەبە (أهل السنة والجماعة) شۆرەتیان دەرکردووە.

(ب) کەئیمان بریتی‌یە لە (بەڕاست‌دانانی دڵ‌و دانپێداهێنانی زمان)ە، دەڵێن کردەوە بەشێکی بڕوا نیە بەڵکو مەرجو بەرهەمیەتی، بەڵام لەڕاستیدا ئەم دوو ڕایە جیاوازی‌یەکی زۆریان لەنێواندا نیەو، زیاتر جیاوازی قسەیی (لفظي) یە نەك کردەیی (عملي) چونکە مادام هەموو پێشەواو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێك‌کەوتوون کەئینسان بەکردنی تاوانە گەورەکانی (الکبائر) لەبازنەی ئیمان ناچێتە دەرێ، یەکسانە کەکردەوەی چاك بەشێکی ئیمان بێ یان زادەو بەرهەمی بێ چونکە هەم ئەوانەش کەدەڵێن کردەوە بەشێکە لەئیمان ناڵێن بەشێکی پێکهێنەر (مکون) یەتی‌و بەبێ ئەو

ئیمان دانامەزرێ بەڵکو دەڵێن بەشێکی تەواوکەر (مكمل) یەتی وەهەم کەسەرانەش کەدەڵێن کردەوە بەشێکی ئیمان نیە، دەڵێن ئیمان هەتا تەواوترو دامەزراوتربێ چاکترو زیاتر کردەوەو ڕەفتاری چاکو پەسند لەخاوەنەکەیدا دێنێتە دی.

دیارە مەبەست لەبەڕاستدانان‌و دانپێداهێنان (التصديق والإقرار) بەڕاستدانان‌و دانپێداهێنانی خوایەتی خواو پێغەمبەرایەتی‌ی پێغەمبەر ﷺ و هەموو ئەو شتانەیە کەئەوان فەرموویانەو پێیان ڕاگەیاندووین، وەمەبەستیش لەکردەوە (عمل) ڕەفتارکردن‌و بەڕێوەچوونە بەپێی ئاراستەکردنی بەرنامەی خواو ڕێو شوێنی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ.

ئێستاش بۆ ئەوەی مەعنار حەقیقەتی (ئیمان) مان چاکتر بۆ ڕوون بێتەوە چەند خاڵێك دەخەینەڕوو کەزانار پێشەوایانی ئیسلام لەبارەی ئیمانەوە لەسەریان ڕێك کەوتوون:

١. لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەدانپێداهێنانی زمان ئەگەر قەناعەتی نێو دڵی لەگەڵ نەبێ بەئیمان لەقەڵەم نادرێ، بەڵکو ئەوە حاڵەتی ئەو دەغەڵ‌و موناfیقانەیە کەخوا لەکافران خراپتری لەقەڵەم داون‌و فەرموویەتی: ﴿ إن المنافقين في الدرك الأسفل من النار ﴾ النساء(١٤٥).

٢. وەلەسەر ئەوەش یەك دەنگن کەقەناعەت هێنانی دڵ بەتەنها زانین‌و ناسینی هەق بەبێ پێ‌لێنان‌و دانپێداهێنانی زمان پێی ناگوترێ ئیمان، چونکە خودا دەربارەی جوولەکەکان فەرموویەتی: ﴿ الذين آتيناهم الكتاب يعرفونه كما يعرفون أبناءهم الذين خسروا أنفسهم فهم لايؤمنون ﴾ الأنعام (٢٠)، بەلاَم چونکە دانیان پێدا نەهێنا بەو زانین‌و ناسینە ڕووتە نەبوونە موسڵمان، وەدەربارەی دارو دەستەی فیرعەونیش فەرموویەتی: ﴿ وجحدوا بها واستيقنتها أنفسهم ظلما وعلوا فانظر كيف كان عاقبة المفسدين ﴾ النمل (١٤)، دەبینین هەرچەندە کەبەدڵ یەقینیان هەبووە لەڕاستی موساو بەڵگەو موعجیزەکانیدا بەلاَم لەسۆنگەی ئەوەوە کەدانیان پێدا نەهێناوە هەر لەحاڵەتی کافریدا ماونەوە.

٣. وەلەسەر ئەوەش قسەیان یەکە کەخوا دانپێداهێنانی زمانو قەناعەتی دڵ‌و کردەوەی لەبەندەکانی داواکردووە، ئەوەندە هەیە زۆربەیان کردەوە بەبەشێکی ئیمان دەزانن هەندێکیشیان بەزیادەو بەرهەمی وی دەزانن.

٤. وەلەسەر ئەوەش یەك لەدەن کەئەگەر کەسێك بەدڵ خواو پێغەمبەرو بەرنامەکەیان بەڕاست‌و تەواو بزانێ‌و بەزمانیش دانی پێدابهێنێ‌و بەلاَم بەئەندامەکانی ڕەفتار بەگوێرەی بڕوای نێودڵ‌و سەر زمانی نەکات، ئەوا تاوانبارەو سەرپێچی لەخواو پێغەمبەرەکەی کردووەو شایستەی هەڕەشەو سزای خوایە، بەلاَم هەر بەبڕوادار حسێب دەکرێ.

٥. وەلەسەر ئەوەش پێك هاتوون کەخاوەنی گوناحی زل مادام بەحەڵاڵی نەزانی ئەگەر پێش ئەوەی تۆبەشی لێ‌بکات بمرێ هەر بەکافر حسێب ناکرێ. بەڵکو ئەوانەی کەبەهۆی تاوانی گەورەوە ئیمان لەبازنەی ئیمان دەبەنە دەرێ (خوارج) و (معتزلة) کانن، جاهەرچی تاقمی یەکەمن دەڵێن: (بابای تاوانبار مادام تۆبە لەگوناحەکانی نەکات لەبازنەی ئیماندا نەماوەو کافربووە، بەلاَم تاقمی دووەم دەڵێن: لەبازنەی ئیماندا نەماوەو

نەش چۆتە خانەی کوفرەوە بەڵکو لەنێوان هەردووکیاندا هەڵواسراوە . منزلە بین منزلتین).

٦. ڕەزانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەش ڕێککەوتوون کەئەو بیروباوەڕەی لەبەراستزانینی دڵو پێلێنانی زمانو کردەوەی ئەندامەکان پێکدێ. ئەوە ئەو ئیمانەیە کەئینسان لەلای خوا پێی دەبێتە بڕوادارو مسوڵمانو پێی دەچێتە بەهەشتێو ئەگەر بەئەندازەی خراپەکانیشی لەدۆزەخێدا بمێنێتەوە، دوایی ڕزگاری دەبێو هەمیشەیی نابێ، ئەگەرنا ئەو ئیمانەی کەپێویستە بۆئەوەی مرۆڤ لەدنیادا پێی بەبڕوادارو ئەهلی ئیسلام حسێب بکرێو وەك ئەهلی قیبلە ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ ئەوە بەس دانپێداهێنانی بەزمانو شایەتمانهێنانە، وەهەرکەسێك شایەتمانی هێنا لەژیانی دنیایدا بەمسوڵمان لەقەڵەم دەدرێو، مالی مسوڵمانەتی دەدرێتێو داوای لێدەکرێ کەپابەندبێ بەیاساکانی بەرنامەی خواوە چونکە شایەتمانەکەی داخوازی دەکات، ئیدی هەرچەندە گیرۆدەی تاوان. خراپەبێ حوکمی کوفری بەسەردا نادرێ ئەوەندە هەیە ئەگەر خراپەو تاوانەکەی سزایەکی دنیایی بۆ بڕیاردرابێ لەسەری سزا دەدرێ، بەلام نابێ بێئاگابین لەوەی کەئەو جۆرە کەسانە بەدوو مەرجان بەمسوڵمانو ئەهلی قیبلە حسێب دەکرێن؛ یەکەم: ئەو خراپەو تاوانەی دەیکەن بەحەڵاڵی نازانن، دووەم: هیچ لەسەر ڕەفتاریکیان لێ نەپشکرێتەوە کە بە (مکفر) کافرکەر دانراونو شایەتمانەکەیان لێهەڵئەوەشێنەوە. دواتریش بەئیزنی خودا باسی چۆنیەتی ئیمان دامەزرانو هۆیەکانی هەڵوەشاندنەوەی دەکەین.

### بەندی دووەم:

## زیادکردنو کەمکردنی ئیمان

هەرچەندە ئەوانەی کەپێیان وانیە کردەوە بەشێکی بیروباوەڕە بڕواشیان بەنزمیو کەمیو زیادی ئیمان نیە بەڵکو دەڵێن ئیمان هەریەکێکە بەلام جیاوازی مسوڵمان بەهۆی ئەندازەی تەقوار خۆشویستنی خواو لێترسانیو جلەوی نەفس توندکردنو دنیابەکەم گرتنو دوارۆژهەڵبژاردنەوەیە، بەلام لەڕاستیدا دەقی قورئانو سوننەت لەسەر ئەوە زۆرن کەکردەوە بەشێکە لەئیمانو لێی جودا نابێتەوە، دەقی زۆرو زەوەندیش هەن دەربارەی کەمو زیادی بیروباوەڕ بۆ وێنە:

- ﴿ إنما المؤمنون الذين إذا ذكر الله وجلت قلوبهم وإذا تليت عليهم آياته زادتهم إيمانا ﴾ الأنفال (٢).
- ﴿ الذين قال لهم الناس ان الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم إيمانا وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل ﴾ آل‌عمران (١٧٣).
- ﴿ هو الذي أنزل السكينة في قلوب المؤمنين ليزدادوا إيمانا مع إيمانهم ﴾ الفتح (٤).

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی:

- ﴿ الإيمان بضع وسبعون شعبة أعلاها قول لاإله إلا الله، وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان ﴾ متفق عليه بلفظ مسلم.
- ﴿ أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا ﴾ رواه الترمذي والحاكم وقال صحيح على شرطهما.
- ﴿ من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان ﴾ رواه مسلم.

## گرنگترین هۆیەکانی زیادبوون و گەشەکردنی ئیمانیش ئەمانەن:

### ١ - زانیاری ( العلم ):

چونکە ئینسان هەتا زانیاری‌ی زیاتر بێ یەقین‌و عیرفانی پتر دەبێ. دیارە مەبەستیش لە (زانیاری) لێرەدا زانیاری‌یە دەربارەی خواو ناوە بەرزەکانی‌و سیفەتە پەسندەکانی‌و کردەوەکانی‌و دروستکراوەکانی... وەزانیاری دەربارەی پێغەمبەری خواو چاکتر ناسین‌و پێ‌ئاشنابوونی‌و شارەزایی پەیداکردن دەربارەی بەرنامەکەی‌و خوو ورەوشتی ژیان‌و گوزەرانی‌و جۆری خواپەرستی‌یەکەی‌و خەباتی‌و هەڵس‌و کەوتی رۆژانەی‌و... هتد، وەزانیاری دەربارەی قورئان‌و سوننەت‌و بەرهەم‌و کەلەپووری زاناو پێشەوایانمان‌و ژیان‌و گوزەران‌و هەڵوێست‌و هەڵس‌و کەوتیان.

بۆیەش زانیاری دەبێتە هۆی گەشەکردن‌و کامڵبوونی هەرچی زیاتری بیروباوەڕ، چونکە ئەسڵی ئیمان بریتی‌یە لەزانین‌و دانپێدانانی خوایەتی خواو پێغەمبەرایەتی (محمد ﷺ) و هەرچی لەخوارە هێناریەتی کەلە وشەی شایەتمان: ﴿ أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد ان محمدا رسول الله ﴾ دا کورت دەبێتەوە، هەربۆیەش هەرکەسێك ئەو شایەتمانی‌یە بێنێ بەبڕوادار حسێب دەکرێ، بەڵام بێگومان جیاوازی زۆرە لەنێوان دوو کەس‌دا کەیەکێکیان هەروا بەکورتی لەمەعناو نێوەڕۆکی شایەتمان حاڵی‌بووە، ئەوی دیکەشیان بەتێرو تەسەلی لێی تێگەیشتووە بەدەریای بێ‌بنی خواناسی‌و پێغەمبەرناسیدا چۆتە خوارێ، هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ ومن الجبال جدد بيض وحمر مختلف الوانها وغرابيب سود ومن الناس والدواب والأنعام مختلف ألوانه كذلك إنما يخشى الله من عباده العلماءُ إن الله عزيز غفور ﴾ فاطر (٢٨)، وەفەرموویەتی: ﴿ أمن هو قانت اناء الليل ساجدا او قائما يحذر الآخرة ويرجوا رحمة ربه قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لايعلمون إنما يتذكر اولوا الألباب ﴾ الزمر (٩).

### ٢ - کردەوەی چاك ( العمل الصالح ):

بەڵێ... کردارو ڕەفتاری چاك‌و پەسند، وەك جۆرەکانی خواپەرستی (نوێژو ڕۆژوو

وحەج و زەکات، خێرو خێرات، قوربانی سەربڕین...هتد)، هەروەها ڕەوشتە بەرزەکان، فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە، خەبات و تێکۆشان... هتد دەبێتە مایەی پتەوبوون و بەقین و گەشەکردنی بیروباوەڕ. بەپێچەوانەیشەوە کەمیی کردەوەی چاکو نقووم‌بوون لەتاوان و خراپەو ڕابواردندا دەبێتە هۆی لاوازبوونی بڕوا جاری وا هەیە سەریش دەکێشێ بۆ کوفرو بێ‌بڕوایی.

چونکە لەڕاستیدا حەقیقەتی ئیمان بریتی‌یە لەبەڕاست‌زانین و دانپێداهێنان و بەکردەوە ئەنجامدان، کەئەمانەش هەرسێکیان لەجەوهەرو نێوەڕۆکدا یەکن چونکە دان پێداهێنانی زمان بۆ دەرخستن و سەلماندنی ئەو حەقیقەتەیە کەلەدڵدا جێگیر بووەو، کردەوەی ئەندامەکانیش بەڵگەو شایەدی ڕاستی و تەواویی دان پێداهێنانی زمانە، هەر بۆیەش (حسن البصري) فەرموویەتی: (ليس الإيمان بالتمني ولكن ما وقر في القلب وصدقه العمل) کەوابێ دەتوانین بڵێین: ئیمان و بیروباوەڕی ئیسلامی دوو جۆرە دانپێداهێنانی پێویستن:

أ. دانپێداهێنانی دەروونی و دەمی (إعتراف نظري)، چونکە دڵیش هەر لەڕێی زارەوە دەزانرێ و پەی پێ دەبرێ.

ب. دانپێداهێنانی کردەیی (إعتراف عملي) بەفەرمانبەری و جێبەجێ کردن.

کەواتە: هەتا کردەوەو ڕەفتاری چاکو پەسند زیاتر بێ بیروباوەڕەکە زیاتر دەبێ و چاکتر گەشە دەکات و خراژوو دەبێ، چونکە چاکترو زیاتر دان بەخوایەتی خواو پێغەمبەرایەتی موحەممەدو ڕاستی و تەواوی بەرنامەکەیاندا دەهێنرێ و ئیسپات دەکرێ.

## ٣ - یادکردن و بیرکردنەوە ( الذكر والفكر ):

مەبەست لەیادکردن و باسکردنی خوایە بەدڵ و زمان بەهۆی خوێندنەوەی کتێبەکەیەوە، خوای بەرزو مەزن لەوبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ﴾ آل عمران (١٩١)، وەفەرموویەتی: ﴿ الذين آتيناهم الكتاب يتلونه حق تلاوته أولئك يؤمنون به ﴾ البقرة (١٢١). وەمەبەست لەبیرکردنەوەش بیرکردنەوەو تێڕامان و سەرنجدانە بەعەقڵ و دڵ لەدروستکراوەکانی خواو ووردبوونەوەیە لەئایەتە دەروونی و ئاسۆیی‌یەکانی: ﴿ سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق ﴾ فصلت (٥٣).

چونکە ئینسان و دەوروبەرو بوونەوەر ئاوێنەی تێدا تەجەللاکردن و دەرەوشانەوەی ناوو سیفەتە چاکو پەسندەکانی خودان:

سرووشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە
چاك سەرنجی بدە بزانە چی‌ی تیایە
لەڕێی کردەوە کرکار دەناسرێ
بوونەوەر کرەو کردگاری خوایە

هەربۆیەش خوای کاربەجێ هەروەك چۆن ڕستەکانی قورئانی ناوناون (آیات) دیاردەو دیمەنە سروشتی یەکانی وەك ئاسمانو زەوی و بایبارانو دەریاو دارو درەختو شینا سەوزو هەورە بریسکەو شاخو ڕووبارو... هتدیشی هەر ئاوا ناوناوە چونکە هەروەك چۆن ڕستەو برگەکانی قورئان بەڵگەو نیشانەی بوونو بەرزیو مەزنی خاوەنەکەیانن، دیاردەو دیمەنە دڵبزوێنەکانی سروشتیش بەهەمان شێوە.

خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لأيات لأولي الألباب. الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والأرض ربنا ماخلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار ﴾ آل‌عمران (١٩٠-١٩١).

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەدەگونجێ بیرکردنەوە (تفكر) بەبێ دڵ ئەنجام بدرێ، بەڵام یادکردن (تذكر) بەبێ عەقڵ ناکرێ، چونکە کە چەق (مركز) ی هەستو نەستو عاتیفەیە بەعەقڵەوە پەیوەستەو بەبێ ئەو هیچی بۆ ناکرێ، بەڵام عەقڵ بەسەر دڵدا حاکمەو دەتوانێ بەبێ ئەویش کاری خۆی بکات.

دیارە (ذكر) یش لەدڵەوە هەڵدەقوڵێو عەقڵو زمان یارمەتی دەدەن یان نادەنو هەتا هاوکاری ئەوان زیاترو چاکتربێو لەدڵیشەوە بەجۆشتر هەڵقوڵێ زیکرەکە تەواوتر دەبێ، بەڵام (فكر) هیچ پەکی لەسەر دڵو زمان نەکەوتووەو بەتەنها کاری خۆی هەڵدەسووڕێنێ.

کۆتایی ئەم باسەش بەم دێرە شیعرەی مەحوی دێنم کەدەڵێ:

سەر کە هۆشێکی نەبێ زۆرکە تاڵم بۆچی‌یە؟!<br>
دڵ کەجۆشێکی نەبێ شوورشەی بەتاڵم بۆچی‌یە؟!

بەندی سێیەم:

# چۆنیەتی دامەزراندنی بیروباوەڕو هاتنە نێو ئیسلامەوە

زانایانی ئیسلام تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەبنچینەی دامەزرانی بیروباوەڕو دەرگای هاتنە نێو ئیسلامەوە ئەوەیە کەئینسان بەدڵ باوەڕ بێنێو بەزمانی دانی پێدابنێ کەبەس (خودا - سبحانه وتعالى -) بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراویەتی. وەموحەممەد ﷺ پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایەو هەرچی لەلایەن خوای پەروەردگارییەوە

هێناویەتی هەق‌و ڕاستەو پێویستە ڕەفتاری پێ‌بکات، وشەی هەرە بەرزو پاکیش (الکلمة الطیبة) یش ﴿ لا إله إلا الله محمد رسول الله ﴾ کراوەتە ناوونیشان‌و بەڵگەو ڕێگای دەربڕینی ئەو بیروباوەڕە...

کەواتە هەرکەسێك ئەم وشەیەی بەزمانی گوت‌و بەدڵیش قەناعەتی پێ‌ی هەبوو و بەڕاستی زانی، وەهیچ شتێکی دەروونی‌و زارەکی‌و کردەیی وای لێ نەپشکوتەوە کەهەردووك یان یەکێك لەدوو بەشی شایەتمانەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، ئەوە مانای وایە هاتۆتە نێو ئاینی خواوەو لەو کوفرە ڕزگاری بووە کەلەسەری بووە.

بەڵگەو شایەدی ڕاستی‌ی ئەم قسەیەش لەسوننەتی پێغەمبەردا ﷺ زۆرن، بۆ وێنە:

- ﴿ أشهد ان لا إله إلا الله وإني رسول الله لايلقى بهما عبد غير شاك بهما إلا دخل الجنة ﴾ رواه مسلم.
- عن عبادة بن الصامت رضي الله تعالى عنه قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: ﴿ من شهد أن لا إله إلا الله وان محمدا رسول الله حرم الله عليه النار ﴾ رواه مسلم.
- من حديث الشريد بن سويد الثقفي ان النبي ﷺ قال لجارية: ﴿ من ربك؟ قالت: الله. قال: فمن أنا؟ قالت: رسول الله قال: اعتقها فإنها مؤمنة ﴾ رواه ابو دارد والنسائي.
- وەلەبەسەرهاتی مسوڵمانبوونی (ابو بکر الصدیق)[1] و (خالد بن سعید)[2] و (ابو ذر الغفاري)[3] و(طفیل بن عمرو الدوسي)[4] و (خالد بن الولید)[5] دا خوا لێیان ڕازی بێ‌و ڕازیشیان بکات، بەڵگەی سەلماندنی ئەو مەسەلەیە وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، چونکە هەرکام لەو زاتانە هەریەکە بەشێوەیەك ئەو وشە پیرۆزەیان دەربڕیوەو شایەتمانی‌یان هێناوەو بەمەش هاتوونەتە نێو بازنەی گەرمی ئاینی خواوەو حوکمی براهێنان‌و مسوڵمانبوونیان بۆ دراوە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەیەکێك لەدوو بەشەکانی شایەتمان بەس نیە بۆ هاتنە نێو ئیسلامەوە بەڵکو دەبێ هەردووکیان کۆ بکاتەوە، کەواتە ئەگەر لەهەندێك لەفەرموودان بەس ﴿ لاإلـه إلا اللـه ﴾ دیارکراوە ئەوە مەبەست پێ‌ی هەردووکیانە چونکە لەفەرموودەکانی دیکەدا ئەوە ڕوون‌کراوەتەوەو پێویستە (حمل) ی (مجمل) بۆسەر

---

(١) بڕوانە (السيرة النبوية) ی ئیبنو کەثیر، ل٤٣٢؛ (السيرة الحلبية)، ل٤٤٤.

(٢) بڕوانە (السيرة النبوية) ی ئیبنو کەثیر، ل٤٤٥.

(٣) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤٧، هەروەها: (صحيح البخاري مع فتح الباري)، ب٧، ل١٣٩.

(٤) بڕوانە (سيرة ابن هشام)، ل٤٠٧-٤٠٨.

(٥) بڕوانە (السيرة النبويه) ی ئیبنو کەثیر، ب٢، ل٥٢٠.

(منفصل) بکرێ.

هەروەها شتێکی گرنگو شایانی باسە کەلەنێو زانایاندا هیچ کێشەو جیاوازییەك لەسەر ئەوە نیە کەبەڕاستزانینو گۆ (تلفظ) کردنی شایەتمان نابێتە هۆی مسوڵمانبوونو ڕزگاربوونی لەمانەوەی بێبڕانەوە لەدۆزەخدا لەدوو حاڵەتاندا:

یەکەم:

ئەگەر هەڵوێستێکی دەروونی یان زمانی یان کرداری لەو کەسەدا هەست پێبکرێو بزانرێ کەشایەتمانی هێناوە، کەببێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هەردووك یان یەکێك لەبەشەکانی شایەتمان، بۆ وێنە ئەوکەسە بەبڕواداروو مسوڵمان حسێب ناکرێ کەدەڵێ ﴿ لاإله إلا الله محمد رسول الله ﴾ بەلام دان بەفەرزیەتی زەکاتو ڕۆژوو، یان حەرامیی زیناو سوودخۆری دانانێ، هەروەها هەر یاسایەکی دیکەی ئیسلام کەبەئاشکرا زانراوە (إنكار ماعلم من الدين بالضرورة).

وەئەو کەسە بەبڕوادار دانانرێ کەدەڵێت: دان بەپێغەمبەرایەتی (موحەممەد) دا دێنم، بەلام پێم وایە کەنایەت بووە بەگەلی عارەبەوە، یان بەرزۆگارێکی دیاری کراوەوە.

وەئەو کەسە بەمسوڵمان حسێب ناکرێ کەشایەتمان دێنێ بەلام بەشێوەیەك لێکی دەداتەوە کەدەبێتە هۆی بڕوا پێنەبوونی یەکتایی خوا یان هەندێك لەناوو سیفەتەکانی، یاخود شایەتمان دێنێ بەلام دان بەهەندێك یان ئایەتێك یان وشەیەکو پیتێکی قورئان ناهێنێ، چونکە (دانپێدانەهێنان) وەکەی بەڵگەیە لەسەر پووچیو ناڕاستیی (دان پێداهێنان) وەکەی!!

دووەم:

ئەگەر لەسەر ڕێبازو بیروباوەڕێکی دیکە بوو، چونکە لەو حاڵەتەدا پێویستە وێرای شایەتمانهێنان دەستبەرداری (براءة) ی خۆشی لەڕێبازو بیروباوەڕە پێشووەکەی ڕابگەیەنێ.

بۆیە هەندێك لەزانایانی ئیسلام لەم بارەوە بنچینە (قاعدە) یەکی گشتییان داناوە کەنێوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە: حوکم بەمسوڵمانبوونی ئەو جۆرە کەسانە ناکرێ، هەتا شایەتمانێك نەهێنن کەببێتە هۆی هاتنی نێو ئیسلامو هەڵوەشاندنەوەو فڕێدانی هەموو ئەو بیروڕا هەڵەو پووچانەی کەپێیانەوە ناسراون. کەواتە ئەگەر شایەتمان هێنانی بەتەنها بەس نەبوو بۆ ڕوونکردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەو حەقیقەتە ئەوە پێویستە وێرای شایەتمان ڕازهێنانو دەستبەرداریی خۆشی لەڕێبازو بیروبۆچوونەکانی دەربڕێ.

■ ■ ■

### بەندی چوارەم:

## پایەكانی بیروباوەڕ (أركان الإیمان)

لەدەقەكانی قورئانو سوننەتدا لەچەند شوێنێكدا باسی پایەو بنچینەكانی بیروباوەڕی ئیسلامی كراوە بۆ وێنە:

- ﴿ آمن الرسول بما أنزل إليه من ربه والمؤمنون كل آمن بالله وملائكته وكتبه ورسله ﴾ البقرة (٢٨٥).
- ﴿ ياأيها الذين آمنوا آمنوا بالله ورسوله والكتاب الذي نزل على رسوله والكتاب الذي أنزل من قبل ومن يكفر بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر فقد ضل ضلالا مبينا ﴾ النساء (١٣٦).
- ﴿ ليس البر أن تولوا وجوهكم قبل المشرق والمغرب ولكن البر من آمن بالله واليوم الآخر والملائكة والكتاب والنبيين ﴾ البقرة (١١٧).
- ڕەلەو فەرموودەیەدا كەجوبرائیل (علیە السلام) لەشێوەی عارەبێكی خێڵەكیدا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و دەربارەی ئیسلامو ئیمانو ئیحسان پرسیاری لێكرد، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیمان فەرمووی: ﴿ أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره ﴾ رواه مسلم عن عمر بن الخطاب وأخرج البخاري نحوه عن أبي هريرة رضي الله عنهما.
  كەواتە پلەو بنچینەكانی بیروباوەڕ ئەمانەن:

١. بڕوابوون بەخوا (سبحانە وتعالى).
٢. بڕوابوون بەفریشتەكانی خوا.
٣. بڕوابوون بەكتێبەكانی خوا.
٤. بڕوابوون بەپێغەمبەرەكانی خوا (علیهم السلام).
٥. بڕوابوون بەڕۆژی دوایی.
٦. بڕوابوون بەقەزاو قەدەری خوا.

دیارە هەركەسێكیش بڕوای بەیەكێك لەم شەشانە نەبێ لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرێو بەكافر دەژمێردرێ. ئینجا پێویستە ئەوەش بگوترێ كەئەو بڕواپێهێنانەش دەبێ بەو شێوەو چۆنیەتییە بێت كەدیاریكراوە بێ كەشەریعەتی ئیسلام ڕوونی كردۆتەوە ئەگەرنا ئیعتیباری پێناكرێ.

جابۆئەوەی ئەو شێوەو چۆنیەتی‌یە روون بێتەوەو بزانرێ، ئەوا بەکورتی دەربارەی هەرکام لەم شەش بنچینانەی بیروباوەری ئیسلامی دەدوێین:

## پایەی یەکەم: بڕوابوون بەخوا ( جل جلاله )

بڕوابوون بەخوا بەکورتی ئەوەیە کەقەناعەتی تەواوو دامەزراو لەدڵو عەقڵدا دروست بێ و زمان دان پێدابنێ کەبەس خودا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکەو، تەنیا ئەویش شایستەی پەرستن‌و بەندایەتی بۆ کردنە لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاکو کۆمەڵدا، وەبەس ئەو خاوەنی هەموو ناوێکی هەرەچاکو سیفەتی هەرە بەرزو تەواوەو لەهەموو لەکەو کەم‌وکوری‌یەك پاكو دوورەو لەهیچ روێکەوە وەك هیچ‌کام لەدروستکراوەکانی نیەو تاكو بێ‌وێنەو هاوتایە، ئینجا رەفتارکردن‌و هەڵوێست نواندنیش بەگوێرەی داخوازی‌ی ئەم جۆرە قەناعەت‌و پێ‌لێنانە.

بڕوا بەخوا بوون بەو شێوەو چۆنیەتی‌یە راست‌و دروستەی کەئیسلام دەڵێ نایەتە دی هەتا بەکتابی (توحید) و بێ‌وێنەیی خوا لەهەرسێك بوارەکانی پەروەردگاریەتی (الربوبیة) و پەرستراویتی (الألوهیة) و ناوو سیفەتەکانی (الأسماء والصفات) ی‌دا بەعەقڵ‌و دڵ‌و زمان‌و ئەندامەکان دانی پێدا نەهێنرێ‌و ئیسپات نەکرێ، مادام واش بێ پێویستە تیشکێك بخەینە سەر خوابەیەکگرتن لەهەرسێك بوارەکانی پەروەردگاریتی‌و پەرستراویتی‌و ناوو سیفەتەکاندا.

### أ - خوابەیەکگرتن لەپەروەردگاریتیدا (توحید في الربوبیة):

بەکورتی یانی: قەناعەت‌و دان پێداهێنانی تەواو لەسەر ئەوە کە بەس خوا بەدیهێنەرو خاوەن‌و پەروەردگاری هەموو شتێکە.

چونکی (رب) لەزمانی عارەبی‌دا واتە خاوەنی سەرورگێر (المالك المدبر)[1] کەلەکوردی‌دا وشەی پەروەردگاری بۆ دانراوە، چونکە مەعنای خاوەنایەتی‌و پەروەردەو بەخێوکردن‌و سەروورگیران دەگرێتە خۆی، کەواتە بڕوابوون بەیەکتابی خوا لە پەروەردگاریتی‌دا یانی بڕوابوون بەوە کەبەس خوا (سبحانه وتعالى) بەدیهێنەری دروستکراوەکان‌و خاوەن‌و سەروورگێرو کارسازو ژیێنەرو مرێنەرو سوودپێ‌گەیێنەرو زیان‌لێ‌دەرو بەدەنگەوە هاتووە لەکاتی پاڕانەوەیاندا و دەست‌رۆیشتووە بەسەریاندا.

---

(١) بڕوانە (المصباح المنیر).

بەکورتی : ژیان‌و مردن‌و بوون‌و نەبوون‌و هەموو شتێکیان بەدەست ئەوەو جگە لەوی هیچ کەسی دیکە لەبوونەوەرو ژیانی ئینساندا چ کارە نیەو نەهیچە نەهیچیشی بەدەستەو لەدەست دێ.

خوای بەرزو بێوێنە لەزۆر جێگای قورئاندا پەروەردگاریتی خۆی راگەیاندووە، بۆ وێنە: ﴿ إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض وما بينهما في ستة أيام ثم استوى على العرش يغشي الليل النهار يطلبه حثيثا والشمس والقمر والنجوم مسخرات بامره ألا له الخلق والأمر تبارك الله رب العالمين ﴾ الأعراف (٥٤).

جادیارە هەرکەسێك ئاوا بڕوای بەپەروەردگاریەتی خوا نەبێ، ئاوا یەکتایی بۆ بڕیار نەدا، پەروەردگاریتی لەوەدا کورت هەڵنەهێنێ، مانای وایە دانی بەیەکتایی خوا لەپەروەردگاریتی‌دا نەهێناوەو جاری هەر لەدەرەوەی خانەی ئیسلامە.

ئینجا وانەبێ بەس بەبڕوا هێنان بەیەکتایی خوا لەپەروەردگاریتی‌دا کاری بڕواهێنان‌و موسڵمانەتی تەواوبێ، بەڵکو ئەم بەشەی بڕواو خواناسی‌یە تەنها کاتێك بۆ ئینسان جێی سوودر کەڵکەو دادی دەدات کەبەشی دووەم‌و سێیەمی بڕوابوون بەخوایەتی‌و یەکتایی خوای لەگەڵ دابێ ئەگەرنا بەتەنها هیچ ئیعتیبارێکی پێناکرێ، هەربۆیەش خوای دادگەر ئەو هاوبەش‌پەیداکەرو بت‌پەرستانەی کە لافی بڕوا بەخوا بوونیان لێ‌دەدار دانیان بەبەدیهێنەرایەتی‌و پەروەردگاریتی خوادا دێنا بەڵام وەك شایستەی خوایە نەیاندەپەرست‌و هاوبەشیان بۆ پەیدا دەکرد، بەکافرو لارێ‌و سەرگەردانی لەقەڵەم داون، بۆ وێنە: ﴿ ومايؤمن أكثرهم بالله إلا وهم مشركون ﴾ يوسف (١٠٦)، وەفەرموویەتی: ﴿ ولئن سالتهم من خلقهم ليقولن الله فاني يؤفكون ﴾ الزخرف (٨٧) یان ﴿ ولئن سالتهم من خلق السموات والأرض ليقولن خلقهن العزيز العليم ﴾ الزخرف (٩).

## ب - یەکتایی خوا لەپەرستراویتی ( الألوهية ) ی دا:

بەکورتی یانی: دامەزراندن‌و داڕێژاندنی پتەور بێگرێ کەبەس خوای بەرزو مەزن‌و بێوێنە پەرستراوی راستەقینەیەو، سەلماندن‌و ئیسپات‌کردنی ئەمەش بەکردەوە.

چونکە وشەی (إله) کەلەسەر کێشی (فعال) ە بەمەعنای (مألوه) واتە پەرستراو (معبود) دێ، وەك (کتاب ـ مکتوب)،[1]، (عبادة) یش لەزمانی عەرەبی‌دا یانی گەردن‌کەچی‌و خۆ بەکەم‌زانین‌و فەرمانبەری[2]، هەندێك لەزانایانیش فەرموویانە (عبادة) یانی: ئەوپەڕی خۆشەویستی لەگەڵ تەواوی مل‌کەچی‌دا[3].

کەواتە: یەکتایی خوا لەپەرستراوێتی (توحيد الله في الألوهية) دا ئەوەیە کەئینسان

---

(١) بڕوانە (المصباح المنير).

(٢) بڕوانە (أساس البلاغة)ی زەمەخشەری‌و (المصباح المنير).

(٣) بڕوانە (شرح قصيدة ابن القيم)، ب٢، ل٢٥٩؛ هەروەها (إغاثة اللهفان)، ب٢، ل١٢٨-١٢٩.

بەس بەندەو ملکەچی خوا بێو دەرو دەروون (ظاهر وباطن) ی بۆ خوا یەکلا بێتەوە، بەس ئەو بپەرستێو خۆشەویستیو ترسو سامو هیوار ئومێد بۆ خوا ساغبکاتەوەر، تەنها لەو بپارێتەوەو جگە لەو پشت بەکەس نەبەستێو تەنها ملکەچو زەلیلی ئەو بێو لەبەرنامەو پەیڕەوی وی بەولاوە پابەندو گوێڕایەڵی چی دی نەبێ.

شایەنی باسکردنیشە کەقبووڵکردنی یەکتایی خوا لەپەرستراوێتیدا هەردووك بەشەکەی دیکەی خوا بەیەکگرتن (توحید) ی تێدا دێتە دی، چونکە بەس زاتێك بەو شێوەیە کەگوترا دەپەرسترێو بەندایەتی بۆ دەکرێ کەبەس ئەو سیفەتی پەروەردگاریتی هەبێو خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی چاكو پەسندیش بێ.

کەواتە (لاإله إلا الله) هەرسێك بەشەکانی خوا بەیەکگرتنی خوای تێدا کۆدەبێتەوە، هەر بۆیەش کراوە بەکلیلی کردنەوەی دەرگای ئیسلام لەدنیادار بەهەشت لەدوارۆژدا.

خوای بێوێنەو هاوتاش لەگەلێك جێگای قورئانیدا باسی ئەو جۆرە خوابەیەکگرتنەی خۆی کردووە، بۆ وێنە:

- ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦).
- ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه انه لا إله إلا أنا فاعبدون ﴾ الأنبياء (٢٥).
- ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾ النمل (٦).

لەمەوە کەڕابرد زانرا کەبڕوابوون بەیەکتایی خوا لەپەرستراوێتیدا وا لەئینسان دەکات کەدڵو زمانو ئەندامەکانی بەس زەلیلو گەردن کەچی خوابن بەم شێوەیە:

بەو جۆرە کەخوای خۆش دەوێو لێی دەترسێو پشتی پێدەبەستێو ئومێدی پێیەتی هیچ کەسو هیچ شتێك نەبێتە جێگای خۆشویستنو ترسو پشتپێبەستنو ئومێدی کە ئەمانە هەموویان پەیوەندییان بەدڵو دەروونەوە هەیە، واتە (العبادات القلبية) ن.

وەپاڕانەوەو داوای لێبووردن کردنو شت لەخۆگرتن (نذر) و سوێند پێخواردنی بەس بۆ خوا بێ، کەئەمانەش پەیوەندییان بەزمانەوە هەیە، واتە ( العبادات القولية) ن.

وەنوێژو ڕکوعو کڕنووش بردنو ڕۆژوو و شت سەر بڕینو طەوافی تەنها بۆ خوا بێ کە ئەمانەش پەیوەندییان بەئەندامەکانەوە هەیەو پێیان دەگوترێ (العبادات البدنية).

بەڵام بێگومان هەموو ئەوانەی گوتران زیاتر پەیوەندییان بەلایەنی ڕووحیو شەخصیی ئینسانەوە هەیەو ئینسانیش نابێتە یەکتاپەرست (موحّد) و بڕوادار هەتا لەهەموو بوارە ڕووحیو فیکریو سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی ژیانیدا بەندەو پەرستاری خواو پابەندی بەرنامەکەی نەبێ، هەر بۆیەش خوای زاناو ووردبین فەرموویەتی: ﴿ إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لايعلمون ﴾ يوسف (٤٠).

وەهەر بۆیەش هەر کەسێك لەهەر لایەنێکی ژیانی تاکیو کۆمەڵیدا پەنابەرێتە بەر غەیری بەرنامەی خوای پەروەردگار بەهاوبەشپەرست (مشرك) ی حسێب کردووە: ﴿ أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله ﴾ الشورى (٢١).

## ج - یەکتایی خوا لەناوو سیفەتەکانی دا:

ئەمیش بەکورتی یانی: دڵ دامەزرانو دانپێداهێنانی تەواو بەوە کەبەس خوا (سبحانه وتعالی) خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزو تەواوەکانەو، لەهەموو هەڵەو پەڵەیەك دوورە، وەئیسپاتکردنی ئەمەش بەکردار.

ئەمیش بەوە دەبێ کەهەر ناوو سیفەتێك خوا بۆخۆی دیاری کرد یان پێغەمبەر ﷺ دانی پێدا هێنابێ‌و لەقورئانو سوننەتدا هاتبێ، بۆخوا بڕیار بدرێ بەبێ (تحریف وتعطیل وتکییف وتشبیه) کەدوایی ڕوونیان دەکەینەوە.

لەو پێناسە کورتەی سەرەوەش وەردەگیرێ کەیەکتایی خوا لەناوو سیفەتەکانیدا لەسەر سێ بنچینان دادەمەزرێ، کەئەگەر بێت‌و ئینسان بڕوای بەهەرکام لەو سێ بنچینانە نەبێ بەیەکتاپەرست دانانرێ:

یەکەم: بەپاك گرتنی خوا لەهەموو لەکەو ناتەواوییەك‌و لەوێچوونی دروستکراوەکانی.
دووەم: بەڕاستدانانو دانپێداهێنانی هەموو ئەو ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنانەی خوا کەلەقورئانو سوننەتدا هاتوون بەبێ کەم‌و زیادو گۆڕین‌و دەستکاری.
سێیەم: بێهیوابوون لەپەیبردن بەچۆنیەتی ئەو ناوو سیفەتانە.

بەڵگەی بنچینەی یەکەم‌و سێیەمیش ئایەتی: ﴿ ولم يكن له كفوا أحد ﴾ و ڕستەی: ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ ە، چونکە بەپێی ئایەتی: ﴿ ولم يكن له كفوا أحد ﴾ هیچ کەس‌و هیچ شتێك هاوتاو وێنەی خوا نیە لەتەواوی‌و بێ‌لەکەیی‌دا هەم لەزاتی‌و هەم لەناوو سیفەتەکانی‌دا، وەبەپێی ڕستەی: ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ هیچ کەس کەس‌و هیچ شتێك هاوتاو وێنەی خوا نیە لەتەواوی‌و بێ‌لەکەیی‌دا هەم لەزاتی‌و هەم لەناوو سیفەتەکانی‌دا، وەبەپێی ڕستەی: ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ هیچ کەس‌و هیچ شتێك وەك وی ناچێ لەهەموو ڕوویکەوە: زات، ناو، سیفەت... هتد.

وەبەڵگەی بنچینەی دووەمیش وێڕای ئەو هەموو ناوو سیفەتانەی کەلەقورئانو سوننەتدا بۆ خوا بڕیاردراون وەك: ﴿ وهو الغفور الرحيم، وهو العلي العظيم، وهو العليم الحكيم، ثم على العرش استوى ﴾ بەڵێ وێڕای ئەمانە ئەو ئایەتە کەدەفەرموێ: ﴿ ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها وذروا الذين يلحدون في اسمائه سيجزون ماكانوا يعملون ﴾ الأعراف (١٨٠).

پێغەمبەریش ﷺ لەرموویەتی: ﴿ إن لله تسعة وتسعون إسما مائة إلا واحدا من أحصاها دخل الجنة، إنه وتر يحب الوتر ﴾ اخرجه البخاري والنسائي والترمذي وابن ماجة.

شایانی باسیشە کەزانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەناوەکانی خوا لەو ژمارەیەدا

كورت هەڵنەهاتوون(١).

ئەوەش كەدەبێ ئینسانی موسڵمان وریابێ لەمەسەلەی ناوو سیفەتەكانی‌دا دووچاری هەڵە نەبێ ئەوەیە كەهەرگیز لە (تحریف وتعطیل وتشبیە وتكییف) دەربارەی ناوو سیفەتەكانی خوا رەفز بكات:

١. (تحریف) یش ئەوەیە كەعەینی وشەی ناوو سیفەتەكانی دەستكاری بكرێن بەكەم‌و زیادكردن یان سەرو بەرو ژێر گۆڕین، وەك ئەوە كەهەندێك لەوانە وبەتروویانە سیفەتی قسەكردن لەخوادا لابەرن ئایەتی: ﴿ وكلم اللهُ موسى تكليما ﴾ النساء (٦٤) یان ئاوا خوێندۆتەوە: ﴿ وكلم اللهَ موسى تكليما ﴾ واتە وشەی (الله) كەخۆی بۆر (ضمة) ی هەیە سەر(فتحة) یان بۆ داناوە.

یاخود وشەكان دەستكاری نەكرێن بەڵام بەشێوەك مەعنایان لێبدرێتەوە كە بێ‌نێوەرۆك بن، وەك ئەوانەی كەهەرگیز لە: (وجه، یدین، إستواء، نزول، غضب، رضی) بەجۆرێك (تاویل) دەكەن كەمەعنای ئەسڵی‌یان نامێنێ.

٢. (تعطیل / لەكارخستن) یش كە (تجرید / داڕووتان) یشی پێ‌دەڵێن بریتی‌یە لەلابردن‌و ئینكاركردنی ناوو سیفەتەكانی خوا بەگومانی خۆیان بۆ ئەوەی (تعدد قدماء) روونەدات، (جهم بن صفوان) دەمڕاستی ئەو تاقمەیە بوو لەرۆژگاری خۆیدا.

٣. (تشبیه / وێنچواندن) یش ئەوەیە كەزاتی خوا یان سیفەتەكانی یان یەكێك لەسیفەتەكانی وەك یەكێك لەدروستكراوەكانی بچوێنرێن، بۆ وێنە نەصرانی‌یەكان (عیسی) یان وەخوا دەچواندو جوولەكەكانیش (عوزەیر) و بت‌پەرستەكانیش بتەكانیان، یان ئەوانەی كە (وجه) ی خواو (ید) ی خواو (سمع وبصر) ی وەك شی دروستكراوەكان تەماشا دەكەن.

٤. (تكییف / دیاركردنی چۆنیەتی) یش ئەوەیە كەحەقیقەت‌و نێوەرۆكی ئەو ناوو سیفەتانەی خوا دیاری بكرێن‌و روون بكرێتەوە، كەبێگومان ئەمەش بەس لەسەر بنچینەی گومانێكی پووچ دەبێ، چونكە زات‌و ناوو سیفەتەكانی خوا هەمووی ﴿ ليس كمثله شيء ﴾ ن، مادام وابێ هەرچۆن (زاتی) خوا بۆ ئێمە نەزانراوە سیفەتەكانیش بەهەمان شێوە، كەواتە هەر قسەكردنێك لەو بارەوە جگە لەگومان‌و گۆترەكاری ﴿ رجما بالغيب ﴾ چیدی نیە.

---

(١) بڕوانە (فتح الباري)، ب١١، ل١٨٣، وە (صحيح مسلم بشرح النووي)، ب١٧، ل٥، وە (شرح العقيدة الطحاوية)، ل١٠٠، وە (الأسماء والصفات) ی بەیهەقی، ل٦.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەسیفەتەکانی خوا دوو جۆرن:

**یەکەم: سیفەتە زاتی‌یەکان:**

ئەوانەن کەلەزاتی خوا جیا نابنەوە، وەك: زانیاری، ژیان، ویست، توانا، دیتن، بیستن، ڕوو، قسەکردن، هەربوونی، هەمیشەیی، مەزنی، گەورەیی، بەرزی، بێ‌نیازی، بەزەیی، کاربەجێ‌یی...

**دووەم: سیفەتە کاری‌یەکان (الصفات الفعلية):**

ئەوانەش ئەوانەن کەپەیوەندی‌یان بەویست و توانای خوا هەیە، وەك: بەرزبوونەوە سەر عەرش، هاتنە خوارەوە بۆ ئاسمانی دنیا، پێکەنین، ڕازی‌بوون، خۆشویستن، ڕقلێ‌هەستان، شادی، تووڕەیی.

لەکۆتایی‌دا دەڵێم:

ئەم سێ جۆرە یەکتایی (توحيد) انەی خوا پەیوەنی‌یەکی پتەویان پێکەوە هەیە ،چونکە یەکتایی خوا لەپەروەردگاریتی‌دا، یەکتایی لەپەرستراوێتی‌دا داخواز دەکات و ئەمیش یەکتایی خوا لەناو سیفەتەکانی‌دا پێویست دەکات، هەرکەسێکیش نەختێك سەرنج بدات بەڕوونی لەم مەسەلەیە تێ‌دەگات.

## پایەی دووەم: بڕوابوون بەفریشتەکانی خوا

بەکورتی واتە: دڵ پڕ قەناعەت و دامەزراو بێ و زمان دانی پێدا بێنێ و کردەوەش ئیپاتی بکات، کەبابای بڕوادار دڵنیایە خوا جۆرە درووستکراوێکی هەن بەناوی فریشتە (الملائكة) لەڕووناکی درووست‌کراون و سەرپێچی لەفەرمانی خوا ناکەن و ئەو ئیش و کارانەی پێ‌ی سپاردوون جێ‌بەجێ‌یان دەکەن.

ئنجا بالەچەند خاڵێکی کورت‌دا چۆنیەتی بڕوابوون بەفریشتەکانی خوا ڕوون بکەینەوە:

**یەکەم:**

دەربارەی حەقیقەت و چی‌یەتی فریشتان هیچ لەقورئان و سوننەت‌دا نەهاتووە، ئەمەش یەکێکە لەتایبەتمەندی‌یەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی کەبەس لەسنووری پێویستی و بەرژەوەندی‌ی مرۆڤ لەژیانی دنیای‌دا پەردەی بۆ لەسەر ڕاستی‌یەکان هەڵدەداتەوە، دیارە بابای بڕواداریش یەکی لەسەر ئەوە نەکەوتووە کەکاکڵ و جەوهەری هەموو شتێك بزانێ ئەوجار بڕوا بێنێ چونکە ئەو لەلایەکەوە سنووری خۆی دەزانێ و لەلایەکی دیکەشەوە ئەو خوا پەروەردگارەی کەلەسەر بنچینەی عەقڵ و زانست و فیطرەت ناسیویەتی و لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت‌دا بڕوای پێ‌هێناوە، هەرشتێك لەوەوە بێ بەدڵ و بەگیان و بەقەناعەت و

دڵنیایی تەواوە وەری دەگریّ، چونکە (خوا) وای فەرمووە.

**دووەم:**

ئیمامی (مسلم) لە (عائشة) وە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کەپێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ خلقت الملائكة من نور- ﴾ رواه الإمام أحمد في المسند.

وەسەرجەمی دەقەکانی قورئان‌و سوننەت ئەوە دەگەیەنن کەفریشتەکان جەستەیەکی ماددی بەرهەستیان نیەو، خواردن‌و خواردنەوەو خەوو زاوزێو... هتدیشیان نیەو ئارەزووی ئەزەلانەو فروفێڵی شەیتانانەیان نیەو لەخراپەو هەڵەوپەڵە دوورن: ﴿ لايعصون الله ما أمرهم ويفعلون مايؤمرون ﴾ التحريم (٦).

وە باڵیان هەن بەژمارەی جیاواز: ﴿ جاعل الملائكة رسلا أولي أجنحة مثنى وثلاث ورباع- ﴾فاطر (١)، تەنانەت بوخاری‌و موسلیم لەعەبدوڵڵای کوری مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ جبریلی دیوە (٦٠٠) شەش سەد باڵی هەبووە.

وەلەدەقەکانی قورئان‌و سوننەت دەفامرێنەوە کەفریشتەکان دەتوانن بچنە سەر شێوەو بیچمی ئینسانان بەفەرمانی خوا، خوا (جل جلاله) فەرموویەتی: ﴿ واذكر في الكتاب مريم إذ انتبذت من أهلها مكانا شرقيا. فاتخذت من دونهم حجابا فارسلنا إليها روحنا فتمثل لها بشرا سويا ﴾ مريم (١٦-١٧).

**سێ یەم:**

پەیوەندییان بەخواوە، بریتییە لەپەیوەندیی بەندایەتی ساغ‌و بێ‌پەڵەو گەردن کەچی‌و فەرمانبەری تەواو، خوای مەزن لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وقالوا اتخذ الرحمن ولدا سبحانه بل عباد مكرمون لايسبقونه بالقول وهم بامره يعملون يعلم مابين أيديهم وماخلفهم ولايشفعون إلا لمن ارتضى وهم من خشيته مشفقون ﴾ الأنبياء (٢٦-٢٨).

**چوارەم:**

پەیوەندییان بەئینسان‌و بوونەوەرەوە، لەسەر بنچینەی بەندایەتی‌و فەرمانبەرییان بنیادنراوە، چونکە خوای کاربەجێ هەموو کاروبارەکانی بوونەوەرو زۆر لەکاروبارەکانی ژیانی ئینسانی بەفریشتان سپاردووە، هەرکارە بەجۆرو کۆمەڵێکیان، ئەمە بەئاشکرا لەدەقەکانی قورئان‌و سوننەتدا دەبینرێ، بۆ وێنە خوای مەزن دەربارەی چەند کۆمەڵێکیان فەرموویەتی: ﴿ والنازعات غرقا. والناشطات نشطا. والسابحات سبحا. فالسابقات سبقا. فالمدبرات أمرا ﴾ النازعات (١-٥)، ﴿ فالمقسمات أمرا ﴾ الذاريات (٤).

هەڵبەتە سەرپەرشتی‌کردنی کاروباری بوونەوەرو ئینسان لەلایەن فریشتانەوە لەگەڵ ئەوەدا تێک‌ناگیرێ کەبوونەوەرو ئینسانیش مەحکوومی چەند یاسایەکی ڕواڵەتی‌و

هەست پێکراویشن چونکە ئەم بوون (وجود) ە جگە لەم دیوە ڕواڵەتی و بەرهەستەی دیوێکی مەعنەوی و نابەرهەستیشی هەیە: ﴿ فلا أقسم بما تبصرون وما لاتبصرون ﴾ الحاقة (٣٩).

## پێنجەم:

ژمارەی فریشتەکانی خوا، بەس خوا پێی دەزانێ هەروەك لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وماجعلنا أصحاب النار إلا ملائكة وماجعلنا عدتهم إلا فتنة للذين كفروا- ومايعلم جنود ربك إلا هو- ﴾المدثر (٣١). پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ أطت السماء وحق لها أن تئط مافيها موضع أربع أصابع إلا وعليه ملك ساجد ﴾ رواه البخاري[1].

بەڵام ئەوانەی کە گەورەو ناودارن و زۆر پەیوەندیدارن بەئینسانەوە ئەمانەن:

١- جوبرائیل یان جبریل: کەسەرپەرشتی کەری گەیاندنی وەحی و پەیامی خوایە بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، خوا (جل جلاله) فەرموویەتی: ﴿ قل من كان عدوا لجبريل فإنه نزله على قلبك بإذن الله ﴾ البقرة (٩٧).

٢- میکائیل یان میکال: کەبەرێوەبەری ڕزق و ڕۆزی و بارانە، خوای مەزن لەبارەی ویشەوە فەرموویەتی: ﴿ من كان عدوا لله وملائكته ورسله وجبريل وميكال فإن الله عدو للكافرين ﴾ البقرة (٩٨).

٣- ئیسرافیل: کەفووکردن بەکەڕنادا (النفخ في الصور) ی پێ سپێرراوە[2]، کەبەفووی یەکەم هەموو دنیاو بوونەوەر تێك دەچێ و هیچ کەسی زیندوو نامێنێ و، بەفووی دووەم ئەو گیاندارانەی کەخوا بیەوێ زیندوو دەبنەوە.

٤- مالیك: کەسەرپەرشتی دۆزەخ دەکات، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ونادوا يامالك ليقض علينا ربك قال إنكم ماكثون ﴾ الزخرف (٧٧).

٥- (ملك الموت): کەگیان کێشانی گیانلەبەرانی پێ سپێرراوە، وەك خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿ قل يتوفاكم ملك الموت الذي وكل بكم ﴾ السجدة (١١)، کەلەهەندێك شوێنەواران (آثار) دا هاتووە کەناوی (عیزرائیل) ە.

## بەرهەمی بڕوابوون بەفریشتەکانی خوا لەژیانی ئینساندا:

١- بڕوابوون بەو زاتە پاك و بێ گەردو خێرخوازو نوورانییانە ئینسان دەخاتە بەر

---

(١) فتح الباري شرح صحيح البخاري: ب٦، ل٢٣٢.

(٢) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ إن إسرافيل إلتقم الصور وحنى جبهته ينتظر متى يؤمر لينفخ ﴾.

حوکمی ئەو مەدحەی کەخوا دەربارەی بەندە پارێزکارەکانی فەرموویەتی: ﴿ ذلك الکتاب لاریب فیه هدی للمتقین الذین یؤمنون بالغیب ﴾ البقرة(٢-١).

٢- بەهۆی بڕوایێ هێنانی فریشتەکانی خوا بەو شێوەیەی کەئیسلام دەڵێ، ئینسان دەپارێزرێ لەوەی کەدووچاری وەهم و گومان و بیری ئەفسانەیی ببێ دەربارەی ئەو زاتە نادیارو کاریگەرانە.

٣- ڕاوەستان و مانەوە لەسەر خەت و ڕێبازی خوا، چونکە کەسێك بەقەناعەت و بڕوای تەواوەوە هەست بکات بەچاودێری و بێداری ئەو سەربازانەی خواو، سوور بزانێ کەهەموو قسەو هەڵس و کەوتێکی تۆمار دەکەن و دەپارێزن و ڕۆژی دوایی شایەدی لەسەر دەدەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وإن علیکم لحافظین کراما کاتبین یعلمون ماتفعلون ﴾ الإنفطار (١٠-١٢). بەڵێ کەسێك ئاوا بزانێ شەرم لەخواو چاودێرە بەڕێزو خاوەن حورمەتەکانی دەکات کەبەپەنهانی یان بەئاشکرا بێفەرمانی بکات و خەتی خوار بکات.

٤- خۆڕاگری و دڵقایمی و پشوو درێژی و درێژەدان بەخەبات و ڕەنج دانی نەپسارە لەپێناوی خوادا و بێهیوانەبوون و هەست کردن بەپشت ئەستووری و دڵئارامی، چونکە بابای ڕێبواری شەکەت و ماندوو ئەگەر هەست بەتەنیایی و بێکەسی و بێهاوەڵی بکات زیاتر برشت و هێزی لێدەبڕێ و پەکی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر هەست بکات تەنیا نیەو هاوەڵی لەگەڵدان دڵی بەهێزتر دەبێ و هەڵدەبڕێتەوە. جائینسانی بڕواداریش دڵنیایە کەلانی کەم فریشتە پاك و بێگەردەکانی خوای هەر لەگەڵن و دوعای بۆ دەکەن و[1] دڵی بەهێز دەکەن و[2] دەیپارێزن[3]، ئەمەش دەبێتە مایەی دەمەزەردبوونەوەی دەمی کوڵبووی تیغی ئیرادەی و هەڵڕانەوەی.

کۆتایی ئەم باسەش بەم دووعاو پاڕانەوە بەکوڵ و گەرمەی فریشتە بەڕێزەکانی خوا دێنین بەتایبەتی هەڵگرانی عەرش و بارەگای خوا کەبۆ بڕواداران دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿ الذین یحملون العرش ومن حوله یسبحون بحمد ربهم ویؤمنون به ویستغفرون للذین آمنوا ربنا وسعت کل شئ رحمة وعلما فاغفر للذین تابوا واتبعوا سبیلك وقهم عذاب الجحیم ربنا وأدخلهم جنات عدن التي وعدتهم ومن صلح من آبائهم وأزواجهم وذریاتهم إنك أنت العزیز الحکیم وقهم السیآت ومن تق السیآت یومئذ فقد رحمته وذلك هو الفوز العظیم ﴾ غافر (٧-٩).

---

(١) وەك لەکۆتایی ئەم باسەدا دووعای هەڵگرانی عەرشی خوا بۆ بڕواداران دەنووسین.

(٢) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إذ یوحي ربك إلی الملائکة إني معکم فثبتوا الذین آمنوا ﴾ الأنفال (١٢).

(٣) خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ سواء منکم من أسر القول ومن جهر به ومن هو مستخف باللیل وسارب بالنهار له معقبات من بین یدیه ومن خلفه یحفظونه من أمر الله.. ﴾ الرعد (١٠-١١).

## پایەی سێیەم: بڕوابوون بەپێغەمبەرانی خوا
## (علیهم من الله الصلوات وأتم التسلیمات):

بەکورتی یانی: بڕوابوون بەوەی کەئەو پێغەمبەرانەی خوا لەقورئاندا ناوی بردوونو گەلێکی دیکەش کەناویان نەهاتووەو بێجگە لەخوا هیچ کەس ژمارەو ناویان نازانێ، خوا ناردوونیو ڕەوانەی مرۆڤایەتی کردوون تاکو پەیامو بەرنامەی خوا بۆ بەندەکانی رابگەیەننو تێیان بگەیەنن کەبۆچی درووست بوونو پێویستە چۆنو بۆچی بژینو ڕێگاو شێوەو چۆنیەتی بەندایەتی‌یان لێحاڵی بکەن. خوای میهرەبان لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ ولقد أرسلنا رسلا من قبلك منهم من قصصنا علیك ومنهم من لم نقصص علیك ﴾ غافر (٧٨).

ئێستاش لەچەند خاڵێکی کورتدا مەسەلەی بڕوابوون بەپێغەمبەران لەڕوانگەی ئیسلامەوە روون دەکەینەوە:

**یەکەم:**

ئەو پێغەمبەرانەی کەلەقورئانیدا ناویان هاتووە ئەم (٢٥) زاتەن: (ئادەم، نوح، ئیدریس، صالح، ئیبراهیم، هوود، لووط، یونس، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، ئەییوب، شوعەیب، مووسا، هاروون، ئەلیەسەع، ذولکیفل، داوود، زەکەریا، سولەیمان، ئیلیاس، یەحیا، عیسا، موحەممەد) صەلاتو سەلامی خوایان لێبێ.

هەرکەسێك بڕوای بەپێغەمبەرایەتی یەکێك لەم (٢٥) ە نەبێ کافر دەبێ، مەگەر لەبەر نەزانیو بێئاگایی عوزری هەبێ.

**دووەم:**

لە (مسند) ی ئیمام ئەحمەددا هاتووە کەژمارەی سەرجەمی پێغەمبەرانی خوا - صلى الله علیهم وسلم - (١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزارە، بەڵام بێگومان بێجگە لەو بیستو پێنجەی کەلەقورئان باسی کردوون درووست نیە پلەی پێغەمبەرایەتی پاڵدەینە لای هیچ کەسێکی دیکە مادام خواو پێغەمبەرەکەی هەواڵیان پێنەداوین.

**سێیەم:**

پێغەمبەرانی (أولوا العزم) بەپێی ڕای زۆربەی زانایان ئەم پێنجەن: (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، موحەممەد) - علیهم من الله افضل الصلوات واتم التسلیمات -. کەخوای بەرزو مەزن لەم ئایەتەدا ناوی هێناون: ﴿ شرع لكم من الدين ماوصى به نوحا والذي أوحينا إليك وماوصينا به إبراهيم وموسى وعيسى أن أقيموا الدين

ولاتتفرقوا فیه﴾ الشوری (١٣).

مەبەستیش لە (أولوا العزم) یانی خاوەنی عەزمو ئیرادەو توانایێکی گەورەو تایبەتی.

## چوارەم:

مەبەست لەناردنی هەموو پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم وسلم) ئەوە بووە کەخواپەرستی فێری ئینسانەکان بکەن و بەکردەوە پێشانیان بدەن وەبەرنامەی خوا لەواقیعی ژیانیاندا بچەسپێنن و بەڕێوەی بەرن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لاإله إلا أنا فاعبدون ﴾ الأنبیاء (٢٥)، وەفەرموویەتی: ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾ النحل (٣٦).

## پێنجەم:

ئەرکی سەرشانی ئینسانی بڕواداریش بەرانبەر بەپێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم وسلم) لەم چەند خاڵەدا کورت دەکەینەوە:

(أ) بەڕاستزانین و دڵنیابوونی تەواو لەقسەو پەیام و بەرنامەی هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاوازی خستنە نێوانیانەوە لەم ڕووەوە، چونکە هەر کەسێك بڕوا بەهەندێکیان بهێنێ و بەهەندێکیان نەهێنێ ئەوە بەدەقی قورئان کافرێکی نەگریسە: ﴿ إن الذين يكفرون بالله ورسله ويريدون أن يفرقوا بين الله ورسله ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا أولئك هم الكافرون حقا ﴾ النساء (١٥٠-١٥١).

(ب) وەدەبێ بڕوامان وابێ کەهەرکام لەو زاتە بەرزو بەڕێزانە کەخودا ڕەوانەی کردووە سپاردەی خۆی گەیاندووەو بەچاکترین شێوە پەیامی خواو بانگەوازی خۆی ڕاگەیاندووە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل وكان الله عزيزا حكيما ﴾ النساء (١٦٥).

(ج) وەپێویستە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریان بین و لەقسەیان دەرنەچین، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا من رسول إلا ليطاع بإذن الله ﴾ النساء (٨٤).

(د) وەدەبێ بڕوامان وابێ کەئەو بەڕێزو پایە بەرزانە چاکترین و تەواوترین و ڕاستترین و ڕەوشت بەرزترین ئینسان بوون، خوا ئیمتیازو تایبەتمەندی وای پێبەخشیون کە هیچ کەس تۆزی ڕێگاشیان ناشکێنێ، خوای کاربەجێشمان فەرموویەتی: ﴿ الله يصطفي من الملائكة رسلا ومن الناس ﴾ الحج (٧٥).

(هـ) وەپێویستە بڕوامان وابێ کەپێغەمبەرانی بەڕێزی خوا (علیهم الصلاة والسلام من الله تعالی) هەموویان ئینسانی پیاو بوونە، واتە فریشتە نەبوون ژن و هیچیشیان ئافرەت نەبوون، خوا فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا قبلك إلا رجالا نوحي إليهم فاسئلوا أهل الذكر إن كنتم لاتعلمون ﴾ الأنبیاء (٧).

(و) وەبڕوامان وابێ کەخوا هیچ خەسڵەتێکی جیای لەسرووشتی ئێسان پێنەبەخشیون وەك لەفەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا قبلك من المرسلين إلا إنهم ليأكلون الطعام ويمشون في الأسواق ﴾ الفرقان (٢٠).

(ز) وەپێویستە دڵنیابین لەوەی کەهیچ کامیان هیچ شتێکیان لەتایبەتمەندی‌یەکانی خوا نەبووە، خوای مەزن لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ قل لا أملك لنفسي نفعا ولا ضرا إلا ماشاء الله ولو كنت أعلم الغيب لاستكثرت من الخير وما مسني السوء إن أنا إلا نذير وبشير لقوم يؤمنون ﴾ الأعراف (١٨٨).

(ح) وەپێویستە بڕوامان بەوەبێ کەئەو مەردە هەڵبژاردانەی خودا لەهەرکەمو کوڕی‌و ناتەواوی‌یەك پارێزراو (معصوم) ن کەبێتە جێی گومانو دوودڵی لەدینداری‌و خواپەرستی‌یانو ڕاگەیاندنی پەیامو بەرنامەی خوا بەبەندەکانی، وەئەو پارێزران لەگوناحو هەڵەو پەڵەو پلەو ئیمتیازەی کەپێیان خەڵات‌کراوە لەخوو ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان حیکمەتەکەی ئەوەیە کەبتوانن وەك پێویست ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەنو پێشەوار چارساغی مرۆڤایەتی بن بەرەو بەندایەتی‌و مسوڵمانەتی‌و، نموونەی هەرە بەرزی بڕوای دامەزراوو خواپەرستی‌ی بێ‌خلەتو پاكو ڕەوشتی چاكو تێرو تەواوبن، خوای کاربەجێ‌و بەخشەر لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ أولئك الذين آتيناهم الكتاب والحكم والنبوة فإن يكفر بها هؤلاء فقد وكلنا بها قوما ليسوا بها بكافرين. أولئك الذين هدى الله فبهداهم اقتده ﴾ الأنعام (٨٩-٩٠).

(ط) وەپێویستە بڕوامان وابێ کەخوا هەرکام لەو زاتە بەرزو تەواوانەی بەهرەمەند کردووە لەموعجیزەو بەڵگەیەك کەخەڵك لەئاکاری‌دا دەستەوەستانو بێچارە بن، بۆ ئەوەی ڕاستی‌ی دەعوای خۆیانی پێ‌بسەلمێنن، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لقد أرسلنا رسلنا بالبينات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط ﴾ الحديد (٢٥).

(ی) وەپێویستە بڕوامان وابێ کەپێغەمبەرانی خوا لەئەسڵی پێغەمبەرایەتی (النبوة) و بنچینە سەرەکی‌یەکاندا یەکسانن‌و جیاوازی‌یان لەنێواندا نیە: ﴿ لانفرق بين أحد من رسله ﴾ البقرة (٢٨٥)، بەڵام وێڕای ئەوەش لەپلەوپایەو نێزیکی‌و ڕێزو حورمەتیان لەلای خوا بەرزو بەرزترو لەپێش‌و لەپاشتریان هەیە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ تلك الرسل فضلنا بعضهم على بعض ﴾ البقرة (٢٥٢).

**شەشەم:**

ئەمە دەربارەی پێغەمبەران (عليهم أفضل الصلواة وأتم التسليمات) بەگشتی، دەربارەی پێغەمبەری کۆتاییش (محمد) ﷺ لەسەر ئێمانی بڕوادار پێویستە:

(أ) بڕوامان وابێ کەپێغەمبەرمان (محمد) ﷺ گەورەترین ئێسانو سەروەری پێغەمبەرانە، هەندێك لەزانایانیش ڕستەی ﴿ ورفع بعضهم درجات ﴾ کەلەئایەتی: ﴿ تلك الرسل فضلنا بعضهم على بعض منهم من كلم الله ورفع بعضهم

درجات ﴾ دایە وایان لێك داوەتەوە كەمەبەست سەروەری مرۆڤایەتی (محمد)ە ﷺ[1] سەرەڕای ئەمەش فەرمودەی بێپێچ‌وپەنا لەو بارەوە زۆرن، بۆ وێنە: عن ابي هريرة رضي الله تعالى عنه ان رسول الله ﷺ قال: ﴿ أنا سيد ولد آدم يوم القيامة وأول من ينشق عن القبر وأول شافع وأول مشفع ﴾ رواه مسلم.

(ب) پێویستە بڕوامان وابێ كەموحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا ﷺ پێغەمبەرو ڕەوانەكراوی خوایەو چاكترین بەندەی خۆشەویست‌و هەڵبژاردەیەتی[2] چاوترووكانێك هاوبەشی بۆ خوا پەیدا نەكردووەو بتی نەپەرستووەو هیچ گوناحێكی گچكەو گەورەی نەكردووە.

(ج) وەبڕوامان دامەزراوبێ لەسەر ئەوە كەكۆتایی پێغەمبەرانە، چونكە ئەم ڕاستی‌یە لەقورئان‌و سوننەتدا بەئاشكرا ڕاگەیەنراوە، بۆ وێنە: ﴿ ماكان محمدا ابا أحد من رجالكم ولكن رسول الله وخاتم النبيين وكان الله بكل شئ عليما ﴾ الأحزاب (٤٠)، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ انا محمد وانا احمد وانا الماحي الذي يمحى بي الكفر وأنا الحاشر الذي يحشر الناس على عقبي وانا العاقب الذي ليس بعده نبي ﴾ متفق عليه واللفظ لمسلم، وەفەرموویەتی: ﴿ وأنا خاتم النبيين ولانبي بعدي ﴾ رواه مسلم.

(د) پێویستە بڕوامان وابێ كەجگە لەو زاتە بەرزە بۆمان نیە شوێن‌پێی هیچ كەسی دیكە هەڵبگرین‌و بیكەینە ڕابەرو چاوساغی بێ لام‌و جیم‌و بێ‌هەڵەوپەڵە، هەروەك خوا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة لمن كان يرجوا الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا ﴾ الأحزاب (٢١)، وەفەرموویەتی: ﴿ قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم ﴾ آل‌عمران (٣١).

(ﻫ) وەپێویستە بڕوامان بەوەبێ كەپێغەمبەری پێشەواو سەروەرمان بۆ تێكڕای ئینسان‌و جند نێرراوە، چونكە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين ﴾ الأنبياء (١٠٧)، دیسان هەر فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلناك إلا كافة للناس ﴾ سبا (٢٨).

دەربارەی جند (جن) یش خوا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وإذ صرفنا إليك نفرا من الجن يستمعون القرآن فلما حضروه قالوا أنصتوا فلما قضي ولوا إلى قومهم منذرين قالوا ياقومنا إنا سمعنا كتابا أنزل من بعد موسى مصدقا لما بين يديه يهدي إلى الحق وإلى طريق مستقيم ياقومنا أجيبوا داعي الله وآمنوا به يغفر لكم من ذنوبكم ويجركم من عذاب أليم ﴾ الأحقاف (٢٩-٣١).

---

(١) بڕوانە تەفسیری (جامع البيان) ی ئیبنو جەریری طەبەری، ب٥، ل٣٧٨.

(٢) چونكە بەرزترین پلەی خۆشەویستی بریتی‌یە لەخەلیلایەتی (الخلة)، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لو كنت متخذا خليلا لاتخذت ابا بكر خليلا ولكنه أخي وصاحبي، وقد اتخذ الله عز وجل صاحبكم خليلا ﴾ رواه مسلم.

(و) وەپێویستە لەخۆمانو باب و دایكو ماڵو خێزانمان خۆشترمان بوێ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه من والده وولده والناس أجمعین ﴾ متفق علیه.

(ز) وەپێویستە بڕوامان بەوەبێ کە خوا (عز وجل) چەندان موعجیزەو بەڵگەی وای پێ بەخشیوە کەسەدا سەد بەڵگەن لەسەر ڕاستیو تەواوی خۆیو پەیامو بەرنامەکەی، وەقورئانی بەرزو بەرێز گەورەترینو درەوشاوەترین موعجیزەو بەڵگەیەتی کەهەموو خەڵکی دنیا لەجنەو مرۆڤەوە لەئاکاریدا دەستەوەستان بوو وئەو دەمو گچکەترین سوورەتی ویشیان پێ نەهاتووەو نایەت وەك خوای دەسەڵاتدار فەرموویەتی: ﴿ وإن کنتم في ریب مما نزلنا علی عبدنا فاتوا بسورة من مثله وادعوا شهداءکم من دون الله إن کنتم صادقین. فإن لم تفعلوا ولن تفعلوا فاتقوا النار التي وقودها الناس والحجارة اعدت للکافرین ﴾ البقرة (٢٢-٢٤).

(ح) وەدەبێ بڕوا بەهەموو ئەو موعجیزەو یاسادڕ (خوارق العادة) انه بکەین کەلەفەرموودە ڕاست (صحیح) ەکانی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوون وەك لەتبوونی مانگو سەلامکردنی بەرد لێیو ناڵەی درەخت (جذع) بۆلایو هەڵقوڵینی ئاو لەنیوان پەنجەکانی دەستیو، تێر بوونی خەڵکێکی زۆر بەخواردنێکی کەمو، شایەدیدانی مەڕی برژێنراو لەبەر دەمیو، سێبەر لەسەرکردنی هەور پێش بوونە پێغەمبەریو هەوڵدانی بۆ چەندین شتی نادیارو ڕودانیان بەو شێوەیە کە هەواڵی پێدراوەو وەڵام درانەوەی داواو پارانەوەی لەلایەن خواوەو وپارێزرانی لەکوژران بەدەستی ناحەزانیو... هتد.

(ط) وەپێویستە بڕوامان بەوەبێ کەخوا سبحانه وتعالی دەروودەروون (ظاهر وباطن) ی ئەو زاتەی بەشێوەیەك درووستکردووە کەلەوە چاکترو جوانترو تەواوتر نەبووەو نابێو بەدەردی شاعیری ناودار حەسانی کوڕی ثابت خوا لێی ڕازی بێ کەفەرموویەتی:

لولم یکن فیه آیات مبینة
کانت بدیهة تاتیك بالخبر.

واتە: ئەگەر هیچ بەڵگەو موعجیزە لەسەر ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی ئەو زاتە بەرزو بەرێزە نەبوونایە تەنها دیتنو چاوپێکەوتنی بەسبوو بۆ سەلماندنی ئەو مەسەلەیە.
وەوەك خوای پەروەردگار لەمەدحیدا فەرموویەتی: ﴿ وإنك لعلی خلق عظیم ﴾ ن (٤)، ئەو پێشەوا گەورەو ڕێندەو ڕەوشت بەرزو پەسندە خاوەنی ئاکارو ڕەوشتێك بووە کەبەپێوەر (مقیاس) ی خوای مەزن مەزن (عظیم)ە! چونکە هیچ کەس درۆیەکی لێ نەبیستووە نەپێش پێغەمبەرایەتی نەدوای ئەوەش ، وەئەگەر شتێکی وای لێ پشکوتبایە، ناحەزە داخ لەدڵەکانی بەهەموو توانایەکیان هەوڵی بڵاوکردنەویان دەدا، وەلەدرێژەی ژیانیدا کردەوەو ڕەفتارێکی دزێو ناڵۆزای لێ نەپشکوتۆتەوە وەتۆزقاڵێك ترسو دڵەراوکە زەفەری بەدڵی پڕ ئیمانو دامەزراوی نەبردووە لەناسكترینو دژوارترین کارەساتدا بۆ

ڕێنە لەکاتی کۆچ کردنی لەمەککەوە بۆمەدینەو لەجەنگی ئوحەدو ئەحزاب و حونەین دا، وەدڵی پڕبووە لەبەزەیی و پەرۆش و بەتەنگەوەبوون نەك بەس بۆ شوێنکەوتووانی بەڵکو بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، بەس نیە کەخوای پەروەردگار بەپەیکەری بەزەیی (رحمة) داناوە بۆ هەموو جیهانان؛ ﴿ وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين ﴾ الأنبياء (١٠٦).

دیــان لەبەخشندەیی و بەرچاوتێری و کەرەمدا هیچ کەس تۆزی ڕێگاشی نەشکاندووە، وەبەکجار دنیا بەکەم وەرگرو بەقەناعەت بووەو یەکجار سادەپۆش و سادەخۆرو سادەنشین بووە، وەلەوپەڕی زمان پاراوی و ڕەوانبێژیدا بووەو هەتا بڵێی چاوپۆش و دڵ گەورەو لێبووردەو میهرەبان بووەو مەگەر لەبەر خودا دەنا لەکەس تووڕە نەبووە، و زۆر خۆبەکەمگر بووە لەگەڵ برادەراندا، خاوەن ئەوپەڕی عیززەت و جوامێری و زەبری گرج وبڕیش بووە لەمەیدانی جەنگ و بەرەنگاریدا لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی ڕێی خوادا.

## پایەی چوارەم: بڕوابوون بەکتێبەکانی خوا

چوارەمین پایەو کۆڵەگەی بنەڕەتیی بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لەوەی کەبڕوامان دامەزراوو نەلەخشاوبێ بەوەی کەخوای زاناو کاربەجێ چەندین کتێبی ناردوونە خوار بۆ پێغەمبەران[1] و ڕەوانەکراوی خۆی (عليهم أفضل الصلوات وأتم التسليمات) کەناوی هەندێکیانی لەقورئانیدا بردووەو ناوی زۆربەشیانی نەهێناوە، ئەو کتێبانەش کەناویان لەقورئاندا هاتووە ئەمانەن:

١. تەورات (التوراة):

کەبۆ موسا (عليه السلام) نێرراوە، وەك خوای بەخشندەو میهرەبان فەرموویەتی:
﴿ إنا أنزلنا التوراة فيها هدى ونور ﴾ المائدة (٤٤).

٢. ئینجیل (الإنجيل):

بۆ عیسا (عليه السلام) نێرراوە، وەك خوای خاوەن لوتف و کەرەم فەرموویەتی:
﴿ وقفينا على آثارهم بعيسى ابن مريم مصدقا لما بين يديه من التوراة وآتيناه

---

(١) لەپێناسەکردنی (نبي) و (رسول) و جیاوازیی نێوانیاندا دوو ڕای سەرەکی لەلای زانایاندا هەن: یەکەمیان دەڵێ (نبي) هەرکەسێکە کەخوا وەحیی بۆ ناردووە، جائەگەر فەرمانی پێ کرابێ بەهەبری خۆی ڕایبگەیەنێ ئەوە وێڕای (نبي) بوون (رسول)یشە، ئەگەرنا هەر (نبي)ە بەم پێیەش هەموو (رسول)ێك (نبي)شە بەلام پێچەوانەوە نا. دووەمیشیان ئەوەیە کەدەڵێ (رسول) ئەوەیە کەبەرنامەیەکی سەربەخۆی بۆ هاتبێ بەلام (نبي) هەر ڕاگەیاندن و بەڕێوەبردنی بەرنامەی پێش خۆی پێ سپێرراوە. شایانی باسیشە کە (پێغەمبەر) لەزمانی کوردیدا بۆ هەردووکیان بەکاردێ، دەشگونجێ (پێغەمبەر) بۆ (نبي) بێ و (ڕەوانەکراو) بۆ (رسول).

الإنجیل فیه هدی ونور﴾ المائدة (٤٦).
٣- زەبوور (الزبور):

کەبۆ داوود (علیه السلام) هاتۆتە خوار وەك خوای بەرزوپاك فەرموویەتی: ﴿ وربك أعلم بمن في السموات ولقد فضلنا بعض النبیین علی بعض وآتینا داود زبورا﴾ الإسراء (٥٥).
٤- صوحوف (الصحف):

کەبۆ ئیبراهیمو موسا (علیهما الصلاة والسلام) هاتوون وەك خوای تاقو بێوێنە فەرموویەتی: ﴿ إن هذا لفي الصحف الأولی صحف إبراهیم وموسی﴾ الأعلی (١٨-١٩).

بەڵام ئەو کتێبانەی دیکە کەبۆ باقی ڕەوانەکراوەکانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) نێرراون ناویان نەهاتووە ئەوەندە هەیە خوای کاربەجێ پێیڕاگەیاندووین کەهەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێ کتێبو بەرنامەیەکی بۆ ناردووە وەك دەفەرموێ: ﴿ کان الناس أمة واحدة فبعث الله النبیین مبشرین ومنذرین وأنزل معهم الکتاب بالحق لیحکم بین الناس فیما اختلفوا فیه﴾ البقرة (٢١٣).

کەواتە پێویستە بڕوا بەهەموو ئەو کتێبو بەرنامانە بێنین کەخوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون بەڵام ناوی نەهێناون، بەڵام درووست نیە هیچ کتێبێك بدەینە پاڵ خودا جگە لەوانەی خوا خۆی پاڵی داونە لای خۆیو لەقورئاندا بەناو ناوی بردوون.

وەهەڵوێستی ئینسانی موسڵمان کەلەبیروباوەڕی ئیسلامییانەوە هەڵدەقوڵێ دەربارەی کتێبەکانی خوا ئەوەیە کەلەم خاڵانەدا کورتی دەکەینەوە:

**یەکەم:**

هەموو ئەو کتێبانەی کەخوا بۆ پێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆی ناردوونیە خوار هەقی تەواویان تێدا ڕاگەیانراوەو ڕووناکیو ڕێنمایی تێروتەسەلیان تێدابووەو بەرنامەو پەیڕەوی هەمەلایەنەی ژیانو گوزەرانی قۆناغە جیاجیاکانی کۆمەڵ بوو ن، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ لکل جعلنا منکم شرعة ومنهاجا﴾ المائدة (٤٨).

**دووەم:**

کاکڵو جەوهەری ئایین (دین) ی خوار ئەو کتێبو بەرنامانەی کەپەیتا پەیتا بۆ پێغەمبەرانی بەرێزی خۆی ناردوونە خوار لەدوو شتان کورت هەڵدێ: یەکەمیان بەندایەتی کردنی ڕاست بۆ خودا؛ دووەمیشیان ڕەفتارکردنی چاك لەگەڵ یەکتر، وەك (عبدالقادر) ی گەیلانی ڕەحمەتی خوای لێبێ فەرموویەتی: (الدین هو صدق مع الحق وخلق مع الخلق)، جابەندایەتی کردنی ڕاست لەیەکتاپەرستی (توحید) دا کورت دەبێتەوەو ڕەفتارپێکەوەکردنی چاکیش لە (دادگەری - عدالة) دا، هەربۆیەش خوای پەرستراوو دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إلیه أنه لاإله إلا أنا فاعبدون﴾ الأنبیاء (٢٥)، ئەمە سەبارەت بەیەکتاپەرستیو دەربارەی مەسەلەی دووەمیش فەرموویەتی: ﴿ لقد أرسلنا رسلنا بالبینات وأنزلنا معهم الکتاب

والمیزان لیقوم الناس بالقسط وأنزلنا الحدید فیه بأس شدید ومنافع للناس﴾ الحدید (٢٥).

**سێیەم:**

بەس قورئان بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی نێرراوەو ڕووی لەهەموو تیرەو گەلانی سەر زەوییە دەنا کتێبەکانی دیکەی خوا هەرکامێکیان تایبەتبووە بەتیرەو گەلو چاخو سەردەمێکی دیاریکراوەوە، هەربۆیەش خوای زاناوکاربەجێ ویستی وابووە کەقورئان لەهەرجۆرە دەستکاریو گۆڕانێك بپارێزێ چونکە ئەگەر واندبا بەڵگە (حجة) ی خوا بەسەر خەڵکەوە نەدەما، بەڵام کتێبەکانی دیکە لەسۆنگەی ئەوەوە کەبەس بۆ کۆمەڵگاو قۆناغێکی تایبەتی نێرراون بەپێویست نەزانراوە وەك قورئان بپارێزرێن، خوای بەرزو مەزن دەربارەی پاراستنی قورئان لەگۆڕینو دەست تێوەردان فەرموویەتی: ﴿إنا نحن نزلنا الذکر وإنا له لحافظون﴾ الحجر (٩)، دەربارەی سەرتاسەریو جیهانی بوونی ئەو کتێبە بەهێزو پێزو بەرزەش فەرموویەتی: ﴿إن هو إلا ذکر للعالمین لمن شاء منکم أن یستقیم﴾ التکویر (٢٧).

**چوارەم:**

هەرکام لەکتێبەکانی خوا بۆ ئەوە هاتوون کەژیانو گوزەرانی ئینسان بەجۆرێك ڕێك بخەن کەلەگەڵ ڕەزامەندیی خواو سرووشتی خۆیانو بوونەوەرو دەوروبەرو ڕەوتی ژیانیاندا بگونجێو هاوئاهەنگ بێو دەردو نەخۆشیو کێشەو گیروگرفتەکانیان چارە بکات، جالەبەرئەوەی هەموو کتێبەکان بێجگە لەقورئان، وەك پێشتر گوترا هەرکامێکیان بۆ هیدایەتدانو ڕێکخستنی ژیانی گەلو کۆمەڵێکی دیاریکراوو چارەسەریی دەردو گرفتەکانیان هاتوون، دیارە خوای میهرەبانو کاربەجێ بەس بەئەندازەی پێداویستیی ژیانو گوزەرانو بەڕێوەچوونی ئەو گەلو کۆمەڵانە ڕێنوونیو یاساکانی خۆی خستۆتە دووتوێی هەرکام لەو کتێبانەوە، ئەمەش بەئاشکرا لەسەرگوزشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا دەبینرێ کەلەقورئاندا گێڕراونەوە بەڵام لەبەرئەوەی قورئان بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیو سەرلەبەری تیرەو گەلانی دنیا هەتا ژیان لەسەر زەوی مابێ نێرراوە، ئەوەی تێدا ڕەچاوکراوە کەبتوانێ ژیانو گوزەرانی هەموو مرۆڤایەتی لەگشت قۆناغەکانیدا ڕێك بخاتو چارەسەری تەواوی کێشەو دەردو گیروگرفتەکانی بکات. بەڵێ قورئان کۆکەرەوەی هەموو یاساو ڕێنوونییەکانی خوایەو جەوهەرو کاکڵی تێکڕای کتێبو بەرنامەکانی پێش خۆی تێدایەو بەسەریشیانەوە چاودێرە بۆ ئەوەی ئەو هەقو ڕاستییەی کەتیاندا ماوەو ئەو هەڵەوپەڵەو ناهەقییەی کەتێکەڵیان کراوە لەیەکی جیا بکاتەوە، خوای بەبەزەییو بەخشندە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وأنزلنا إلیك الکتاب بالحق مصدقا لما بین یدیه من الکتاب ومهیمنا علیه فاحکم بینهم بما أنزل الله ولاتتبع أهواءهم عما جاءك من الحق لکل جعلنا منکم شرعة ومنهاجا﴾ المائدة (٤٨).

**پێنجەم:**

بەڵگەش لەسەر ئەوە کەجگە لەقورئان هەموو کتێبەکانی دیکە کەمەو زۆر گۆڕاون و دەستکاری کراون زۆرن، بۆ وێنە:

(أ) چەندین دەقی قورئان لەبارەوە، بۆ وێنە:

- ﴿ من الذين هادوا يحرفون الكلم عن مواضعه ﴾ النساء (٤٦).
- ﴿ ومن الذين قالوا إنا نصارى أخذنا ميثاقهم فنسوا حظا مما ذكروا به ﴾ المائدة (١٤).
- ﴿ وقالت اليهود عزيز ابن الله وقالت النصارى المسيح ابن الله ذلك قولهم بأفواههم يضاهئون قول الذين كفروا من قبل قاتلهم الله أنى يؤفكون ﴾ التوبة (٣٠).
- ﴿ أفتطمعون أن يؤمنوا لكم وقد كان فريق منهم يسمعون كلام الله ثم يحرفونه من بعد ماعقلوه وهم يعلمون ﴾ البقرة (٧٥).

(ب) جگە لەقورئان هیچ کام لەکتێبەکانی خوا نوسخە ئەسڵییەکەیان نەماوەو بەس تەرجەمەکانیان بەدەست خەڵکەوە ماون.

(ج) ئەو کتێبانە چەند شتێکی جۆراوجۆر لەلێکدانەوەو مێژوو و سەرگوزەشتەی پێغەمبەران و قوتابییەکانیان و هەڵهێنجراو (إستنباط)ی زانایانیان لەگەڵ ئاوێتە بووە، کەڤسەی خوا لەنێو ئینسان جیاناکرێتەوە.

(د) هیچ کام لەو کتێبانە سەنەدێکی مێژوویی متمانە پێکراوی نیە، هەتا دەگاتەوە سەر ئەو پێغەمبەرەی کەپاڵ دەدرێتە لای، بۆ وێنە ئەو (اسفار)ەی کەبە (العهد القديم) بەناوبانگەو بەحیساب (تەورات)ی خوایە بۆ مووسا، چەندین سەدە دوای مووسا (علیه السلام من الله) نووسراوەتەوە[1]، وەئەو چوار (ئینجیل)ەی کەئێستا بەدەست دیانەکانەوە هەن (مەتتی، یۆحەننا، لوقا، مرقس) لەنێو نزیکەی (٧٠) ئینجیلدا هەڵبژێرراون[2]!! دیارە خواش بەس باسی یەك ئینجیل دەکات کە بۆ عیسای ناردووە (صلی الله علیه وسلم).

(هـ) بەڵگەیەکی دیکەی زۆر بەهێز لەسەر گۆڕان و دەستکاری کرانی ئەو کتێبانە ئەوەیە کەچەندین تێروانین و بیرو بۆچوونی پووچ و بێمەعنایان تێ ئاخنراوە دەربارەی خوای بەرزو مەزن و پێغەمبەرانی پایەبەرزی، وەك وێچواندن (تشبیه)ی خوا بەئینسان و لەکەدارکردنی پێغەمبەران بەجۆرێك کەنەك هەر لەگەڵ پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی و پارێزراو (معصوم)بوونیاندا ناگونجێ، بگرە هەر لەئاستی موسڵمان و بڕوادارێکی سادەش

---

(١) بڕوانە: (العقائد الإسلامية)ی ندیم العلاج، ل٥٧.

(٢) بڕوانە: (العقائد الإسلامية)ی سید سابق، ل١٦٨.

ناوەشێتەوە[١].

کەواتە، کورتەی قسان ئەوەیە کەئێمە بڕوامان وایێ ئاقە کتێبێکی خوا کەساغ و بێخلتەیەو تەئانەت وشەیەکو پیتێکی نەگۆڕاوەو دەستکاریی نەکراوەو ناگۆڕدرێ و دەستکاریشی ناکرێ و پێویستە شوێنی بکەوین و بیکەینە تەرازوو وسەنگی مەحەکی هەڵسەنگاندن و ناسینی کتێبەکانی دیکەش تەنهاو تەنها قورئانی بەهێزو خاوەن ڕێزە، سەبارەت بەکتێبەکانی دیکەش بڕوامان بەئەسڵی ناردنیان هەیە، بەڵام بڕوا بەهیچ نێوەڕۆکێکیان ناکەین کەقورئان شایەدەی بۆنادات و لەگەڵی ناگونجێ، دیارە کەسێکیش قورئانی لەبەردەستدا بێ پێویستی بەهیچ کتێب و سەرچاوەیەکی دیکەی ئاسمانی و زەمینی ناکات بۆ وەرگرتنی نەخشەو بەرنامەی ژیان و گوزەرانی و چارەسەرکردنی دەردو گیروگرفتەکانی.

## پایەی پێنجەم: بڕوابوون بەڕۆژی دوایی:

بڕوابوون بەڕۆژی دوایی بەکورتی یانی بڕوابوون بەهەموو ئەو شتانەی کەخوا (عز وجل) وپێغەمبەرەکەی ﷺ لەقورئان و سوننەتدا هەواڵیان پێداوە لەوەی کەلەپاش مردن ڕوودەدات لەگۆڕەوشارو ئازارو نیعمەتی گۆڕو زیندووبوونەوەو کۆکردنەوە (البعث والحشر) و بەشکردنەوەی کارنامەکان و لێپرسینەوەو تەرازوو دانران و، حەوزی کەوثەرو، پردی سەرپشتی دۆزەخ و تکاکردن (شەفاعەت) و بەهەشت و دۆزەخ و هەرچی کەخوا بۆخەڵکی نێو هەرکامێکیان ئامادەکردووە.

ئێستاش بەرلەوەی بچینە سەر درێژەی چۆنیەتی بڕوابوون بەڕۆژی دوایی بەپێویستی دەزانم ئەم چەند تێبینی‌یە بخەینەڕوو:

١. قورئانی بەهێزو پێز دوای بڕوا بەخوا بوون لەهەموو پایەکانی دیکەی بیروباوەڕ زیاتر گرنگی‌ی بەمەسەلەی بڕوابوون بەڕۆژی دوایی داوە، بۆوێنە مەگەر چۆن دەنا هەرکاتێك باسی بڕوا بەخوابوون کرابێ باسی ڕۆژی دواییشی بەدوا داهاتووە، وەك:

- ﴿ ـمن آمن بالله واليوم الآخر وعمل صالحا فلهم أجرهم عند ربهم ولاخوف عليهم ولاهم يحزنون ﴾ البقرة (٦٢).
- ﴿ ذلك يوعظ به من كان منكم يؤمن بالله واليوم الآخر ﴾ البقرة (٢٣٢).
- ﴿ قاتلوا الذين لايؤمنون بالله واليوم الآخر ﴾ التوبة (٢٩).

دیسان مەگەر چۆن دەنا لاپەڕەیەکی قورئان نیە کەباسێك یان زیاتری دەربارەی ڕۆژی دوایی تێدا نەبێ بەجۆرەها شێواز.

---

(١) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو وهەمان لاپەڕە.

وەئەو هەموو ناوە زۆرو جۆراو جۆرانەی بۆ ڕۆژی دوایی دانراون بەڵگەو نیشانەی گرنگیی و گەورەیی ئەو ڕۆژەیە، وەك: (القیامة، الساعة، الآخرة، یوم الدین، یوم الحساب، یوم الفتح، یوم التلاق، یوم الجمع، یوم التغابن، یوم الخلود، یوم الخروج، یوم الحسرة، یوم التناد، الآزفة، الطامة، الصاخة، الحاقة، الغاشیة، القارعة. هتد).

٢. وەنگە هۆو حیکمەتی ئەو هەموو گرنگیی و بایەخپێدانەی قورئان بەڕۆژی دواییش ئەم شتانە بن:

(أ) کاریگەریی مەزنی بڕوابوون بەو ڕۆژە لەژیانی ئینساندا، هەر بۆیەش دەبینین هەموو چاکەکارییەك لەقورئانیدا گێڕراوەتەوە بۆ بڕوابوون بەو ڕۆژەو هەموو جۆرو شێوەکانی خراپەکاریی و نالەبارییش گێڕراوەتەوە بۆ بێبڕوابوون بەو ڕۆژە، بۆ وێنە: ﴿ أرأیت الذي یكذب بالدین فذلك الذي یدع الیتیم ﴾ الماعون (١-٢)؛ ﴿ بل یرید الإنسان لیفجر أمامه، یسال أیان یوم القیامة ﴾ القیامة (٦)؛ ﴿ إنما یعمر مساجد الله من آمن بالله والیوم الآخر ﴾ التوبة (١٨)؛ ﴿ لایستئذنك الذین لا یؤمنون بالله والیوم الآخر أن یجاهدوا بأموالهم وأنفسهم ﴾ التوبة (٤٥)؛ ﴿ لاتجد قوما یؤمنون بالله والیوم الآخر یوادون من حاد الله ورسوله ﴾ المجادلة (٢٢).

(ب) وەرەنگە حیکمەتی زۆر گرنگیی پێدران و باسکرانی ڕۆژی دوایی لەقورئاندا ئەوەبێ کەئینسان بەهۆی ژیان و گوزەران و ڕابواردنەکانی دنیا گەلێك جار هێزی کێشندەی زەوی و ئارەزووەکان کێشی دەکەن و بێئاگای دەکەن لەو حیکمەتە بەرزەی بۆی خوڵقێنراوەو لەو ئەرك و ئەمانەتە قورسەی کەپێی سپێرراوە بۆیە پێویستە جار لەدوای جار ئەو ڕۆژە مەزن و سەختەو کارەسات و دیمەنە بێڕەزار دڵبزوێن و مرۆڤ ڕاچڵەکێنەکانی وەبیر بخرێنەوە بەرچاوی، خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ یاأیها الذین آمنوا مالكم إذا قیل لكم انفروا في سبیل الله اثاقلتم إلی الأرض أرضیتم بالحیاة الدنیا من الآخرة فما متاع الحیاة الدنیا في الآخرة إلا قلیل ﴾ التوبة (٣٨).

٣. لەقورئانیدا مەسەلەی بڕوابوون بەڕۆژی دوایی واخراوەتەڕوو کەئەگەر ڕۆژێکی وانەبێ مانای وایە بوونەوەرو ژیان و ئینسان شتی پووچ و بێحیکمەت و بێ مەعنان، دیارە کاری پووچ و بێحیکمەتیش لەخوا ناوەشێتەوە، کەواتە بڕوابوون بەڕۆژی دوایی شتێکی پێویستە بۆ ئەوەی ئەم بوون (وجود)ە بەئینسان و ژیان و بوونەوەرو کائیناتەوە مەعنادار حیکمەتیان تێدا بێ و پووچ و ناماقووڵ دەرنەچن، ئەم ڕاستییەش لەگەلێك جێگای قورئاندا خراوەتەڕوو، بۆ وێنە:

- ﴿ وما خلقنا السماء والأرض وما بینهما باطلا ذلك ظن الذین كفروا فویل للذین كفروا من النار أم نجعل الذین آمنوا وعملوا الصالحات كالمفسدین في الأرض أم نجعل المتقین كالفجار ﴾ ص (٢٧).

- ﴿ وما خلقنا السماء والأرض ومابينهما لاعبين ﴾ الأنبياء (١٦).
- ﴿ أفحسبتم انما خلقناكم عبثا وإنكم إلينا لاترجعون فتعالى الله الملك الحق لا إله إلا هو رب العرش الكريم ﴾ المؤمنون (١١٥-١١٦).

کەواتە: بڕوابوون بەڕۆژی زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەو پاداشتو سزا هەم خواناسیو یەکتاپەرستی ڕاستەقینە داخوازیی دەکاتو پێویستی دەکات، چونکە خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو دیارە کە کاربەجێیی (حکیم)یش یەکێکە لەسیفەتە بەرزو پەسندەکانی، وەهەم پڕ وردکاریو ڕێکوپێکی بوونەوەرو ژیانو ئینسانیش وەك ئەنجامێکی مسۆگەری مەنتیقییانە بوونی ئەو ڕۆژە پەلکێش دەکات، وەهەم بڕوابوون بەقەدرو ڕێزو شەخسیەتی والأو بەرزی ئینسانیش پێویستی دەکات.

ئێستاش لەچەند خاڵێکدا چۆنیەتی بڕوابوون بەڕۆژی دوایی لەبیروباوەڕی ئیسلامیدا دەخەینەڕوو:

## یەکەم: گۆڕەشار (فتنة القبر) و پرسیاری دوو فریشتەکان:

دیارە مردن دوایین قۆناغی ژیانی دنیاو یەکەمین هەنگاوی بەرەو ژیانی بەرزەخو ڕۆژی دوایی چوونە، جامەسەلەیەك کەلەم یەکەمین هەنگاوەوە بۆ ئینسان دێتە پێشێو پێویستە بڕوامان پێی هەبێ، چونکە چەندین فەرموودەی ڕاستو جێی متمانە لەو بارەوە لەپێغەمبەر ﷺ گێڕراونەوە، بریتییە لەگۆڕەوشارو پرسیاری دوو فریشتەکان، بۆ وێنە: عن أسماء رضي الله عنها ان رسول الله ﷺ قال: ﴿ مامن شئ لم أكن أريته إلا رأيته في مقامي حتى الجنة والنار فاوحي إلي إنكم تفتنون في قبوركم مثل أو قريبا من فتنة المسيح الدجال، يقال ماعلمك بهذا الرجل؟ فاما المؤمن الموقن فيقول: هو محمد رسول الله جاءنا بالبينات والهدى فاجبنا واتبعنا هو محمد ثلاثة، فيقال: نم صالحا، قد علمنا ان كنت لموقنا به، وأما المنافق أو المرتاب فيقول لاأدري سمعت الناس يقولون شيئا فقلته ﴾ متفق عليه واللفظ للبخاري.

## دووەم: ئازو نیعمەتو ئازارو ئەشکەنجەی گۆڕ:

پاش گۆڕەوشارو پرسیاری دوو فریشتەکان پێویستە بڕوامان بەوەبێ کەپێغەمبەری ڕاستگۆمان هەواڵی پێداوە دەربارەی ئازو نیعمەتو ئازارو ئەشکەنجەی گۆڕ، بگرە ئایەتی ژمارە (٤٥-٤٦) لەسوورەتی (غافر) بەئاشکرا دەلالەت لەسەر ئەو مەسەلەیە دەکات: ﴿ فوقاه الله سيئات مامكروا وحاق بآل فرعون سوء العذاب النار يعرضون عليها غدوا وعشيا ويوم تقوم الساعة أدخلوا آلفرعون أشد العذاب ﴾ المؤمن (٤٥-٤٦).

وەك دەبینین خوای زانا دوو جۆرە ئەشکەنجەی دەربارەی فیرعەونییەکان باسکردووە: یەکەمیان: ﴿ وحاق بآل فرعون سوء العذاب النار يعرضون عليها غدوا وعشيا ﴾. دووەمیش: ﴿ ويوم تقوم الساعة ادخلوا آلفرعون أشد العذاب ﴾.

لەفەرموودەکانی پێشەواشمان بەس یەکێکیان بەوێنە دەهێنینەوە؛ عن ابن عباس رضي الله عنهما قال مر النبي ﷺ على قبرين فقال: ﴿ إنهما ليعذبان وما يعذبان في كبير ثم قال: بلى اما أحدهما فكان يسعى بالنميمة وأما الأخر فكان لايستتر من بوله ﴾ متفق عليه.

خاوەنی کتێبی (شرح العقيدة الطحاوية)ش دەربارەی ئەم مەسەلەیە چەند دێڕێکی جوانی نووسیون نەقڵ کردنیان بەپەسند دەزانم؛ (وقد تواترت الأخبار عن رسول الله ﷺ في ثبوت عذاب القبر ونعيمه لمن كان لذلك أهلا وسؤال الملكين فيجب اعتقاد ثبوت ذلك والإيمان به ولانتكلم في كيفيته، إذ ليس للعقل وقوف على كيفيته لكونه لاعهد له به في هذه الدار والشرع لايأتي بما تحيله العقول، ولكنه قد يأتي بما تحار به العقول، فان عود الروح إلى الجسد ليس على الوجه المعهود في الدنيا بل تعاد إليه الروح إليه إعادة غير الإعادة المألوفة في الدنيا، واعلم ان عذاب القبر هو عذاب البرزخ. فكل من مات فهو مستحق للعذاب ناله نصيبه منه قبر أو لم يقبر، أكلته السباع أو احترق حتى صار رمادا، أو نسف في الهواء، أو صلب، أو غرق في البحر، وصل إلى روحه وبدنه من العذاب مايصل إلى المقبور وما ورد من أجلاسه واختلاف أضلاعه ونحو ذلك، فيجب ان يفهم عن الرسول ﷺ مراده من غير غلو ولاتقصير، فلا يحمل كلامه مالايحتمله ولايقصر به عن مراده وما قصده من الهدى والبيان)[1].

## سێیەم: مەرج و نیشانەکانی هاتنی قیامەت (أشراط الساعة):

وەپێویستە بڕوامان بەوە دامەزراوبێ کەئەوکاتەی ئەو جیهانەی تێدا تێك دەچێ بێگومان دێ، بەڵام خوا لەهەموو کەس تەنانەت لەپێغەمبەرانی خۆیشی شاردۆتەوەو بێجگە لەخۆی هیچ کەس بەکاتەکەی نازانێ وەك خۆی فەرموویەتی؛ ﴿ يسئلونك عن الساعة أيان مرساها قل إنما علمها عند ربي لايجليها لوقتها الا هو ثقلت في السموات والأرض لاتاتيكم إلا بغتة يسئلونك كانك حفي عنها قل إنما علمها عند الله ولكن أكثر الناس لايعلمون ﴾ الأعراف (١٨٧).

بەڵام ئەوەندە هەیە کەهاتنی ئەو کارەساتە مەزن و بێ ڕەزایە چەند مەرج و نیشانەیەکی هەن کەلەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراونەوە پێویستە بڕوایان پێ بێنین. ئەو مەرج و نیشانانەش دوو جۆرن، جۆرێکیان گچکە گچکەن کەبەزۆری پەیوەندییان بەتێکچوون و بەرەو خراپەچوونی خەڵك و پەیدابوونی ئاژاوەو هەرا لەنێوانیاندا و دووركەوتنەوەیان لەعەبدایەتی خواو ڕێبازی پێغەمبەرانەوە هەیە، بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە ژمارەیەکی زۆری لەو نیشانانە تێدان؛ عن أبي هريرة رضي الله عنه ان رسول الله ﷺ قال: ﴿ لاتقوم الساعة حتى

(١) بڕوانە: (شرح العقيدة الطحاوية)، ل١٥١-١٥٢.

تقتتل فئتان عظيمتان يكون بينهما مقتلة عظيمة دعوتهما واحدة، وحتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كل يزعم أنه رسول الله، وحتى يقبض العلم، وتكثر الزلازل، ويتقارب الزمان وتظهر الفتن، ويكثر الهرج، وهو القتل، وحتى يكثر فيكم المال فيفيض، حتى يهم رب المال من يقبل صدقته، وحتى يعرضه فيقول الذي يعرضه عليه: لا ارب لي به، وحتى يتطاول الناس في البنيان، وحتى يمر الرجل بقبر الرجل فيقول: ياليتني مكانه، وحتى تطلع الشمس من مغربها فإذا طلعت ورآها الناس آمنوا أجمعون فذلك حين لاينفع نفسا إيمانها لو لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا ﴾ رواه البخاري.

بەلاَم جۆری دووەمی مەرج و نیشانەکانی هاتنی کاتی قیامەت گەورە گەورەن، بۆ وێنە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دە (١٠) دانە لەو نیشانە زلانەی تێدان: عن حذيفة بن أسيد الغفاري رضي الله عنه قال: اطلع النبي ﷺ علينا ونحن نتذاكر فقال: ﴿ ما تذاكرون؟ ﴾ قالوا: نذكر الساعة. قال: ﴿ انها لن تقوم حتى تروا قبلها عشر آيات، فذكر: الدخان، والدابة وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى بن مريم ﷺ، ويأجوج ومأجوج، وثلاث خسوف: خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس إلى محشرهم ﴾ رواه مسلم.

## چوارەم: سەرەتای هاتنی ڕۆژی دوایی:

لەژمارەیەك لەسوورەتەکانی قورئاندا بەتایبەتیش لەسوورەتەکانی (التكوير) و (الإنفطار)دا دەردەکەوێ کەکۆتایی قۆناغی ژیانی دنیاو سەرەتای دەستپێکردنی ڕۆژی دوایی بەگۆڕانکاریەکی گشتیو هەمەلایەنە لەهەموو بوونەوەرێکدا دێتە دی، ئاسمان شەق دەبێو ئەستێرەکان هەڵدەوەرنو خۆرەکەکان پێکدا دەدرێنو زەویو شاخەکان وردوخاش دەبنو شاخەکان وەك خوریی پەرەکراو پشکنراوەیان لێدێو دەریاکان دەتەقنەوەو گڕ دەگرنو سەر زەوی دەبێتە دەشتێکی کاکی بەکاکیی سپیو تەختو لووس. بەکورتی نەزەدیو نەبوونەوەری یانو پڕ هیچیان بەسەر هیچەوە نامێنێو دەگۆڕێن: ﴿ يوم تبدل الأرض غير الأرض والسموات وبرزوا لله الواحد القهار ﴾ إبراهيم (٤٨).

ئەمەش هەمووی لەدوای فووی یەکەمی (ئیسرافیل) دەبێ کەبەفەرمانی خوا بەکەڕنای دادەکات: ﴿ ونفخ في الصور فصعق من في السموات ومن في الأرض إلا من شاء الله ﴾ الزمر (٦٨)، وەخوای دەسەلاّتدار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ فإذا نفخ في الصور نفخة واحدة وحملت الأرض والجبال فدكتا دكة واحدة فيومئذ وقعت الواقعة وانشقت السماء فهي يومئذ واهية ﴾ الحاقة (١٣-١٦).

## پێنجەم: زیندووبوونەوە ( البعث ):

وەپێویستە بڕوامان وابێ کەخوای بەتوانا پاشان فەرمان بە ئیسرافیل دەکات کەفووی

دووەم بەکەڕەنادا بکات، کەدەبێتە هۆی زیندووبوونەوەی مردووانو هاتنە دەری خەڵك لەگۆڕەکانیان وەك خوای بەرزو مەزن لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ ثم نفخ فیه اخرى فإذا هم قیام ینظرون ﴾ الزمر (٦٨).

ئینجا لەو کاتەشدایە کەدەغەڵو بێبڕوایەکان بەسەرسامییەوە دەپرسن: ﴿ من بعثنا من مرقدنا؟ ﴾، بڕوادارانیش بەبەرچاو ڕوونیو دڵنیاییەوە دەڵێن: ﴿ هذا ماوعد الرحمن وصدق المرسلون! ﴾ یس (٥٢).

## شەشەم: کۆکردنەوە ( الحشر ):

وەدەبێ بڕوامان وابێ کەپاش زیندووبوونەوەو هاتنەدەر لەگۆڕەکان بەفەرمانی خوا تێکرای خەڵکی لەشوێنێکی تایبەتیو تەرخانکراو کۆدەکرێنەوە بەمەبەستی لێپرسینەوەو دیاری کردنی سزاو پاداشتی پڕبەپێست. خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ یوم نحشر المتقین إلى الرحمن وفدا ونسوق المجرمین إلى جهنم وردا ﴾ مریم (٨٦.٨٥)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ یومئذ یصدر الناس أشتاتا لیروا أعمالهم ﴾ الزلزال (٦)، دیسان فەرموویەتی: ﴿ یوم ینفخ في الصور فتاتون أفواجا ﴾ النبأ (١٨).

پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە: عن عائشة رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله ﷺ یقول: ﴿ یحشر الناس یوم القیامة حفاة عراة غرلا، قلت یارسول الله ینظر بعضهم إلى بعض؟ قال ﷺ: یاعائشة الأمر أشد من أن ینظر بعضهم إلى بعض ﴾ رواه البخاري ومسلم.

## حەوتەم: ڕانوێنران و لێپرسینەوە ( العرض والحساب ):

ڕەپێویستە بڕوامان وابێ کەدوای کۆبوونەوەی بەندەکان لەو شوێنە تەرخانکراوەدا، یەك یەکی ئینسانەکان ڕادەنوێنرێنو لیستەی کردەوەکانی خۆیانیان دەدرێتە دەستو هەرکەسەو کارنامەکەی خۆی دەخوێنێتەوە، جاهەرکەسێك بەدەستی ڕاستی ئەو کارنامەیەی خۆی وەربگرێتەوە ئەوە لێپرسینەوەیەکی سووكو سادەی لەگەڵ دەکرێو ڕزگاری دەبێ، بەڵام ئەوانەی لەپشتەوەدا یان بەدەستە چەپیان وەری دەگرنەوە ئەوانە دووچاری سزاو ئەشکەنجە دەبێ. دەقی قورئانو سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

- ﴿ یومئذ تعرضون لاتخفى منكم خافیة ﴾ الحاقة (١٨).
- ﴿ وعرضوا على ربك صفا لقد جئتمونا كما خلقناكم أول مرة بل زعمتم أن لن نجعل لكم موعدا ﴾ الكهف (٤٨).
- ﴿ فاما من أوتي كتابه بیمینه فسوف یحاسب حسابا یسیرا وینقلب إلى اهله مسرورا واما من اوتي كتابه وراء ظهره فسوف یدعوا ثبورا ویصلى سعیرا ﴾ الإنشقاق (٧-١٢).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لاتزول قدما عبد حتى یسال عن عمره فیم

افناه، وعن علمه فیم فعل فیه، وعن ماله من این اکتسبه وفیم انفقه، وعن جسمه فیم أبلاه ﴾ اخرجه الترمذي وقال حسن صحیح.

وەلەچەندین فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا هاتووە کەکۆمەڵێك لەئوممەتی (محمد ﷺ ) خوای پەروەردگار بەبێ لێپرسینەوە دەیانباتە بەهەشتێ، بۆوێنە: عن ابي هریرة رضي الله عنه ان النبي ﷺ قال: ﴿ یدخل من أمتي الجنة سبعون ألفا بغیر حساب ﴾ رواه مسلم.

## هەشتەم: دانانی تەرازوو و کێشرانی کردەوەکان و دیاریکردنی سزاو پاداشت:

وەپێویستە بڕوامان وابێ کەپاش ڕانوێرانو لێپرسینەوە ئینجا تەرازووی دادگەری خوا دادەندرێو کردەوەی بەندەکانی پێدەکێشرێن، جاهەرکەسێ چاکەکانی زیاترو تای تەرازووی چاکەکانی قورسترببێ ئەوە بەهەشتییەو، ئەوانەش کەخراپەیان زیاتر بێو تەرازووی خراپەکانیان قورستربێ بەرەو دۆزەخ پاڵدەتر دەدرێن، دەقی قورئانو سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن، بۆوێنە:

- ﴿ ونضع الموازین القسط لیوم القیامة فلا تظلم نفس شیئا وإن کان مثقال حبة من خردل أتینا بها وکفی بنا حاسبین ﴾ الأنبیاء (٤٧).
- ﴿ فاما من ثقلت موازینه فهو في عیشة راضیة وأما من خفت موازینه فامه هاویة وما ادراك ماهیة نار حامیة ﴾ القارعة (٦-١١).

(إبن القیم) لە (القصیدة النبویة)دا لەو بارەوە فەرموویەتی:

إنما تصدق ان أعمال العباد تحط یوم العرض في المیزان
وکذلك تثقل تارة وتخف أخری ذاك في القرآن ذو تبیان
وله لسان کفتان تقیمه والکفتان إلیه ناظرتان
ماذاك أمرا معنویا بل المحسوس حقا عند ذي الإیمان

ئنجا سەرەڕای ئووسرانی کردەوان لەلایەن فریشتە بەڕێزەکانی خوارە لەلیستەی تایبەتیدا بۆ هەرکەسێکو هەڵسەنگێنرانی کردەوەکان بەتەرازووی ووردو دادگەرانەی خوا ئەندامەکانی جەستەی هەرکەسێکیش (دەستو لاقو پێستو...هتد) شایەدی لەسەر دەدەن بۆ ئەوەی هیچ بروبیانووی بەدەستەوە نەمێنێ، خوای دادگەر لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ ویوم یحشر اعداء الله إلی النار فهم یوزعون حتی إذا ماجاءوها شهد علیهم سمعهم وأبصارهم وجلودهم بما کانوا یعملون وقالوا لجلودهم لم شهدتم علینا قالوا أنطقنا الله الذي أنطق کل شيء ﴾ فصلت (١٩-٢١).

بەڵکو تەنانەت ئەو پارچە زەوییانەش کەخراپەو تاوانەکانیان لەسەرکراون لەو ڕۆژەدا دەنگ‌وباسی خۆیان ڕادەگەیەنن‌و شایەدی خۆیان دەدەن: ﴿ عن أبي هریرة رضي الله

عنه قال: قرأ رسول الله ﷺ ﴿ يومئذ تحدث أخبارها ﴾ فقال، اتدرون ما أخبارها؟ قالوا: الله ورسوله أعلم. قال: ما أخبارها ان تشهد على كل عبد او امة بما عمل على ظهرها؛ ان تقول عمل كذا وكذا يوم كذا وكذا، قال فهذه اخبارها ﴾ رواه الترمذي وقال حسن غريب.

## نۆیەم: ڕەتبوون یان نەبوون بەسەر پرە (صراط)ی سەرپشتی دۆزەخدا:

وەپێربستە بڕواشمان بەوەبێ کەدوای تەواوبوونی لێپرسینەوەو هەڵسەنگێنرانی کردەوەکانو دیاریکردنی سزا یان پاداشت بۆ یەك یەکی بەندەکان ئنجا هەموویان بەبێ جیاوازی هەڵاواردن فەرمانیان پێدەکرێ کەبەسەر ئەو پردەدا بڕۆن کەبەسەر پشتی دۆزەخدا ڕادەهێلرێ، ئنجا هەرکەسە بەئەندازەی دامەزراوی بڕوار تەواری کردەوەو ڕەفتارەکانی بەخێرایی بەسەر ئەو پردەدا ڕەت دەبن[1]، ئەوانەش کەبێبڕوا بوو ون، یان خراپەکارو تاوانبارن بەو قوڵاپانەوە دەبن کەبەو پردەوەنو هەڵدەخلیسکێنو بەرەو قووڵایی دۆزەخ سەرەوژێر دەبنەوە، خوای میهرەبانو دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وإن منكم إلا واردها كان على ربك حتما مقضيا ثم ننجي الذين اتقوا ونذر الظالمين فيها جثيا ﴾ مريم (٧١،٧٢).

بەڵام ئەو موسڵمانو بڕوادارانەی خراپەو تاوانەکانیان هێندە نەبوو ون پێیان دووچاری دۆزەخ بنو چڵکو چەپەڵیشیان پێوە مارە، ئەوە لەشوێنێك لەنێوان دۆزەخو بەهەشت رادەگیرێن هەتا پاك دەبنەوەو تۆڵەو هەقی یەکتریان لێوەردەگیرێتەوە ئنجا ئیزن دەدرێن بۆ چوونە بەهەشت. پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ يخلص المؤمنون من النار فيحبسون على قنطرة بين الجنة والنار فيقتص بعضهم من بعض مظالم كانت بينهم في الدنيا حتى إذا هذبوا ونقوا أذن لهم في دخول الجنة فوالذي نفس محمد بيده لأحدهم اهدى بمنزله في الجنة منه بمنزله كان في الدنيا ﴾ رواه البخاري.

## دەیەم: حەوزی پێغەمبەر ﷺ:

وەپێربستە بڕوامان بەوەبێ کەدوای ڕەتبوونی بڕوادار بەسەر پردی ناوبراودا و ڕزگاربوونیان لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دەچنە سەر ئەو حەوزەی کەبەپێغەمبەرو ئوممەتەکەی خەڵات کراوە لێی تێر ئاو دەبنو هەر کەسێکیش لێی بخواتەوە قەت تینوی نابێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو حەوزە فەرمایشتی زۆری هەن، بۆ نموونە: ﴿ عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما انه قال: قال النبي ﷺ: ﴿ حوضي مسيرة

---

[1] بڕوانە (شرح العقيدة الطحاوية)، ل٤٧٠، هەروەها (شرح العقيدة الواسطية)ی خليل محمد هراس، ل١٢٦.

شهر ماءوه أبيض من اللبن وريحه أطيب من المسك وكيزانه كنجوم السماء، من شرب منها فلا يظمأ أبدا ﴾ رواه البخاري ومسلم.

وەهەروەك لەهەندێ فەرموودەی ڕاست (صحيح)دا هاتووە هەر پێغەمبەرێك حەوزێكی تایبەتی هەیە بەڵام حەوزی پێغەمبەرمان ﷺ لەهەموویان گەورەترو بەلەزەتترەو لەهەموویشیان قەڵەباڵغتر دەبێ[1].

## یازدەم: بەهەشت و دۆزەخ:

لەكۆتاییشدا پێویستە بڕوامان وابێ كەبەهەشتو دۆزەخ دوو دروستكراوی خوانو بۆ پاداشت وەرگرتنەوەو سزادانی ئامادەكراونو ئێستا هەنو هەمیشەییو نەبڕاوەن. دەقی قورئانو سوننەتیش دەربارەی بەهەشتو دۆزەخ زۆرن بەپێویستی نازانم هیچ بەنموونە بهێنمەوە، بەڵام ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەكەمە (مسك الختام)ی ئەم باسە كەدەفەرموێ: ﴿ إذا صار أهل الجنة إلى الجنة وأهل النار الى النار، جيء بالموت حتى يجعل بين الجنة والنار، ثم يذبح ثم ينادي مناد: ياأهل الجنة لاموت، ياأهل النار لاموت، فيزداد أهل الجنة فرحا إلى فرحهم ويزداد أهل النار حزنا إلى حزنهم ﴾ رواه البخاري.

# پایەی شەشەم: بڕوابوون بەقەزاو قەدەری خوا:

شەشەمین پایەو بنچینەی بیروباوەڕی ئیسلامی كەهەركەسێك بڕوای پێ نەبێ لەئاینی خوا دەچێتە دەرو بەبێبڕوا لەقەڵەم دەدرێ بریتییە لەبڕوابوون بەقەزاو قەدەر.

ئێستاش بالەچەند خاڵێكدا چۆنیەتی بڕوابوون بەقەزاو قەدەر ڕوون بكەینەوە:

## یەكەم: پێناسەی قەزاو قەدەر:

زانایان لەپێناسەكردنی قەزاو قەدەر ئەم سێ ڕایەیان هەن:

ا ـ (قدر) بریتییە لەزانیاریی خودا دەربارەی دروستكراوەكان هەر لەئەزەلەوە، هەرچی (قضاء)یشە بریتییە لەدروستكردنی دروستكراوەكان بەپێی زانیاری ئەزەلیی خودا.

ب ـ (قضاء) زانیاریی بێسەرەتای خوایەو، (قدر) یش دروستكردنی دروستكراوەكانە.

ج ـ قەزاو قەدەر هەردووكیان بەو نەخشەو بەرنامەو یاساو دەستوورە ڕێكو پێكانە

---

(١) بڕوانە (شرح العقيدة الطحاوية)، ل١٥١، هەروەها (شرح البيجوري على الجوهرة) ،ل٢٢٣.

دەگوترێ کەخوا بۆ ئەم بوون (وجود) ەی داناون.

کەواتە پوختەی قسان ئەوەیە کەقەزاو قەدەر دوو وشەن بەکاردەهێنرێن بۆ تەعبیرو لێکدانەوەی ئەو نەخشەو بەرنامەیەی کەخوا لەئەزەلەوە بۆ دروستکراوەکانی خۆی رەچاوی کردووە، وەبۆ عەینی دروستبوونو پەیدابوونی ئەو شتانە بەگوێرەی ئەو نەخشەو بەرنامە خواییەیە. دیارە دەقیش لەقورئانو سوننەت لەم بارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

- ﴿ إنا كل شئ خلقناه بقدر ﴾ القمر (٤٩).
- ﴿ الله يعلم ماتحمل كل انثى وما تغيض الأرحام وما تزداد وكل شئ عنده بمقدار ﴾ الرعد (٨).
- ﴿ ثم استوى إلى السماء وهي دخان فقال لها وللأرض ائتيا طوعا أو كرها قالتا أتينا طائعين فقضاهن سبع سموات في يومين- ﴾ فصلت (١٢،١١)

## دووەم: بڕوابوون بەقەزاو قەدەر چۆنە؟

دەتوانین بڵێین بڕوابوون بەقەزاو قەدەر لەم چوار خاڵەدا کورت دەبێتەوە:

(أ) بڕوابوون بەزانیاریی بێسەرەتای خوا، دەربارەی هەموو شتێك، لەنێو ئەو شتانەشدا کردەوەی ئینسانەکان.

(ب) نووسینو تۆمارکردنی ئەو زانیارییە لەلایەن خوای بەدیهێنەرەوە لە (لوح محفوظ) دا.

(ج) بڕوابوون بەویستی بێ لەمپەرو دەسەڵاتی سەرتاسەریی خوا کەدەوری هەموو شتێکیان داوە.

(د) دروستکرانی هەموو شتێك لەلایەن خواوە، کەکردەوەی ئینسانەکان بەشێکن لەو شتانە، خواش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ الله خالق كل شئ وهو على كل شئ وكيل ﴾ الزمر (٦٢)، وەفەرموویەتی: ﴿ والله خلقكم وماتعملون ﴾ الصافات (٩٦).

## سێیەم: مەبەست لە (بالقدر خیره وشره) چییە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: قەزاو قەدەری خوا لەڕووی بڕواپێبوونەوە دەکرێتە دوو بەشەوە (خیر) و (شر) ئەوە بەس سەبارەت بەخەڵكو دروستکراوەکانە، ئەگەرنا لەو ڕووەوە کەپاڵ دەدرێتە لای خوا هەموو چاکەیەو خراپە پاڵ نادرێتە لای خوا، چونکە زانیاریو ویستو دەسەڵاتی خواو هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەکانی دیکەشی هەر خێرو چاکەن لەخێرو چاکەش بەلاوە لێیان پەیدا نابێ، کەواتە ئەوەی کەبەخراپەو شەڕ دێتە بەرچاوی بەندەکان لەزاتی خۆیدا وانیە، بەڵام کورت بینیو تەسك بینیی ئینسان وای لێك دەداتەوە، بۆ وێنە: نەخۆشی، جەنگ، گیران، دەربەدەری، هەژاری، شەیتان.... هتد هەرکام لەمانە چەندین حیکمەتیان تێدایەو گەشەکردنو بەپێزبوونی ژیانی مرۆڤ لەسەر

زەوی داخوازیبان دەکات.[١].

## چوارەم: بیانووگرتن بەقەزاو قەدەر پیشەی کافرو لارێ بووانە:

بەڵێ... بەدرێژایی مێژوو بێبڕواو هاوبەشپەرستو تاوانباران بۆ پینە (تبریر) کردنی خراپەو تاوانەکانیان پەنایان بردۆتە بەر بیانووگرتن بەوە کەخوا ویستی لەسەر ئەوە بووە کەئەو ڕەفتارانە بکەنو ئەگەر خوا ویستبای نەیدەهێشت!

بەلام خوای زاناو دادگەر وەلامێکی دەدانشکێنو پڕبەپێستی ئەو جۆرە کەسانەی داوەتەوە لەچەند جێگایەکی قورئاندا، بۆ وێنە: ﴿ سيقول الذين أشركوا لوشاء الله ماأشركنا ولا آباؤنا ولاحرمنا من شئ كذلك كذب الذين من قبلهم حتى ذاقوا بأسنا قل هل عندكم من علم فتخرجوه لنا إن تتبعون إلا الظن وإن أنتم إلا تخرصون قل فلله الحجة البالغة فلوشاء لهداكم أجمعين ﴾ الأنعام (١٤٨-١٤٩).

لێرەدا دەبینین خوای زاناو کاربەجێ دوای ئەوەی قسەی بێبنچینەی بتپەرستەکان باسدەکات کەدەڵێن ئەگەر خوا ویستبای ئێمەو باپیرانیشمان هاوبەشمان پەیدا نەدەکردو هیچیشمان قەدەغە نەدەکرد، ئەم درو بەڵگە بەهێزو بیانووبڕە دەخاتەڕوو بۆ پەرچدانەوەی قسەکەیانو هەڵوەشاندنەوەی ئەو حوکمە پووچەی کەلەسەری هەڵدەچن کەبریتییە لەوەی: ئەوان خەتابارنین، چونکە خوا پێیان دەکات، یان خوا لەو کارو ڕەفتارەی ئەوان رازییە دەنا ڕێگای لێدەگرتن:

<u>بەڵگەی یەکەم</u>: ﴿ ...كذلك كذب الذين من قبلهم حتى ذاقوا بأسنا.. ﴾ الأنعام (١٤٨)، واتە: ئەوانەی پێش ئەمانیش ئاوا بڕوایان نەهێناو پێغەمبەرانیان بەناڕاست زانی هەتا سزای توندی ئێمەیان چێشت.

ئەم بەڵگەیەش ئاوایە:

ئەوانەی پێش ئەم هاوبەشپەرستو بێبڕوایانەش وەك ئەمان بێبڕواو لارێبوون هەتا سەرەنجام خوای دادگەر سزای دانو تۆڵەی لێسەندنەوە، ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کەخوا دادگەرو کاربەجێیەو سزادانی کەسانێکیش کەبەتۆبزێو بەبێ ویستو هەڵبژاردنی خۆیان دووچاری کوفرو خراپە دەبن پێچەوانەی دادگەریو کاربەجێییە، مادام وابێ سزادانی کافرو خراپەکارانی پێشوو لەلایەن خواوە لەسەر کوفرو خراپەکانیان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەبەویستو هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆیان کردوویانەو هیچ کەس تۆبزی ێنەکردوون.

<u>بەڵگەی دووەم</u>: ﴿ ...قل هل عندكم من علم فتخرجوه لنا إن تتبعون إلا الظن

(١) لەکتێبی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) دا لەتەفسیری (الرحمن الرحيم) دا ئەو باسە نووسراوەتەوە.

وإن أنتم إلا تخرصون ﴾الأنعام (١٤٨)، واتە بلّێ ئایا ـ لەو بارەوە کەخوا بەتۆبزی تووشی کوفرو خراپەکاریی کردوون، یان لەکارو ڕەفتاری بەدی ئێوە ڕازییە ـ هیچ زانیارییەکتان هەیە پیشانمان بدەن؟ بەڵکو بەس کەوتوونە دوای گومانو پیشەی ئێوە تەنها درۆکردنە.

چۆنیەتی دارشتنی ئەم بەڵگەیەش بەم شێوەیە:

ئەو کەسەی کەقەزاو قەدەری خواو زانیاریو ویستی دەوروەدەری خوا دەکاتە بیانووی بێبڕوایی‌و خراپەکاریی خۆی، درۆو بوختان بۆ خوا ساز دەکات، چونکە:

(أ) ئەوەی کەبۆئەو ئاشکراو ڕوونەو جوان جوان لێی دیارە ئەوەیە کەخوا لەکتێبەکانی خۆیداو لەسەر زمانی پێغەمبەرانی خۆی فەرمانی پێکردووە کەبڕوادارو چاکەکار بێ‌و خۆی لەتاوانو خراپە بپارێزێ.

(ب) بەڵام ئەوەی کەهیچ سەروەدەری لێناکاتو هیچ زانیارییەکی لەبارەیەوە نیە ئەو ئەندازەگیریو بڕیارانەن کەخوا لە (لوح محفوظ) دا نووسیویەتیو جگە لەخۆی هیچ کەس لێیان ئاگادار نیە، وەهیچ کەس نازانێ داخوا خوا چیی لەچارەنووسییەوە بۆ دیاری کردووە، تەنها دوای کردەوەو ڕەفتارەکانی بۆی دەردەکەوێ کەقەزاو قەدەری خوا چۆن بووە، دەی مادام وابێ بابای خراپەکار بۆچی ناچێ بەگوێرەی ئەو فەرمانەو پەیڕەوەی خوا کەفەرمانی پێکردووە پێیەوە پابەندبێ‌و ڕەفتار بکات کەدڵنیایە ڕەزامەندیی خوای تێدایە، بۆچی بەهانە بەنووسینو تۆمارکردنێك دەگرێ کەتەنها دوای بڕیارو ڕەفتاری خۆی لێی حاڵی دەبێ؟!

ڕوونتر بڵێم:

خوای دادگەر بەو جۆرە کەسانە دەفەرموێ: ئێوە هیچ زانیارییەکتان دەربارەی ئەوە نیە کەمن ویستم لەسەربەتی بەڵکو بەس شوێن گومانو درۆو بوختان دەکەون ئەگینا گەر ئێوە دەتانەوێ شوێن زانیاریی خوا بکەون، ئەوە ئاینو بەرنامەکەی، وەئەگەر دەتانەوێ بەس دیوی گەشو ڕوونی قەزاو قەدەرو ویستو زانیاریی ئەزەلی خوا ببینن ئەوا بەرنامەکەی بگرن‌و هەر سەرگەرمی بڕواداریو چاکەکاری بن، چونکە ئێوە چیتان بوێ خواش هەر ئەوەی بۆتان دەوێ‌و مەیلی وەدەستهێنان (کسب) ی چیتان هەبێ خواش هەرئەوەتان بۆ دێنێتە دی :﴿ فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ﴾ الكهف (٢٩)، ﴿ وماتشاءون إلا ان يشاء الله رب العالمين ﴾ التكوير (٢٩).

پاشان خوای زاناو دادگەر لەکۆتایی ئەم دوو بەڵگە بەهێزەدا دەفەرموێ: ﴿ قل فلله الحجة البالغة فلو شاء لهداكم أجمعين ﴾ الأنعام (١٤٩)، واتە: پێیان بڵێ: خوا بەڵگەی تەواوی لەسەر ئێوە هەیە، چونکە ئەگەر ویستبای بەتۆبزی ڕێگای چاکەتان پێبگرێ هەمووتانی دەخستە سەر ڕێگای ڕاست.

واتە ئێوە کەگومانتان وایە خوا تۆبزی لەئێوە کردووەو بەزۆرەملێ دووچاری کوفرو خراپەی کردوون، بەهەڵەداچوو ون، چونکە ئەگەر خوا ویستبای ئێسان بەویستی ئازادی خۆی نەژیتو وەك درووستکراوانی دیکە بەتۆبزی ملی پێکەچ بکات بەو شێوەیەی

کەپێی خۆشەو جێگای ڕەزامەندی‌یەتی ئەوە لەجیاتی ئەوەی تۆبزیتان لێ‌بکات بەرەو کوفرو خراپە تۆبزی‌ی لێ‌دەکردن بۆ گرتنی ڕێگای ڕاست، چونکە خوا بڕواداری‌و چاکەکاری‌و سوپاس‌گوزاری خۆش‌دەوێ‌و ڕقی لەبێ‌بڕوایی‌و خراپەو بێ‌وەفایی‌یە، ﴿ إن تكفروا فإن الله غني عنكم ولايرضى لعباده الكفر وإن تشكروا يرضه لكم ﴾ الزمر (٧).

دیارە کەسێکیش دەسەڵات‌و توانای بەسەر کەسێکدا هەبێ‌و بیەوێ بەزۆرەملێ ڕێگای پێ‌بگرێتە بەرو بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە ئەولایە تاوی دەدات کەحەزی لێ‌دەکات‌و لێ‌ی ڕازی‌یە نەك بەرەو لایەك کەڕقی لێ‌یەتی‌و پێ‌ی ناخۆشە!!

لەکۆتایی دەڵێم:

ئەوانەی بەهانە بەقەزاو قەدەری خوا دەگرن لەسەر تاوان‌و سەرپێچی‌یەکانیان لەدوو حاڵ بەدەرنین: یان بڕواداروو خواناسن، یان بێ‌بڕوار دڵ‌مەلاسن. جائەگەر بڕواداربن بەهانەگرتنیان بەقەزاو قەدەری خوا ـ کەئەنجامەکەی یان بەستەمکار حسێب‌کردنی خوایە، یانیش ڕازی‌بوونی خوا لەکوفرو خراپە ـ هیچ مەعنای نیەو بڕواهێنانەکەیان لێ‌هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە وەك پێشتر باسمان‌کرد بابای بڕوادار دەبێ قەناعەتی لەسەدا سەدی هەبێ‌و دانیشی پێدا بێنێ‌و بەرەفتاریش بیسەلمێنێ کەخوا خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لەهەموو لەکەو ناتەواوی‌یەك بەدوورە، جادیارە ستەم (ظلم) یش خراپترین‌و گەورەترین تاوانەو ناشیرینترین لەکەو پەڵەیە، هەربۆیەش لەچەندین جێگای قورئاندا تۆمەتی ئەو لەکە دزێوە لەخوای دادگەر ڕەوێنراوەتەوە بۆ وێنە: ﴿ ولايظلم ربك أحدا ﴾ الكهف (٤٩) وە ﴿ وما ربك بظلام للعبيد ﴾ فصلت (٤٦).

وەئەگەر بێ‌بڕواش بن ئەوە هەرچی لەو بارەوە بیڵێن زیادو بێ‌جێ‌و ناماقوڵی‌یە. چونکە تۆ بڕوات بەکەسێك نەبێت حەوجار حەوجار بڕوات بەنەخشەو بڕیارەکانیشی نیە.

کەواتە: قەزاو قەدەری خوا کردنە بەهانەو قەڵغانی بێ‌بڕوایی‌و خراپەکاری، کە بەدرێژایی مێژوو عادەتی بێ‌بڕوار لاڕێیان بووە، شتێکی بێ‌جێ‌و بێ‌بنچینەیەو بەڵگەی کەودەنی‌و نەفامی‌ی خاوەنەکەیەتی.

## پێنجەم: قەزاو قەدەر زۆر پەنهان‌و وردەو زۆر قسە لێ‌کردنی پەسند نیە:

بەڵێ... ئینسان بۆیە دروست نەکراوە کەهەموو شتێك بزانێ بۆیە ئەو توانایەشی پێ‌نەدراوە، بەڵکو ئینسان بۆ تاقی‌کردنەوەو جێ‌نشینایەتی‌کردن لەسەر زەوی دروست‌کراوەو هەموو ئەو پێداویستی‌یانەش کەپێویستی بۆ ئەنجام‌دانی ئەم کارە بۆی دابین‌کراون، بەڵام زیاتر نا. بۆ مەسەلەی قەزاو قەدەریش هەرئەوەندە لەسەر ئینسانی بڕوادار پێویستە کەبڕوای وابێ خوای بەدیهێنەر لەئەزەلەوە هەموو شتێکی زانیوەو نەخشەو بەرنامەی بۆ پەیدابوون‌و بەڕێوەچوون‌و لەنێوچوونی هەموو دروستکراوەکان داناوە: ﴿ والله بكل شئ عليم ﴾ التغابن (١١) بەبێ ویستی خوا هیچ شتێك نابێ: ﴿ فعال

لما یرید ﴾ البروج (١٦)، خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ، ﴿ إن الله علی کل شئ قدیر ﴾ ﴿ الله خالق کل شئ ﴾ الرعد (١٦).

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە دڵنیاو بڕوا نەنەلەخشاوبێ کەخوا خاوەنی ئەوپەڕی دادگەریو کاربەجێیی پێیەو هێندەی سەری دەرزییەك ستەم لەکەس ناکات، وەئینسانیش مادام خوا بۆ هەڵگرتنی سپاردە (أمانة) ی تایبەتی خۆی خوڵقاندوویەتی تالیی دەکاتەوەو ئەرکی جێگرایەتیو لەبوونەوەردا پێ خەڵات کردووە، دیارە هەموو ئەو شتانەی کەبۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە گرنگانە پێویستنی پێی بەخشیوە، وەك: زانیاری، توانا، ویست، ئازادی... هتد.

بەڵام لەمە بەولاوە، کەشایا ویستی بێسنووری بێوێنەی خوا لەگەڵ ویستی سنوورداری گچکەی ئینسان پەیوەندییان پێکەوە چۆنەچۆن نیەو مادام خوا بەدیهێنەری هەموو شتێك بێ کەکردەوەی ئینسانەکان بەشێکن لەوشتانە، دەوری ئینسان چییەو چۆنە؟ گەلێکی دیکە لەم جۆرە بابەتانە کەبەدرێژایی مێژوو مشتو مڕیان لەسەر کراوە بێئەوەی ئەنجامێکی ڕوونو مسۆگەر دەستگیر بووبێ، نەپێویست دەکاتو نەپەسندیشە ئینسان بەخۆڕایی خۆیانی پێوە ماندوو وچڕۆ بکاتو کاتیان پێوە بەفیڕۆ بدات، چونکە هەرروەك چۆن هەرکام لەهەستەکانی دیتنو بیستنو چێژتنو... هتد توانایەکی سنوورداریان هەیە هێزەکانی عەقڵو دڵو خەیاڵیش بەهەمان شێوەو لەسنووری دەسەڵاتی خۆیان بەولاوە بڕ ناکەن. خوای زاناو تواناو دادگەریش لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ لایسأل عما یفعل وهم یسألون ﴾ الأنبیاء (٢٣).

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیە دێنین: ﴿ عن عمر بن شعیب عن أبیه عن جده قال: خرج رسول الله ﷺ ذات یوم والناس یتکلمون في القدر، قال فکأنما تفقأ في وجهه حب الرمان من الغضب، فقال لهم: تضربون کتاب الله بعضه ببعض؟ بهذا هلك من کان قبلکم ﴾ رواه الإمام أحمد وابن ماجة.

## شەشەم: شوێنەوارو پەرێزی بڕوابوون بەقەزاو قەدەر لەژیانی ئینسانی بڕواداردا:

لەڕاستیدا بڕوابوون بەقەزاو قەدەر بەوشێوەیەی کەئیسلام دەڵێ هۆیەکی یەکجار گرنگو کاریگەرە بۆ ڕزگاربوونی ئینسان لەدوودڵیو دڵەڕاوکەو ترسان لەمردنو هەژاریو نەخۆشیو دوژمنو ناحەزان... هتد وەپەیدابوونی دڵارامیو ئۆخژنو دڵنیاییو خەمڵینی سیفەتە بەرزو پەسندەکانی وەك ئازایەتیو دڵقایمیو بەرچاوتێریو بەخشندەییو پشت بەخوا بەستنو عیززەتو سەربەرزیو خۆڕاگری لەئاقار گیروگرفتو تەنگو چەڵەمەکانی ژیانداو ڕازیبوون بەحوکمو بڕیاری خوا لەهەموو خاڵێکداو، پەیدابوونی ئەو پەڕی ڕێزو ئەدەب لەگەڵ خواداجل جلاله.

دیارە هەرکام لەم خەسڵەتە بەرزانەش گەورەترین دەوریان هەیە لەگەشەپێدانو خەمڵاندنی ڕووحو پاراستنو ساغڕاگرتنی جەستەدا.

ئێستاش باسەرنجی ئەم چەند دەقە بدەین تاکو زیاترو چاکتر لەگرنگیو کاریگەریی بروابون بەقەزاو قەدەر لەژیانی ئێساندا تێبگەین:

- ﴿ ما أصاب من مصيبة إلا بإذن الله ومن يؤمن بالله يهد قلبه والله بكل شئ عليم ﴾[1] التغابن (١١).
- ﴿ وما أصاب من مصيبة في الأرض ولافي انفسكم إلا في كتاب من قبل ان نبرأها إن ذلك على الله يسير لكيلا تاسوا على مافاتكم ولاتفرحوا بما آتاكم الله والله لايحب كل مختال فخور ﴾ الحديد (٢٢-٢٣).
- ﴿ ياغلام احفظ الله يحفظك احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم ان الأمة لواجتمعت على ان ينفعوك بشئ لم ينفعوك إلا بشئ قد كتبه الله لك، وان اجتمعوا على ان يضروك بشئ لم يضروك إلا بشئ قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف ﴾ رواه الترمذي وقال حسن صحيح.

## حەوتەم: بڕوابوون بەقەزاو قەدەر لەگەڵ گرتنی هۆیەکاندا دژ نیە:

بەڵێ... ئێمە هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کەفەرمانمان پێکراوە بڕوا بەقەزاو قەدەری خوا بێنینو دڵنیابین کەهیچ شتێك بەبێ زانیاریو ویستی خوا پەیدا نابێو رووداوەکان رونادات وەفەرمانمان پێکراوە کەدڵمان بەس بەخوا قایم بێو تەنها پشت بەو ببەستینو فەرمانیشمان پێکراوە کەهەوڵی وەدەستهێنانی وەسیلەو هۆی تایبەتیی هەرشتێك بدەین، چونکە هەر ئەو خوایەی پێمان دەفەرموێ پشتتان بەس بەخوا ببەستن: ﴿ وعلى الله فتوكلوا ﴾ المائدة (٢٣) هەرئەویش پێمان دەفەرموێو رایدەگەیەنێ ئەو کارە دابین بکەین بۆ وێنە: ﴿ ياأيها الذين آمنوا اتقوا الله وابتغوا إليه الوسيلة وجاهدوا في سبيله لعلكم تفلحون ﴾ المائدة (٣٥) یان ﴿ ويسألونك عن ذي القرنين قل سأتلوا عليكم منه ذكرا إنا آتيناه من كل شئ سببا فاتبع سببا حتى إذا بلغ- ﴾الكهف (٨٤-٨٦).

بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کەئێستان بڕوای وابێو دڵنیابێ کەئەو هۆو وەسیلانە بەتەنهاو بەبێ ویستی خوا هیچیان لێ‌هەڵناوەرێ، بۆیە پێویستە ئێنسانی مسوڵمان دڵی هەر بەخوا قایم‌بێو هەموو شتێك هەر لەو بزانێ، چونکە ئەو کاریگەرییەی کەلەنێو هەموو وەسیلەکانیشدا هەیە هەر خوا دایناوەو ویستی وابووە

[1] (علقمة) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (هو الرجل تصيبه مصيبة فيعلم انها من عند الله فيرضى ويسلم)، بڕوانە تەفسیری ئیبنو کەثیر، ب٤، ل٢٧٥. ئیبنو عەبباسیش فەرموویەتی: (يهدي قلبه لليقين، فيعلم ان ماأصابه لم يكن ليخطئه وما اخطأه لم يكن ليصيبه) هەمان سەرچاوەی پێشوو..

هەرکاتێکیش بیەوێ ئەو کاریگەرییەی ناهێڵێ، بۆ وێنە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
﴿ تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأمم ﴾.

دەبینین پێغەمبەری پێشەوامان بۆ وەدەستهێنانی وەچە (ذرية) ڕێڕوونیمان دەکات کەهەموو وەسیلەی پەیدابوونی دابین بکەین کەبریتییە لە (خواستنی ئافرەتی مێردپەروەرو بەزاووزێ) بەڵام لەبەر ئەوەی پەیدابوونی منداڵ لەژێر ڕکێفی ویستی زاڵی خوا دایە مەرج نیە هەرکاتێك پیاو ژنی هێنا منداڵیان بۆ پەیدابێ، چونکە لەسەرووی هۆو وەسیلەکانەوە ویستی زاڵی خوا فەرمانڕەوایە، بۆیە خوای پەروەردگارمان فەرموویەتی: ﴿ لله ملك السموات والأرض يخلق مايشاء يهب لمن يشاء إناثا ويهب لمن يشاء الذكور أو يزوجهم ذكرانا وإناثا ويجعل من يشاء عقيما إنه عليم قدير ﴾ الشورى (٤٩-٥٠).

کۆتایی ئەم باسەش بەفەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەسەرهاتێکی عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێ دێنین:

فەرموودەکەش ئەمەیە: ﴿ عن أسامة بن شريك قال: أتيت النبي ﷺ وأصحابه فكأنما على رؤسهم الطير، فسلمت ثم قعدت، فجاء الأعراب من ههنا وههنا فقالوا يارسول الله أنتداوى؟ فقال: تداووا فان الله عز وجل لم يضع داءا إلا وضع له دواء غير داء واحد؛ الهرم ﴾ رواه الأربعة وقال الترمذي: حسن صحيح.

بەسەرهاتەکەش: (بوخاری) خوای لێخۆشبێ گێڕاویەتەوە کەلەکاتێك عومەر خوای لێ ڕازی بێ چوو بۆ شامێ لێپرسراوی شارەکان پێی گەیشتن و هەواڵیان دایە کەدەردی طاعوون (وباء) بڵاوبۆتەوە، ئەویش ڕاوێژی بەکۆچکەرو پشتیوانەکان (المهاجرين والأنصار) کرد، پاشان ئەو دەمڕاستانەی قوڕەیش کەدوای گرتنی مەککە کۆچیان کردبوو، ئەمان - کۆچکەرانی دوای گرتنی مەککە - یەکدەنگ بوون لەسەر گەڕانەوە بۆ ئەوەی لەو دەردە دووربکەونەوە عومەریش فەرمانی هەر بەو ڕایەکرد، (أبو عبيدة) یش پێی گوت: ئایا لەقەزاو قەدەری خوا ڕادەکەی؟ عومەر فەرمووی: وای ئەگەر غەیری تۆ ئەو قسەیەی دەکرد ئەی (أبو عبيدة)؟! بەڵێ.. لەقەدەری خوا بۆ قەدەری خوا ڕادەکەین. ئایا ئەگەر تۆ حوشترت پێ بێ و بچیە نێو دۆڵێکەوە کەدوو قەدپاڵی هەبێ یەکیان بەلەوەڕو ئەوی دیکە بێ لەوەڕ. ئایا ئەگەر لەوەی لەوەڕدارە بیانلەوەڕێنی هەربەقەدەری خواو ئەگەر لەوەی بێ لەوەڕە بیانلەوەڕێنی هەربەقەدەری خوا نیە؟!(١).

■ ■ ■

(١) بڕوانە (فتح الباري)، ب١٠، ل١٥٠-١٥١.

## بەندی پێنجەم:

# چۆنیەتی کافربوونی ئینسان و هەڵوەشانەوەی شایەتمان

لەبەندی سێیەمدا زانیمان ئیمان چۆن دادەمەزرێ و ئینسان بەچ شێوەیەك دێتە نێو بازنەی ئیسلامەوەو موسڵمان دەبێ، خوا پشتیوان بێ لێرەشدا مەسەلەی چۆنیەتی کافربوون و هەڵگەڕانەوە (إرتداد) لەئاییین دەتوێژینەوە.

پێشەکی دەڵێین:

عادەت وایە ئینسان لەچ دەرگاو دەروازەکەیەوە بچێتە نێو شوێنێکەوە دیارە دەبێ هەر لەوێشەوە بێتە دەرێ، کەواتە مادام دەرگاو ڕێگای بڕواهێنان و موسڵمانبوون بریتی بێ لە (شایەتمان) ; ﴿ أشهد ان لاإله إلا الله وأشهد ان محمدا رسول الله ﴾ دیارە پێچەوانەی بڕوا و موسڵمانەتیش بە دژ (ضد)ی شایەتمان و هەڵوەشاندنەوەی دێتەدی.

پێشەوا (طحاوي) یش خوا لێی خۆش بێ بەچاکترین شێوە تەعبیری لەم بنچینە (قاعدة) یە کردووە کەدەفەرموێ: (ونسمي اهل قبلتنا مسلمين مؤمنين مادامو بما جاء به النبي ﷺ معترفين وله بكل ماقاله واخبر به مصدقين، ولانكفر احدا من اهل القبلة بذنب مالم يستحله ولانقول لايضر مع الإيمان ذنب لمن عمله...ولايخرج العبد من الإيمان إلا بجحود ماأدخله فيه)[1].

بەڵێ... بەرنامەدانەر (شارع) دەروازەو دەرگایەکی دیاری کردووە بۆ بڕواهێنان و هاتنە نێو ئیسلامەوە کەبریتی یە لەبەڕاست زانین و دانپێداهێنان (التصديق والإقرار) بەدوو ڕستەی ﴿ أشهد ان لاإله إلا الله وأشهد ان محمدا رسول الله ﴾ مادام وابێ هەر کەسێك لەم دەرگایەوە هاتبێتە نێو ئیسلام تەنها بەوە لێی دەچێتە دەرێ کەقسە یان کردەوە یان لەناعەتێکی وای لێ بپشکوێتەوە کەپێچەوانەی ئەو بەڕاستزانین و دانپێداهێنانەی پێشوو بێ[2].

دیارە پێشتریش ڕوون بۆوە کەمەعنای ﴿ أشهد ان لاإله إلا الله ﴾ ئەوەیە کەبەدڵ و زمان و کردەوە دانی پێدا بهێنرێ و بسەلمێنرێ کەخوا (سبحانه وتعالى) تاك و بێوێنەیە لەپەروەردگاریتی و پەرستراویتی و ناو و سیفەتەکاندا، بەڵێ شایەتمان بەخوا یانی ﴿ توحيد الله في ربوبيته وألوهيته وأسمائه ﴾.

---

(١) بڕوانە شرح العقيدة الطحاوية، ل٣٥٠-٣٥١، ٣٧٢.

(٢) زانایانی ئیسلام بەبڕستەی (إنكار ماعلم من الدين بالضرورة كفر) تەعبیریان لەو مەسەلەیە داوەتەوە.

وەمەعنای ﴿ أشهد ان محمدا رسول الله ﴾ ئەوەیە کەبەدڵو زمانو کردەوە دانی پێدا بهێنرێو بسەلمێنرێ کە (محمد ﷺ) ڕەوانەکراوی خوایەو هەرچی لەخواوە هێناویەتیو هەواڵی پێداوە لەیاساو دەستوورەکانی ژیانو هەواڵی نادیارو پەنهان ڕاستو دروستەو خاوەنی چاکترینو تەواوترین خووڕەوشتەو، لەهەموو خووخدەو کەمو کوڕییەکی وا پاکو دوورە کەبۆ ئینسان بەناتەواوی (نقص) دادەنرێو لەگەڵ پایەی بەرزی پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێ.

کەوابێ هەرکەسێك قەناعەت (إعتقاد) ێك یان قسە (قول) ێك یان کردەوە (عمل) ێکی لێدەرکەوت کەدژایەتیو ئینکاری کردنی بەشێکی ئەو شایەتمانەی گوتمان بگەیەنێ ئەوە لەئایینی خوا دەچێتە دەرێو بەکافرو بێبڕوا حسێب دەکرێ، بەڵام بەمەرجێك بەڵگەو نیشانە (قرینة) یەك نەبێ ئەوەی لێبفامرێتەوە کەئەو قسەو کردەوە دژو پێچەوانەی شایەتمان بەناچاریو بەتۆبزیو بەبێ ویستی ئازاد پەیدا بوو بێ، چونکە لەو حاڵەتەدا حوکمەکەی دەگۆڕێ وەك دواتر باسی دەکەین.

بەڵام ئەگەر باپای بڕوادارو موسڵمان هەڵەو تاوانێکی کرد واتە قەناعەتو قسەو ڕەفتارێکی وای لێپشکۆتەوە کەلەڕوانگەی شەریعەتەوە بەسەرپێچیو لادان لەفەرمانی خوادا دادەنرا، ئەوە بەس بەوەندە لەبازنەی بڕوادار ئیسلام ناچێتە دەرێ با لێشی پەشیمان نەبێتەوە بەمەرجێك هیچی وای تێدا نەبێ کەهەڵوەشاندنەوەی بەشێکی شایەتمان بگەیەنێ، ئنجا ئەوکەسە ئەگەر خوا ویستی لەسەربوو بەو تاوانو هەڵەیەی سزای دەداتو دەیخاتە دۆزەخەوە، بەڵام سەرەنجام هەر دەچێتە بەهەشت چونکە فەرموودەی ڕاست لەو بارەوە زۆرن کەهەر کەسێك هێندەی گرانی گەردیلەیەك ﴿ مثقال ذرة ﴾ ئیمانی لەدڵدا هەبێ لەئاگری دۆزەخ گرفتاری دەبێو دەهێنرێتە دەرێو دەخرێتە بەهەشتەوە.

ئێستاش دوای ئەم پوختەیە دەچینە سەر درێژەی باسو وردترو فراوانتر چۆنیەتی کافربوونو هەڵوەشانەوەی شایەتمان ڕوون دەکەینەوە: دەتوانین هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان (نواقض الشهادة) لەم چوار جۆرەدا کورت بکەینەوە:

١. هەر قسەو کردەوەیەك کەدژی پەروەردگاریتی خوایە.
٢. هەر قسەو کردەوەیەك کەدژی پەرستراویتی خوایە.
٣. هەر قسەو کردەوەیەك کەدژی ناوو سیفەتەکانی خوایە.
٤. هەر قسەو کردەوەیەك کەدژی پەیام (رسالة) ی خوا یان خاوەنەکەیەتی ﷺ.

## جۆری یەکەمی هەڵوەشانەوەی ئیمانو شایەتمان:

لەکاتی توێژینەوەی پایەی یەکەمی بیروباوەڕدا گوتمان یەکەمین بەشی یەکتایی خوا بریتییە لەیەکتایی خوا لەپەروەردگاریتی ﴿ توحيد الله في الربوبية ﴾ دا. کەواتە: هەر قەناعەتو قسەو کردەوەیەك دژی پەروەردگاریتی خوا بێتو ئینکاری کردنی یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی بگەیەنێ ئەوە بەکوفرو پاشگەزبوونەوە (الكفر والإرتداد) دادەنرێو شایەتمانی پێهەڵدەوەشێتەوە، بۆ وێنە:

بڕوانەبوون بەبەدیهێنەرایەتی خوا، یان بوونەوەرو ماددە بەئەزەلی دانانو بڕوانەبوون بەدرووستکراوێتی (مخلوقیة) یان، وەدرووستکردنو کار هەڵسووڕاندن (الخلق والتدبیر) پاڵدانە لای غەیری خوا وەك ڕێکەوتو سرووشت...، وەشێنکاری کردنی خاوەنایەتی خوا بۆ هەرکام لەدرووستکراوەکان، یان ژیاندنو مراندنو ڕۆزی‌دان لەغەیری خوا زانین، یان هاوبەش بۆ پەیداکردنی لەو بارەوە، وەبڕوابوون بەوە کەخوا درووستکراوەکانی خۆی بەرهەڵدا کردووەو مشووریان ناخواتو سەرپەرشتی‌یان ناکاتو نایانپارێزیو... هتد.

دیسان ئەوەش بەکوفرو هەڵگەڕانەوە حسێب دەکرێ کەکەسێك لافی هەبوونی یەکێك لەتایبەتمەندی‌یەکانی پەروەردگارێتی خوا لێبدات، وەك فیرعەون کەدەیگوت: ﴿ أنا ربكم الأعلى ﴾ النازعات (٢٤) وەهەرکەسێکیش خۆ بەخوا زانێکی وەك ئەم فیرعەونەو هەر کەسێکی تری وەك ئەو بەڕاست دابنێ دیسان ئەویش بەکافرو هەڵگەڕاوە لەقەڵەم دەدرێ.

## جۆری دووەم لەشێوەکانی هەڵوەشانەوەی ئیمان:

ئەمیش بریتی‌یە لەهەر قەناعەتو قسەو کردەوەیەك کەدژایەتیو شێنکاری کردنی پەرستراوێتی خوا (الوهیة الله) دەگەیەنێ، چونکە وەك لەکاتی توێژینەوەی پایەی یەکەمی بیروباوەڕدا گوتمان بەشی دووەمی یەکتایی خوا بریتی‌یە لەبڕوابوون بەیەکتایی خوا لەپەرستراوێتی‌دا، کەواتە هەر قەناعەتو قسەو کردەوەیەك دژی پەرستراوێتی خوا بێو لەگەڵی تێك بگیرێ دەبێتە هۆی نەهێشتنو هەڵوەشانەوەی ئیمانو شایەتمان، بۆ ڕێنە:

(أ) ئەنجام‌دانی یەکێك یان بەشێکی درووشمەکانی خواپەرستی (شعائر العبادة) بۆ غەیری خوا، وەك: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زیکر، کڕنووش بردن، ڕکوع، پاڕانەوە، هاوارلێکردن (الإستغاثة)، طەواف، شت‌سەربڕین... هتد.

(ب) لەدڵدا نیشتەجێ‌بوونی ترسو هیواو خۆشەویستیو پشت پێ‌بەستنو بەگەورەگرتنو... هتد سەبارەت بەغەیری خوا، بەشێوەیەك کەبەس لەخوا دەوەشێتەوەو لەو بوارانەدا کەتەنها لەژێر ڕکێفی ویستو دەسەڵاتی ئەودان.

(ج) لاف‌لێدانی هەبوونی مافی دانانی پەیڕەوو بەرنامە بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵك، وەبڕوابوون بەو طاغووتانەی کەئەو جۆرە لافە لێ‌دەدەن، کەواتە هەر کەسێك بەرنامە بۆ ژیانی خەڵك دابنێ یان حەرامێك حەڵاڵو حەڵاڵێك حەرام بکاتو یاسایەك دابنێ کەبەپێچەوانەی بنچینەو هێڵە گشتی‌یەکانی قورئانو سوننەت بێت ئەوە بەو ڕەفتارەی ئەگەر پێشتر ئیمانیشی بووبێ هەڵوەشاوەتەوەو کافر بووەو، هەرکەسێکیش لەو ڕەفتارو هەڵوێستەی‌دا ئاگایانە، بەڕاستی بزانێ یان پشتگیری بکات وەك پێشەوایەکەی بەکافرو هەڵگەڕاوە دادەنرێ، ئەمەش چەند دەقێکی قورئانو سوننەت لەو بارەوە:

■ ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦).

- ﴿ وما تعبدون من دونه إلا أسماء سميتموها أنتم وآبائكم ماأنزل الله بها من سلطان إن الحكم إلا لله أمر الا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لايعلمون ﴾ يوسف (٤٠).
- ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولاً أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾ النحل (٣٦).
- ﴿ أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله ﴾ الشورى (٢١).
- ﴿ وقالوا ربنا أنا أطعنا سادتنا وكبرائنا فأضلونا السبيلا ﴾ الأحزاب (٦٧).

## جۆری سێیەم لەجۆرەکانی هەڵوەشانەوەی ئیمان :

لەکاتی توێژینەوەی پایەی یەکەمی بیروباوەڕدا گوتمان جۆری سێیەمی یەکتایی خوا ئەوەیە کەبەدڵ قەناعەت بێنین و بەزمان دانی پێدابێنین کەبەس خوا خاوەنی هەموو ناوێکی چاک و سیفەتێکی بەرزو پەسەندە و لەهەموو کەم و کوڕی و هەڵە و پەڵەیەك پاك و دوورە.

کەواتە: هەرکەسێك ئینکاری یەکێك لەو ناوو سیفەتانە بکات کەخوا بۆخۆی یان پێغەمبەرەکەی بۆی بڕیارداو، یان ناوو سیفەتێکی وای لێ هەڵدات کەخوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ نەیانفەرمووە یان هەڵە و کەم و کوڕییەکی پاڵداتە لا، یان یەکێك لەسیفەتەکانی خوا بۆخۆی یان بۆ یەکێك لەدروستکراوەکانی بڕیار بدات ئەوە هەم بۆخۆی و هەم هەرکەسێکیش بەڕاستی بزانێ بەکافر و هەڵگەڕاوە دادەندرێ.

## جۆری چوارەم لەجۆرەکانی هەڵوەشانەوەی شایەتمان :

ئەمیش بریتی یە لەهەر قەناعەت و قسە و کردەوەیەك کەتانە و ڕەخنە و ئینکاری یەکی تێدابێ سەبارەت بەپەیامی خوا و هەڵگرەکەی، واتە (ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ)، چونکە شایەتمان هێنان بەپێغەمبەر ﷺ ﴿ اشهد ان محمدا رسول الله ﴾ بەڕاستزانین و دانپێداهێنان بەپێغەمبەرایەتی (محمد ﷺ) هەرچی لەخواوە هێناویەتی و هەواڵی پێدراوە دەگرێتە ناو خۆی، کەواتە ئەوەی کەشایەتمان بەپێغەمبەر ﷺ هێنان هەڵدەوەشێنێتەوە دوو بەشە: یەکەمیان تانەدان (الطعن) لەپێغەمبەری خوا ﷺ و ئینکاری کردنی یەکێك لەو خەسڵەتانەی کەمەرجن بۆ پێغەمبەرایەتی یەکەی. دووەمیشیان تانەلێدان و ئینکاری کردنی یەکێك لەو شتانەی کەئەو لەخواوە هەواڵی پێدراوە و پێی ڕاگەیاندراوە.

کەوابێ:

(١) هەرکەسێك شتێك پاڵداتە لای پێغەمبەر ﷺ کەدژایەتی هەیە لەگەڵ پێغەمبەرایەتی و پلەوپایەی بەرزیدا، وەك تانەدان و ڕەخنەگرتن لەڕاستی (صدق) و ئەمینی و پاکی و ژیری ی، وەهەرکەسێك جنێوی پێبدات، یان گاڵتەی پێبکات و لاسایی بکاتەوە بەسووك سەیری بکات، ئەوە بەهەرکام لەم شتانە هاوڕێنەکانیان کافر دەبێ و شایەتمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

(ب) وەهەرکەسێك ئینکاری بەکێك لەوشتانە بکات کەلەخوارە هەواڵی پێدراوەو بەڕێگایەکی جێی متمانە چەسپاوە وەك: زیندووبوونەوە، لێپرسینەوە، تەرازوو، پردی دۆزەخ، بەهەشت، دۆزەخ... هتد، ئەوە وەردەگەڕێ‌و ئیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

هەروەها هەرکەسێك ئینکاری گچکەترین شتی قورئان بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ رای گەیاندووە کەهەموو ئایەتەکانی قورئان بێ کەم‌و زیاد لەخواوەن.

دیسان هەرکەسێك ئینکاری یەکێك لەیاساکانی ئیسلام بکات کەلەقورئان‌و سوننەتدا چەسپاون، وەك ئینکاری کردنی فەرزبوونی نوێژ یان زەکات یان رۆژوو یان ئینکاری کردنی قەدەغەکرانی داوێن پیسی یان دزی یان مەی خۆری، یان ئینکاری کردنی ئەندازەی ڕکاتەکانی پێنج نوێژە فەرزەکان‌و کەم‌و زیاد تێداکردنیان...

هەروەها هەرکەسێك ئینکاری نێررانی پێغەمبەرانی پێش (محمد ﷺ) بکات، یان بڕوا بەبەشێك لەو بەسەرهاتانەیان نەهێنێ کەقورئان گێڕاویەتەوە یان ئینکاری هەبوونی جنە (جن) بکات، یان بوونی شەیتان یان کورسی‌و عەرش‌و لەوح‌و قەڵەم، یان ئینکاری بوونی کەسایەتی‌یەك بکات کەقورئان بوونی ئیسپات کردووە یان تانە لەیەکێك لەپێغەمبەرانی خوا بدات‌و بەسووك سەیری بکات، یان ئینکاری ئیعجازی قورئان بکات، یان لافی پێغەمبەرایەتی یان وەحی بۆهاتن لێبدات یان بڕوا بەکەسێك بکات‌و پشتگیری بکات کەیەکێك لەم شتانەی گوترا‌و هاوڕێنانی لێڕوودەدات، ئەوە کافرەو شایەتمانەکەی لێ‌هەڵوەشارەتەوە ئەگەر پێشتر ئیمانی هەبووبێت.

بەڵام لێرەدا نابێ لەم دوو ڕاستی‌یە بێ‌ئاگا بین:

١. کەسێك ئینکاری شتێك بکات کەئاشکراو زانراو نەبێ لەئایین‌دا‌و بەس زانایانی تایبەتی پێی ئاشنابن، ئەوا بەو ئینکاری کردنەی کافر نابێ، هەتا لێی حاڵی دەکرێ‌و تێی دەگەیەنرێ، جا ئەوکاتە ئەگەر هەر سووربوو لەهەڵوێستی خۆی دانەبەزی حوکمەکەی چی‌بێ بەسەری دادەرێ.

٢. هەروەها کەسێك ئینکاری مەسەلەیەك بکات کەجێگای کۆشش (إجتهاد) بێ‌و زانایان تێیدا جیاواز بن‌و یەك دەنگ نەبن، ئینکاری کردنەکەی بەکوفرو هەڵگەڕانەوە لەقەڵەم نادرێ، ئیمام نەوەوی خوای لێ‌خۆش‌بێ لەو بارەوە فەرموویەتی: (..وكذلك الأمر في كل من انكر شيئا مما اجمعت الأمة عليه من امور الدين إذا كان علمه منتشرا، كالصلوات الخمس، وصوم شهر رمضان والإغتسال من الجنابة، وتحريم الزنا والخمر، ونكاح ذوات المحارم، ونحوها من الأحكام، إلا ان يكون حديث عهد بالإسلام لايعرف حدوده فإنه اذا انكر شيئا منها جهلا به لم يكفر. فاما كان الإجتماع فيه معلوما من طريق علم الخاصة كتحريم نكاح المراة وعمتها وخالتها، وان القاتل عمدا لايرث، وان للجدة السدس وما اشبه ذلك من الأحكام، فإن من انكرها لايكفر بل يعذر فيها لعدم استفاضة علمها في العامة).

ئێستاش بەپێویستی دەزانم بچینە سەر تریژینەوەو ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەکی گرنگ کەزۆربەی خەڵکی یان بەتەواوی لێی بێ‌ئاگان یان تێیدا بەهەڵەدا دەچن ئەویش بریتی‌یە

لەوەی کە:

## ڕازیبوون بەکوفرو ڕازی نەبوون بەئیسلام کوفرە:

١. بەڵێ... لەڕاستیدا هەر جۆرە ڕازیبوونێك بەکوفرو هەر شێوە ڕەتکردنێکی ئیسلام بەکوفرو هەڵگەڕانەوە دادەنرێو هەرکامێکیان هەردووك بەشەکانی شایەتمان هەڵدەوەشێننەوە، چونکە هەرکەسێك بەیەکێك کەئێنکاری شایەتمان دەکات بڵێ: ڕاست دەکەی، یان بەیەکێك بڵێ: درۆ دەکەی کەشایەتمان دێنێ هیچ کەس گومانی نیە لەکافربوونیدا، ئنجا چەند شێوازێکی جیاجیاش لەقسەو کردەوەو ئاکار هەن کەلەعورفی ئایینو خەڵكو زماندا دەلالەتیان لەگوتنی (ڕاست دەکەی) بۆ گوتنی وشەی کوفر، (درۆ دەکەی) بۆ شایەتمان هێنان کەمتر نیە، جادیارە هەرکەسێك یەکێك لەو شتانەی لێدەربکەوێ لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرێو کافر دەبێ، کەواتە بالەدرو خاڵاندا ئەم مەسەلەیە روون بکەینەوە:

## یەکەم: شێوازەکانی ڕازیبوون بەکوفر:

### ١. بەکافر دانەنانی کافران لەبێبڕواو هەڵگەڕاوەو هاوبەشپەیداکەران:

بەڵێ... هەرکەسێك ئینسانێك یان کۆمەڵێکی کافر بەکافر دانەنێ، یان دوودڵ بێ لەکوفرەکەیان یان بۆچوونێکی کافرانەیان بەڕاست دابنێ ئەوە بەکافر دادەنرێو لەگەڵیان دەچێتە خانەی کوفرەوە.

بەڵام بۆ ئەوەی لەئیش کردن بەم بنچینەیەدا بەهەڵە دانەچین پێویستە ئاگاداری ئەم ڕاستییانە بین:

(أ) ئەوکەسەی کەبەهۆی کافردانەنانی کافرانەوە حوکمی کوفری بەسەردا دەدرێ دەبێ بەبەڵگەی تەواوو روون پێی سەلمێنرابێ کەئەوانەی ئەو بەکافریان دانانێ کافرن، چونکە ئەوکاتە ئینکاری نەکردنی لەکوفریان دەبێتە نیشانەو بەڵگەی ڕازیبوون بەو کوفرەو هەڵبژاردنیو پەسندکردنی.

(ب) هەروەها بۆ بەکافر دانەنانی ئەوکەسانە ئەوەش بەمەرج گیراوە کەئەوانەی حوکمی کوفریان بەسەردا دراوە بەشتێك حوکمی کوفریان بەسەردا درابێ کەزانایان لەسەری رێك کەوتبنو یەك دەنگبن، بەڵام ئەگەر هۆی حوکمدرانەکەیان مەسەلەیەك بوو زانایانی ئیسلام تێیدا جیارازبوون درووست نیە ئەو کەسەی بەکافریان دانانێ بەکافر دابنرێ، بۆ وێنە: بەکافردانانی (خوارج) و (مرجئة) و (قدریة) و... هتد، چونکە زانایان لەسەر کافرکردنیان یەك دەنگ نین هیچ کەس بە کافردانەنان (عدم التکفیر) یان کافر نابێ.

دیارە هەندێك بیرو تاقم کوفرەکەیان بۆتە شتێکی ئاشکراو بەڵگەنەویست، وەك جوولەکەو دیانو مەجووسیو بتپەرستو ماددەپەرست... کەواتە هەرکەسێك ئەمانە بەکافر نەزانێ هەر لەسەرەتاوە کافر دەبێ، بەڵام ئەو کۆمەڵو تاقمانەی بیردۆزەو

بۆچوونەکانیان چاك ئاشکرا نەبوو ونو خەڵکی وەك پێویست لەرێچکەو رێبازەکانیان نەگەیشتووەو رەنگە زۆر لەشوێن کەوتووەکانیشیان هەروا کوێرانەو لاساکەرەوانە دوایان کەوتبن و لەرووی بروا پێبوونو تێگەیشتنەوە نەبێ، وەك زۆربەی یان هەموو کۆمەڵو حیزب و تاقمە غەیرە ئیسلامی‌یەکانی ئەم رۆژگارە، بەڵێ... بۆ ئەمانە پێویستە زۆر ورد بینو بەئارام بین چ لەبەکافر دانانی خودی خۆیان ـ بەتێکرایی ـ وەچ لەبەکافردانانی ئەوانە کەبەکافریان دانانێن.

جاهەرکاتێك ئەم مەرجانە هاتنەدی وەبابایەکی مسوڵمان ئینکاری کرد لەکافرکردنی کافران، یان رێچکەکانیانی بەراست زانی، ئەوە بێگومان کافر بووە، چونکە ئینکاری‌نەکردنی کوفر نیشانەی بەچاك‌دانانو پێ‌رازی‌بوونیەتی‌و دەشبێتە هۆی رەت‌کردنەوەی ئینکاری‌کردنی ئەو دەقو بەڵگانەی کەئەو کافرانەو هاوڕێتانیانی پێ‌کافر دەبن، دیارە بەئینکاری‌کردنی ئەو دەقانەش دیسان کافر دەبێ.

٢ـ دۆستایەتی کردنی کافرانو نیشاندانی رامەبوون لەرێچکەکانیان:

ئەمە دووەمین شێوازی رازی‌بوونە بەکوفری کافران کەدەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی شایەتمانو لەنێوچوونی ئیمانو کافربوونی ئینسان، چونکە وەك پێشتر گوتمان مەعنای ﴿ لا إله إلا الله ﴾ بریتی‌یە لە چەسپاندنی پەرستراوێتی (الألوهية) بەتەنها بۆ خوا، لابردنی (نفیە) لەغەیری ویدا، خوای بێ‌هاوتا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾النحل (٣٦)، کەواتە: بەکتاپەرستی بەس بەوەندە پێك نایەت کەخوا (عز وجل) بپەرسترێ‌و هیچ کەس‌و هیچ شتێك لەهیچ کام لەجۆرەکانی پەرستن (عبادة) دا بەشدار نەکرێ‌و نەکرێتە هاوبەشی خوا، هەر بۆیەش لەچاکترین‌و پاکترین وشە (الكلمة الطيبة) دا وێرای بگرە پێش (إثبات)، (نفي) باس‌کراوە: ﴿ لاإله إلا الله ﴾، وەلەسوورەتی (البقرة) ش‌دا دوای (آیة الكرسي) کەگەورەترین ئایەتی قورئانە چونکە زۆربەی سیفەتە گرنگ‌و بنچینەیی‌یەکانی خوای تێدا خراونەروو، خوای بەرزو مەزن ﴿ يكفر بالطاغوت ﴾ ی پێش ﴿ يؤمن بالله ﴾ باس‌کردووە: ﴿ لاإكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى لاانفصام لها ﴾ البقرة (٢٥٦).

ئنجا ئاشکرایە کەزەقترین‌و بەرچاوترین خەسڵەتی کافران ئەوەیە کەخوا ناپەرستن یان هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن لەپەرستن‌دا.

کەواتە: ئینسانو کۆمەڵی مسوڵمان لەلایەکەوە لەسەریان پێویستە بەس خوا بپەرستن‌و

بەندایەتی بۆ بکەن، لەلایەکی دیکەشەوە لەسەریان پێویستە کوفر بە طاغوت[1] بکەن‌و خۆی لێ‌دووربگرن‌و دوژمنایەتی بکەن، وەهیچ کام لەم دووانە بەبێ ئەوەی دیکە نابێ‌و دادی ئینسان نادات، هەر بۆیەش ئەم ڕاستی‌یە لەزۆر شوێنان داکۆکی لەسەر کراوە، بۆ وێنە:

- ﴿ فاعلم أنه لاإله إلا الله ﴾ محمد (١٩).
- ﴿ فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله ﴾ البقرة (٢٥٦).
- ﴿ فإنهم عدو لي إلا رب العالمين ﴾ الشعراء (٧٧).
- ﴿ وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء أبدا حتى تؤمنوا بالله وحده ﴾ الممتحنة (٤).

بەڵێ... دینداری‌و موسڵمانەتی هەروەك چۆن خواپەرستی‌و بەندایەتی‌کردنی بۆ خوا لەسەر ئینسان پێویست دەکات، دوژمنایەتی‌کردن‌و خۆ دوورگرتن لەطاغوت‌و بتانیشی لێ دارا دەکات، هەربۆیەش دۆستایەتی‌کردنی کافران، لەهەر جۆرو پێرو تاقمێك بن، بەشێوەکانی کوفرو جۆرێك لەجۆرەکانی هەڵوەشانەوەی شایەتمان دانراوەو هەرکەسێك دۆستایەتی‌یان بکات بەهەر شێوەیەك لەجۆرو شێوەکانی دۆستایەتی (الموالاة) کەدوای تۆزێك دەیانخەینەڕوو، ئەوە بەو هەڵوێست‌و ڕەفتارەی فڕی بەسەر ئیمان‌و ئیسلامەوە نامێنی‌و بەکافر لەقەڵەم دەدرێ، مەگەر لەحاڵەتی ناچاری‌و زۆر لێ‌کردنێکی تایبەتی‌دا کەدواتر ڕوونی دەکەینەوە.

ئنجا بابەرلەوەی بچینە سەر خستنەڕووی جۆرو شێوەکانی دۆستایەتی‌کردنی کافران چەند دەقێکی قورئانی بەڕێز لەو بارەوە بێنینەوە:

- ﴿ لايتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شيء ﴾ آل‌عمران (٢٨).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا لاتتخذوا اليهود والنصارى بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فإنه منهم ان الله لايهدي القوم الظالمين فترى الذين في قلوبهم مرض يسارعون فيهم يقولون نخشى أن تصيبنا دائرة فعسى الله ان يأتي بالفتح أو أمر من عنده فيصبحوا على ما أسروا في أنفسهم نادمين ﴾ المائدة (٥١-٥٢).
- ﴿ ترى كثيرا منهم يتولون الذين كفروا لبئس ماقدمت لهم انفسهم أن سخط الله عليهم وفي العذاب هم خالدون ولو كانوا يؤمنون بالله والنبي وما أنزل إليه مااتخذوهم أولياء ولكن كثيرا منهم فاسقون ﴾ المائدة (٨٠-٨١).
- ﴿ بشر المنافقين بان لهم عذابا أليما، الذين يتخذون الكافرين أولياء من دون المؤمنين أيبتغون عندهم العزة فإن العزة لله جميعا ﴾ النساء (١٣٨-١٣٩).
- ﴿ لاتجد قوما يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولو كانوا آباءهم أو إخوانهم أو عشيرتهم أولئك كتب في قلوبهم الإيمان وأيدهم بروح

---

(١) پێشەوای تەفسیرکەران (إمام المفسرين) ئەبو جەعفەری طەبەری لەرموویەتی: (الطاغوت كل معبود سوى الله)، هەروەها (راغب الأصفهاني) یش هەروای لێك داوەتەوە.

منه ويدخلهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها رضي الله عنهم ورضوا عنه أولئك حزب الله ألا ان حزب الله هم المفلحون ﴾ المجادلة (٢٢).

- ﴿ إن الذين ارتدوا على أدبارهم من بعد ماتبين لهم الهدى الشيطان سول لهم وأملى لهم، ذلك بانهم قالوا للذين كرهوا مانزل الله سنطيعكم في بعض الأمر والله يعلم إسرارهم فكيف إذا توفتهم الملائكة يضربون وجوههم وأدبارهم، ذلك بانهم اتبعوا مااسخط الله وكرهوا رضوانه فاحبط أعمالهم ﴾ محمد (٢٥.٢٨).
- ﴿ وقد نزل عليكم في الكتاب أن إذا سمعتم آيات الله يكفر بها ويستهزأ بها فلاتقعدوا معهم حتى يخوضوا في حديث غيره إنكم إذا مثلهم ان الله جامع المنافقين والكافرين في جهنم جميعا ﴾ النساء (١٤٠).

وەك دەبینین یەك یەكی ئەم دەقانە چ‌جای تێكرایان بێ‌پەردەو بەراشكاوی ئەوە دەگەیەنن كەدۆستایەتی كردنی كافران دەبێتە هۆی لەناوبردن دەرچوونو كافربوونی ئیمانو نەمانی ئیمانی‌و هەڵوەشانەوەی بەڵێن‌و پەیمانی شایەتمانی.

وشەی (موالاة) یان (ولایة) كەدژی (معاداة) و (عداوة) ن، وەئێمە لەزمانی كوردیدا وشەی (دۆستایەتی) مان لەبری بەكارهێناوە، لەئەسڵدا لەوشەی (الولاء) داتاشراوە، (ولاء) یش یانی (الدنو والتقرب) واتە نیزیكی‌و لێ‌نزیك‌بوونەوە، (ولي) یش پێچەوانەی (عدو) ە، بڕوادارانیش دۆستانی خوا (أولياء الرحمن) ن‌و كافرانیش دۆستانی طاغووت‌و شەیتان (أولياء الطاغوت والشيطان) ن، لەسۆنگەی ئەوەوە كەكۆمەڵی یەكەم بەهۆی فەرمانبەری‌و خواپەرستی‌یەوە لەخوا نێزیكن، بەڵام دووەم بەهۆی فەرمانبەری‌و گوێ لەمستی‌یان بۆ طاغووت‌و شەیتان لەمانەوە نێزیك‌و لەخوا دوورن.

دۆستایەتی كردنی كافران (موالاة الكفار) بریتی‌یە لە لێ‌نزیك‌بوونەوەیان‌و پێشاندانی خۆشەویستی دەربارەیان بەنیازی دڵ‌و قسەی زمان‌و كردەوەی ئەندامەكان.

ئێستاش كاتی ئەوە هاتووە كەگرنگترین جۆرو شێوەكانی دۆستایەتی كردنی كافران بخەینەڕوو:

## جۆرو شێوەكانی دۆستایەتی كردنی كافران

١- شوێن كەوتنی ئارەزوو ڕێبازەكانیان: خوای زانا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم قل ان هدى الله هو الهدى ولئن اتبعت أهوائهم بعد الذي جاءك من العلم مالك من الله من ولي ولانصير ﴾ البقرة (١٢٠).

٢- بەقسەكردنیان‌و جێبەجێ كردنی نەخشەو فەرمانەكانیان: خوای پاك‌و ستایش كراو فەرموویەتی: ﴿ ياءيها الذين آمنوا إن تطيعوا الذين كفروا يردوكم على أعقابكم فتنقلبوا خاسرين ﴾ آل‌عمران (١٤٩)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وان الشياطين ليوحون

إلی أولیاءهم لیجادلوکم وان أطعتموهم إنکم لمشرکون ﴾ الأنعام (١٢١).

٣. مەیل بەلاداکردن‌و دڵ بەلاداچوونیان؛ خوای بەرزو مەزن لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ ولاترکنوا إلی الذین ظلموا فتمسکم النار ومالکم من دون الله من أولیاء ثم لاتنصرون ﴾ هود (١١٣).

٤. پێشاندانی نەرمی‌و لەگەڵ ساچاندن‌و رەفتار لەگەڵ‌کردنیان لەسەر حیسابی ئایین: وەك خوای بێ‌هاوەڵ‌و هاوتا فەرموویەتی: ﴿ لاتجد قوما یؤمنون بالله والیوم الآخر یوادون من حاد الله ورسوله ﴾ المجادلة (٢٢).

٥. پێشاندانی خۆشەویستی دەربارەیان؛ خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ لاتجد قوما یؤمنون بالله والیوم الأخر یوادون من حاد الله ورسوله ﴾ المجادلة (٢٢).

هەرکام لەم خاڵانەی خوارەوەش هەمان حوکمیان هەیە:

٦. رێزلێ‌گرتن‌و نزیك‌خستنەوەیان، بەتایبەتی لەلایەن حوکمڕانەوە: ﴿ ومن یهن الله فماله من مکرم ﴾ الحج (١٨).

٧. راوێژپێ‌کردنیان لەکاروباری گرنگ‌دا: چونکە موسڵمان دەبێ بەس راوێژ بەیەکتری بکەن لەبەڕێوەبردنی کاروباری گرنگ‌دا؛ ﴿ والذین استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شوری بینهم ﴾ الشوری (٣٨).

٨. گرتنیان بەجێگای رازو نیازو نهێنی لەلادانانیان: ﴿ یاءیها الذین آمنوا لاتتخذوا بطانة من دونکم ﴾ آل‌عمران (١١٨).

٩. یاریدەدانیان لەسەر ستەم‌و خراپە؛ ﴿ ولاتعاونوا علی الإثم والعدوان واتقوا الله إن الله شدید العقاب ﴾ المائدة (٢).

١٠. چاولێکردن‌و لاساکردنەوەیان لەرەفتارو ئاکارو خوو رەوشت‌دا؛ ﴿ یضاهئون قول الذین کفروا قاتلهم الله أنی یؤفکون ﴾ التوبة (٣٠).

١١. هاندان‌و ناچارکردنی خەڵك بۆ لاساکردنەوەو چاولێکردنیان لەشتە تایبەتی‌یەکاندا.

١٢. لێ‌خواستنی بەرنامەو پەیڕەوی ژیان‌و گوزەرانی گەل‌و جەماوەر:﴿ أفحکم الجاهلیة یبغون ومن أحسن من الله حکما لقوم یوقنون ﴾ المائدة (٥٠).

١٣. بەشداربوون لەنەخشەو پیلانەکانیاندا، جاسووسی‌و سیخوڕی بۆکردنیان‌و ئاشکراکردنیان بەکون‌رکەلێنی موسڵمانان‌و، نهێنی موسڵمان خستنە دەستیان‌و، چوونە نێو رێکخستن‌و دام‌و دەزگاکانیانەوە بەمەبەستی خزمەت پێکردنیان‌و، جەنگ‌کردن لەرێزیاندا... هتد؛ چونکە پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ من غشنا فلیس منا ومن حمل علینا السلاح فلیس منا ﴾ رواه مسلم.

١٤. گرتنیان بەئەمیندارو کارو لێ‌پرسراوێتی گرنگ پێ‌سپاردنیان، بەتایبەتی لەبوارە گرنگەکانی ژیان وەك پەروەردەو فێرکردن‌و راگەیاندن‌و سیاسەتی نێوخۆو دەرەوەو سوپاو... هتد؛ چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ولن یجعل الله للکافرین

على المؤمنين سبيلا ﴾ النساء (١٤١).

١٥. پەسەندکردن و بەپاکزانینی بیروبۆچوونەکانیان و ئەو شتانەیان کەپەیوەندییان بەکوفرەکەیانەوە هەیەو تایبەتن بەخۆیانەوە، یان بوونە دروشم و نیشانەی سەربەخۆ.

بەڵێ... هەرکەسێك هەندێك یان یەکێك لەم دیاردەو نیشانانەی تێدا بینراو بۆی بوو بەخەسڵەت و عادەت، ئەوە بەڵگەی لەسەر خۆی پەیداکردووە کەبەکوفری کافران ڕازییەو بەمەش دەچێتە ڕیزی ئەوانەوەو دەبێتە یەکێك لەوان، بە (شایەتمانێکی نوێ) و (پچڕاندنی هەر جۆرە دۆستایەتییەك لەگەڵ کافران) نەبێ لەکافربوون و دۆزەخی هەمیشەیی ڕزگاری نابێ.

بەڵام هەروەك پێشتر گوتمان حاڵەتێك لەم حوکمە گشتییە هەڵاوێرراو (مستثنى) یە کەبریتییە لەحاڵەتی ناچاری و تۆبزی لێکران (الإضطرار والإكراه)، خوای گەورەو میهرەبان لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ من كفر بالله من بعد إيمانه إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان ولكن من شرح بالكفر صدرا فعليهم غضب من الله ولهم عذاب عظيم ذلك بانهم استحبوا الحياة الدنيا على الأخرة وان الله لايهدي القوم الكافرين ﴾ النحل (١٠٦-١٠٧)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لايتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شئ إلا أن تتقوا منهم تقاة ويحذركم الله نفسه وإلى الله المصير ﴾ آل‌عمران (٢٨).

بەڵام لێرەدا نابێ لەم ڕاستییانەی خوارەوە بێ‌ئاگابین:

(أ) ئەو دۆستایەتی دەربڕینە لەحاڵەتی ناچاری و زۆرلێکراندا بەس پەیوەندیی بەقسەی سەر زمان و کردەوەی ئەندامەکانەوە هەیە، نەك دڵ و دەروون و مەیلی دڵ، چونکە تۆبزی لێکردن (الإكراه) هیچ دەسەڵاتی بەسەر دڵ (قلب) دا نییەو پێویستە دڵ هەر دامەزراو و ئارامگرتوو بێ: ﴿ وقلبه مطمئن بالإيمان ﴾.

(ب) دۆستایەتی و لایەنگری پیشاندانی بەزمان و ئەندامەکانیش بەس مۆڵەت (رخصة)ن بۆ کەسانی لاواز و خۆڕانەگر، یان حاڵەتی لاوازی و خۆڕانەگرتن، کەواتە چاکتر و پەسەندتر وایە ئینسان لای ئیرادەپتەوی (عزيمة) بگرێ ئەگەر بتوانێ و کار بەو مۆڵەتە نەکات.

(ج) ئەو مۆڵەتەش بۆ هەموو کەس نییەو ئەوانەی پلەو پایەکی بەرزیان هەیەو پێشڕەو و سەرمەشق و نموونەی ئوممەتن و نەرمی نواندنەکەیان ڕاستەوخۆ لەسەر ئیسلام و موسڵمانان حیساب دەکرێ و زۆر قورسیان لەسەر دەکەوێ لەسەریان پێویستە هەر بە (عەزیمەت) ڕەفتار بکەن.

(د) هەموو جۆرە تۆبزی لێکران و ناچارییەك ناکرێتە عوزر و بەهانە بۆ پیشاندانی ئەو دۆستایەتییە ڕواڵەتییە، بەڵکو دەبێ تۆبزی لێکران و ناچارییەکی تایبەتی بێ. ئیبنو تەیمیە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ لەو بارەوە فەرموویەتی: (تأملت المذاهب فوجدت الإكراه يختلف باختلاف المكره، فليس المعتبر في كلمات الكفر كالإكراه المعتبر في الهبة ونحوها، فإن احمد قد نص في غير موضع على أن الإكراه على الكفر لايكون إلا بالتعذيب من ضرب أو قيد، ولايكون الكلام إكراها. وقد نص على ان

المرأة لو وهبت زوجها صداقا بمسكنه فلها ان ترجع على انها لاتهب له إلا إذا خافت ان يطلقها، او يسيء عشرتها، فجعل خوف الطلاق أو سوء العشرة إكراها، ومثل هذا لايكون إكراها على الكفر، فإن الأسير إذا خشي الكفار أن يزوجوه أو أن يحولوا بينه وبين امرأته لم يبح له التكلم بكلمة الكفر)[١].

هەڵبەتە ئەوەی کەئیمام ئەحمەدو ئیبنو تەیمیە لێرەدا فەرموویانە لەو بارەوە بیروڕای هەموو زانایانی ئیسلامی لەسەرەو هەر ئەوەش لەو دەقانە دەفامرێتەوە کەلەقورئانو سوننەتدا لەو بارەوە هاتوون، بڕوێنە لەئایەتی ژمارە (٢٤) ی سوورەتی (التوبة) دا خوای دادگەر هەشت شتی باس کردوون کەنابێ خۆشویستنی هیچ کامێکیان زاڵبێ بەسەر خۆشویستنی ئیمان بۆخواو پێغەمبەرەکەیو جیهادکردن لەڕێی خوادا، واتە دروست نیە هیچ کامیان بکرێن بەعوزرو بەهانەی دانیشتنو جیهادنەکردن ﺟﺟای دۆستایەتی کافرانو پێشاندانی کوفر!! : ﴿ قل إن كان آباؤكم وأبناءكم وإخوانكم وأزواجكم وعشيرتكم وأموال اقترفتموها وتجارة تخشون كسادها ومساكن ترضونها أحب إليكم من الله ورسوله وجهاد في سبيله فتربصوا حتى ياتي الله بامره والله لايهدي القوم الفاسقين ﴾ التوبة (٢٤).

کەواتە، هیچ کام لەبەرژەوەندییەکانی دنیا وەك ماڵو سامانو خزمایەتیو پلەو پایەو نیشتیمانو... هتد ناگونجێ بکرێنە عوزرو بیانووی نێزیكبوونەوەو دۆستایەتی گرتن لەگەڵ کافراندا، وەمەبەست لەحاڵەتی ناچاریو تۆبزیلێکران (الإضطرار والإكراه) وەك زانایان فەرموویانە ئەوەیە کەئینسان ئازارو ئەشکەنجە بدرێ یان بگیرێو مەترسیی مەرگی لەپێش بێ، ئنجا وەك گوتمان هەتا لەو حاڵەتەشدا هەر خۆڕاگریو نەرمی پێشانەدان چاکترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە (خباب) ی فەرموو لەکاتێکدا چووە خزمەتیو سکاڵای لەلا کرد کەکافرەکانی مەککە ئازارو ئەشکەنجەیان دەدات: ﴿ قد كان من قبلكم يؤخذ الرجل فيحفر له في الأرض فيجعل فيها ثم ياتي بالمنشار، فيوضع على رأسه، فيجعل نصفين، ويمشط الحديد مادون لحمه وعظمه مايصده ذاك عن دينه ﴾ رواه البخاري.

هەروەها بەسەرهاتی (أصحاب الأخدود) یش کەلەسوورەتی (البروج) دا ئاماژەی پێکراوەو لە (صحيح البخاري) دا گێڕراوەتەوە هەمان مەبەست دەگەیەنێ، هەر بۆیەش (قرطبي) فەرموویەتی: (اجمع العلماء على ان من اكره على الكفر فاختار القتل انه اعظم أجرا عندالله ممن اختار الرخصة ﴾[٢].

---

(١) بڕوانە: مجموعة التوحيد، ل٢٩٧.

(٢) بڕوانە تەفسیری قورطوبی، ب١، ل١٨٨.

## دووەم: شێوازەکانی ڕازی نەبوون بەئیسلام:

١. گاڵتەکردن بەشتێك کەبەیەکێك لەشتە زانراوەکانی ئیسلام دادەنرێ:

چونکە هەرکەسێك گاڵتە بەشتێك بکاتو بەسووك سەیری بکات، مانای وایە بڕوای پێی نیەو بەڕاستو چاکی نازانێو پێی ڕازی نیە، بزرینە گاڵتەکردن بەخواو بەیەکێك لەپێغەمبەرەکانیو کتێبەکانیو فریشتەکانیو... هتد هەروەها گاڵتەکردن بەبڕواداران بەهۆی موسڵمانەتییەکەیانەوەو وێنەی ئەوانە، ئەسڵی ئەم مەسەلەیەش ئەم دوو ئایەتە بەپێزەن: ﴿ ولئن سالتهم ليقولن إنما كنا نخوض ونلعب قل أبالله وآياته ورسوله كنتم تستهزءون لاتعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم إن نعف عن طائفة نعذب طائفة بانهم كانوا مجرمين ﴾ التوبة (٦٥-٦٦).

هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانەش ئەوەبوو کەپیاوێك لەجەنگی (تەبوك) دا گوتی: (مارأينا مثل قرائنا هؤلاء، ارغب بطونا ولا اكذب السن ولا اجبن عند اللقاء. يعني رسول الله ﷺ واصحابه القراء. فقال عوف بن عبدالرحمن: كذبت ولكنك منافق لأخبرن رسول الله ﷺ، فذهب عوف إلى رسول الله ﷺ وقد ارتحل وركب ناقته فقال: يارسول الله انما كنا نخوض ونلعب ونتحدث حديث الركب نقطع به عنا الطريق، قال ابن عمر: كاني انظر إليه متعلقا بنسعة ناقة رسول الله ﷺ وان الحجارة تنكب رجليه وهو يقول: إنما كنا نخوض ونلعب، فيقول رسول الله ﴿ أبالله وآياته ورسوله تستهزؤن؟ ﴾ مايلتفت ومايزيد عليه)[1].

دیارە شێوەکانی گاڵتەپێکردنیش زۆرن، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کەهەر هەڵوێستێك بەسووکسەیرکردنو بەکەمگرتنی ئایین بگەیەنێ جابەتەنێ یان بەکردەوە وەك لاساکردنەوە، زمان دەرهێنان، لێوبادان، لووتهەڵقرچاندن، چاوتووقاندن... هتد لەکاتی قورئان خوێندن یان نوێژکردن یان باسی پێغەمبەر ﷺ یان یەکێك لەسوننەتە ئاشکرایەکانی، یان باسکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی یان یەکێك لەیاساو حوکمە زانراوو ڕوونەکانیدا، ئەوە دەکەوێتە ژێر جۆرێی گاڵتە پێکردنەوە کەیەکێکە لەدوو شێوازە هەرە زەقو بەرچاوەکانی ڕازینەبوون بەئیسلام.

٢. دووەمین جۆر لەشێوەکانی ڕازینەبوون بەئیسلام بریتییە لەپیشاندانی توورەییو نارەزاییو پێناخۆشبوون لەکاتی باسکردنی خوا، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ، یان خوێندنەوەی کتێبەکەیدا، یان باسکردنی مەسەلەیەك لەو شتانەی کەبەئاشکراو ڕوونی بەبەشێکی ئایین دانراون، چونکە خوای بەرزو مەزن لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وإذا تتلى عليهم آياتنا بينات تعرف في وجوه الذين كفروا المنكر يكادون يسطون بالذين يتلون عليهم آياتنا قل افانبئكم بشر من ذلكم النار وعدها الله الذين كفروا

---

[1] بڕوانە: تەفسیری ئیبن کەثیر، ب٢، ل٣٦٧.

وبئس المصير ﴾ الحج (٧٢)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ذلك بانهم كرهوا ماأنزل الله فاحبط أعمالهم ﴾ محمد (٩)، دیسان فەرموویەتی: ﴿ وإذا ذكر الله وحده اشمأزت قلوب الذين لايؤمنون بالآخرة ﴾ الزمر (٤٥).

## دوو مەسەلەی گرنگ:

لەکۆتایی ئەم باسەدا بەپێویستی دەزانم دوو مەسەلەی گرنگ ماون بیانخەینەڕوو

**یەکەم: وردبینیو دووربینی لەبەکافردانان (تکفیر) ی کەسێك یان کۆمەڵێکی دیاری کراو:**

خاوەنی کتێبی (شرح العقيدة الطحاوية) لەبارەوە فەرموویەتی: «إن الأقوال الباطلة المبتدعة المحرفة المتضمنة نفي ماأثبته الرسول، او إثبات ما نفاه، او الأمر بما نهى عنه، اوالنهي عما أمر به، يقال فيها الحق، ويثبت لها الوعيد الذي دلت عليه النصوص، ويبين انها كفر، ويقال من قالها فهو كافر ونحو ذلك... وأما الشخص المعين إذا قيل: هل تشهدون انه من اهل الوعيد وانه كافر؟ فهذا لانشهد عليه إلا بأمر تجوز معه الشهادة، فإنه من أعظم البغي ان يشهد على معين: ان الله لايغفر له ولايرحمه، بل يخلده في النار فان هذا حكم الكافر بعد الموت، ولأن الشخص المعين.. يمكن ان يكون مجتهدا مخطئا مغفورا، ويمكن ان يكون ممن يبلغه ماوراء ذلك من النصوص، ويمكن ان يكون له إيمان عظيم، وحسنات أوجبت له رحمة الله، كما غفر للذي قال: إذا مت فاسحقوني اذروني، ثم غفر الله له لخشيته. رواه مسلم.

لكن هذا التوقف في امر الآخرة لايمنعنا ان نعاقبه في الدنيا لمنع بدعته وان نستتيبه ان تاب وإلا قتلناه، ثم إذا كان القول في نفسه كفرا قيل انه كفر والقائل له يكفر بشروط وانتفاء الموانع...)[1].

دەتوانین لەم سێ خاڵەی خوارەوەدا ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە:

(أ) گەلێك شت هەیە دژایەتی لەگەڵ شایەتماندا هەیە، جاپێویستە هەرکەسێك لەوبارەوە شارەزاییی هەیە لەوبارەوە ئاگادار بکاتەوەو بەهەموو توانای ئەم مەسەلانە ڕوون بکاتەوەو لەقورئانو سوننەتدا بەڵگەیان لەسەر بهێنێتەوە، ئەمە بەشێکە لەڕوونکردنەوەو ڕاگەیاندنی ئایینو جۆرێکە لەفەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو، هەرکەسێك بەو کارە هەستی بەپێی پێکانو نیازی پاکی (الإصابة وخلوص النية) پاداشتی لەلای خوا هەیە.

(ب) ئەو شتانە کەدەبنە هۆی کافربوونی ئینسان لەڕووی پەوی دەلالەتیان لەسەر کوفر، جیاوازییان هەیەو هەیانە بێپێچو پەنا ئەوە دەگەیەنێ، هەشیانە بەڕاشکاوی ئەوە ناگەیەنێ بەڵام لێی دەفامرێتەوەو لێی هەڵدەهێنجرێ، ئنجا ئەمیش دوو جۆرە: جۆرێکیان بەئاسانی ئەو مەبەستەیان لێدەفامرێتەوەو ئەوەی تریشیان پێویستی

---

(1) شرح العقيدة الطحاوية، ل٣٥٧-٣٥٨.

بەوردبوونەوەو سەرنجدانی زۆر دەکات. بۆ وێنە:

کەموکوڕی پاڵدانە لای خوا، ڕەخنەگرتن لەقورئان، قسەی نەشیرین گوتن بەپێغەمبەر ﷺ، کڕنووشبردن بۆ بت، هەرکامێیان کوفرێکی بێپەردەو ئاشکران، بەڵام ڕازیبوون بەکوفر، پشتگیری کەسێك کەکوفرێك دەکات، بەردەوامبوون لەسەر دۆستایەتی کافران، ئەمانە وەك ئەمانەی پێشەوە بێپەردەو ڕاشکاو نین ئەوەندە هەیە بەئاسانی دەتوانرێ ئەوەیان لێ‌بفامرێتەوە کەهەرکەسێك ئەو جۆرە شتانەی لێ‌بوەشێتەوە دووچاری کوفر بووە.

بەڵام چەند شتێکی دیکە هەن کەبەسینایی ئەو مەبەستەیان لێ‌ناڵامرێتەوەو پێویستی بەهاتنەدی چەند مەرجێك دەکات تاکو بتوانین بیانکەینە بەڵگەو نیشانە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی لێی دەبینرێن، بۆ وێنە ئەگەر کەسێك بەشێکی قورئانی فڕێدایە نێو شوێنێکی پیسەوە، ئەوە ئەو ڕەفتارە لەزاتی خۆیدا بەرای هەموو زانایان بەکوفر دادەنرێ، چونکە لەو ڕەفتارە وەردەگیرێ کەئەو کەسە بەسووکو کەم تەماشای قورئان دەکاتو دیارە ئەمەش کوفرە. کەواتەهەرکەسێك ڕەفتارێکی وا ببینێ دەتوانێ بڵێ: ئەمە کوفرە! بەڵام ناتوانێ حوکمی کافربوون بەسەر خاوەنی ئەو ڕەفتارەدا بدات هەتا بەلای کەمەوە لەم سێ مەسەلەیە دڵنیا نەبێ:

١. ئەو کەسە کەئەو بەشەی قورئانی فڕێداوەتە نێو ئەو شوێنەوە زانیویەتی کەئەوە قورئانەو شتێکی دیکە نیە.

٢. وەدەبێ زانیبێتی کەئەو شوێنە چی‌ی لێیە.

٣. وەنابێ ناچارو زۆرلێ‌کراو (مضطر ومكره) بێك بێ کەبۆی درووستبێ ئەو کارە بکات.

(ج) دوو جۆرە حوکم لەسەر کوفرکردنی ئینسان دەچەسپێ:

یەك: <u>حوکمی دنیایی:</u> کەبریتی‌یە لەجێبەجێکردن (تنفيذ) ی هەموو ئەو جۆرە سزایانەی کەدەقەکانی ئایین دەلالەتیان لەسەر دەکەن وەك: کوژرانی ئەگەر تۆبە نەکاتو نەگەڕێتەوە، جیاکردنەوەی لەخێزانەکەی، حەرامبوونی سەربڕاوی، ژنپێنەدانی، نوێژ لەسەر نەکرانی، نەنێژرانی لەگۆڕستانی موسڵماناندا، میرات نەگرتنیو لێنەگیرانی، ئەمانە هەموویان لەم ژیانە دنیایی‌یەدا دەرهەقی جێبەجێ دەکرێن. ئەوەندە هەیە داوای تۆبەکردن لێی (الإستتابة) و کوشتنی تایبەتن بە حوکمڕانی موسڵمانانەوەو تاك تاکی موسڵمانانو کۆمەڵگاش مافی جێبەجێکردنیان نیە.

دوو: <u>حوکمی قیامەتی:</u> کەبریتی‌یە لەشایستەی بابای کافرو هەڵگەڕاوە (مرتد) بۆ مانەوەی هەمیشەییو بێبڕانەوە لەئاگری دۆزەخدا. جا ئەم حوکمە بەس خوای کاربەجێو دادگەرو پەروەردگاری خەڵکی مافی ئەوەی هەیە کەبۆ فلانکەسو فلانکەسی بڕیار بدات، وەبێجگە لەو هیچ کەس بۆی نیە ئەو حوکمە بەسەر ئینسانێکی دیاریکراودا بدات. چونکە بەس خوا دەزانێ ئایا فلان کەسو فیسار کەس جێگایان لەدۆزەخدا بۆ دیاریکراوە یان لەبەهەشتدا. بەئەوانەش کەخوا لەلایەن خۆیەوە ئاگاداری کردووینو

زانیاریی پێداون کەپێغەمبەرانن (علیهم افضل الصلوات واتم التسلیمات)، بۆ وێنە: ئەو دە (١٠) برادەرە بەرێزانەی کەمژدەی بەهەشتی پێدابوونو بە (العشرة المبشرة بالجنة) ناسراون، وەئەوانەی کەخوا لەکتێبەکەیدا یان پێغەمبەر ﷺ رای گەیاندووە کەدۆزەخین وەك (ابو لهب) کە سوورەتی (لهب) ی لەسەر هاتۆتە خوارێ.

بەڵێ... بۆمان هەیە هەروا بەکورتی بڵێین:

هەرکەسێك بڕوای بەخوا نەبێ، یان بەپێغەمبەر ﷺ، یان بەو بەو شتانەوە کەلەخواوە هێناویەتی... هتد بەهەشتی لێ قەدەغە دەکرێو بەهەمیشەیی لەدۆزەخێدا دەمێنێتەوە، بەلاَم لەمە زیاتر نابێ بگوترێ، چونکە هەر تفەنگ بەتاریکی‌یەوەنانو دەم لە (غیب) دانە، هەربۆیەش (طحاوي) لەو بارەوە فەرموویەتی «ولاتنزل احدا منهم جنة ولانارا»[1].

## دووەم: گوناح کردن بەتەنها ئینسانی پێ کافر نابێ:

زانایانی ئیسلام رەحمەتی خوایان لێ‌بێ لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەگوناحو تاوان هەرچەندە گەورەو زۆر بن مسوڵمانیان پێ کافر نابێو شایەتمانیان پێ‌هەڵناوەشێتەوە بەمەرجێك باباى گوناح‌کارو تاوانبار گوناحو تاوانەکەی بەحەلاَڵ نەزانێو دان بەهەڵەیی‌و گوناحباریی خۆی دابنێ، طەحاوی رەحمەتی خوای لەسەربێ لەو بارەوە فەرموویەتی: (نسمي أهل قبلتنا مسلمين مؤمنين ماداموا بما جاء به النبي ﷺ معترفين وله بكل ماقاله واخبر مصدقين، ولا نكفر احدا من أهل القبلة بذنب مالم يستحله، ولانقول: لايضر مع الإيمان ذنب لمن عمله... ولايخرج العبد من الإيمان إلا بجحود ما أدخله فيه)[2].

ئیمامی نەوەویش رەحمەتی خوای لێ‌بێ لەو بارەوە فەرموویەتی: (واعلم ان مذهب أهل السنة وما عليه أهل الحق من السلف والخلف ان من مات موحدا دخل الجنة قطعا على كل حال، فإن سلم من المعاصي كالصغير والمجنون والذي اتصل جنونه بالبلوغ، والتائب توبة صحيحة من الشرك أو غيره من المعاصي إذا لم يحدث معصية بعد توبته والموفق الذي لم يبتل بمعصية أصلا فكل هذا الصنف يدخلون الجنة، ولايدخلون النار أصلا لكنهم يردونها على الخلاف المعروف في الورود، والصحيح ان المراد به: المرور على الصراط، وهو منصوب على ظهر جهنم أعاذنا الله منها ومن سائر المكروه. وأما من كان له معصية ومات من غير توبة فهو في مشيئة الله تعالى فإن شاء عفا عنه وادخله الجنة أو لا وجعله كالقسم الأول، وإن شاء عذبه القدر الذي يريده سبحانه تعالى ثم يدخله الجنة فلا يخلد في النار أحد مات على التوحيد ولو عمل من المعاصي ماعمل كما إنه لايدخل الجنة أحد مات على الكفر ولو عمل من أعمال البر ماعمل هذا مختصر جامع لمذهب أهل الحق في هذه المسألة وقد تظاهرت أدلة

---

(١) بڕوانە: شەرحی عەقیدەی طەحاوی، ل٤٢٦.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٠-٣٥١، ٣٧٢.

الكتاب والسنة واجماع من يقتد به من الأمة على هذه القاعدة وتواترت بذلك نصوص تحصل العلم القطعي.فإذا تقررت هذه القاعدة حمل عليها جميع ماورد من أحاديث الباب وغيره.فإذا ورد حديث في ظاهره مخالفة وجب تأويله عليها ليجمع بين نصوص الشرع».

ئەمەی گوتراش ژمارەیەکی زۆر لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەلالەتی لەسەر دەکەن، بۆ وێنە:

- ﴿ من مات وهو يعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة ﴾ رواه مسلم.
- ﴿ أشهد ان لا إله إلا الله واني رسول الله، لايلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة ﴾ رواه مسلم.
- ﴿ ذاق طعم الإيمان من رضي بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد رسولا ﴾ رواه مسلم.
- ﴿ من قال اشهد ان لااله إلا الله وحده لاشريك له وأن محمدا عبده ورسوله وأن عيسى عبدالله وابن أمته وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه، وإن الجنة حق وان النار حق، أدخله الله من أي أبواب الجنة الثمانية شاء ﴾ متفق عليه.
- ﴿ يدخل أهل الجنة الجنة وأهل النار النار، ثم يقول الله تعالى أخرجوا من كان في قلبه مثقال حبة من خردل من إيمان ﴾ متفق عليه واللفظ للبخاري.
- ﴿ أتاني جبريل عليه السلام، فبشرني انه من مات من أمتك لايشرك بالله شيئا دخل الجنة، قلت وان زنى وإن سرق، قال: وإن زنى وإن سرق ﴾ متفق عليه.

هەڵبەتە کۆمەڵە فەرموودەیەکیش هەن کەبەڕواڵەت پێچەوانەی ئەم فەرموودانەو پێچەوانەی ئەو بنچینە (قاعدة) بەشن کەپێشتر باسکرا، کەلەهەندێکیاندا ئیمان لەو کەسانە لابراوە کەهەندێک گوناحان دەکەن، وەلەهەندێکیان وا پیشاندراوە کەپێغەمبەر ﷺ لەو کەسانە بەریە کەهەندێك جۆرە تاوانیان هەن، وەبەشێك لەو گوناح و خراپانە بەکوفرو شیرك دانراون، بۆ وێنە:

- ﴿ سباب المسلم فسوق وقتاله كفر ﴾ متفق عليه.
- ﴿ لاترجعوا بعدي كفارا! يضرب بعضكم رقبة بعض ﴾ متفق عليه.
- ﴿ من حلف بغير الله فقد أشرك ﴾ اخرجه احمد والترمذي والحاكم.
- ﴿ إثنتان من الناس هما بهم كفر: الطعن في النسب، والنياحة على الميت ﴾ رواه مسلم.
- ﴿ لايزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولايسرق السارق حين يسرق وهومؤمن، ولايشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن، والتوبة معروضة بعد ﴾ متفق عليه.
- ﴿ من حمل علينا السلاح فليس منا ومن غشنا فليس منا ﴾ رواه مسلم.
- ﴿ ليس منا من ضرب الخدود أو شق الجيوب أو دعى بدعوى الجاهلية ﴾ متفق عليه.

بەڵام جگە لە (خوارج) هیچ کەس ئەم فەرموودانەی بەپێی مەعنا ڕواڵەتی یەکەیان وەرنەگرتوون، بەڵکو تێکرای (اهل السنة) هەڵوێستیان لەئاقار ئەم جۆرە فەرموودانەدا ئەوەیە کەبەشێوەیەك مەعنایان لێك دەدەنەوە (تاویل) یان بۆ دەکەن کەلەگەڵ ئەو بنچینە گشتی (القاعدة العامة) یەی گوترا ڕێك بکەون، لەمەدا هەموویان یەکدەنگن،

بەڵام لەچۆنیەتی (تأویل) کردندا ڕایان جیا جیایە:

- هەیانە گوتوویەتی: مەبەست لەکوفر سپڵەیی و ناسوپاسی‌یە (کفران النعمة).
- وەهەیانە ڕای وایە کەمەبەست لە (کفر) و (شرك) هەڕەشەو ترساندن و گەورەکردنی ئەو خراپەو تاوانانەیە.
- ئی واشیان هەیە دەڵێ: مەبەست بەحەڵاڵ زانینی ئەو کردەوە خراپانەیە دیارە حەرام بەحەڵاڵ‌زانینیش کوفرە.
- هەشیانە فەرموویەتی: مەبەست لەو جۆرە فەرموودانە ئەوەیە کەئەم کردەوەو ڕەفتارە خراپ و ناقۆڵایانە بەری درەختی کوفرن و لەگەڵ ئیماندا ناگونجێن، بەکورتی ئەو گوناح و تاوانانە کردەوەو ڕەفتاری کافرانەن.

لەڕاستیشدا وێڕای ئەو شتانە کەگوتران، لەبەر ئەم بەڵگانەی خوارەوەش ناچارین ئەو دەقانە (تأویل) بکەین کەئەوەیان لێوەردەگیرێ: ئینسانی گوناحبار بەگوناحەکانی کافر دەبێ و لەئیسلام دەچێتە دەرێ:

(أ) ئەو هەموو فەرموودانەی کە بێ‌پێچ و پەنا بەڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنن کەخاوەن گوناح و تاوانبارەکان سەرەنجام هەر دەچنە بەهەشت و ئەگەر بشچنە دۆزەخ تێیدا هەمیشەیی نابن، وەلەهەندێك لەو فەرموودانەدا کەگوتمان باسی گوناح و تاوانی واکراوە ـ کەڕێگای چوونە بەهەشت لەخاوەنەکەی ناگرێ ـ کەزۆر لەو گوناح و خراپانە بێ‌ڕەزاترو گەورەترن کەلەهەندێك فەرموودەدا بە (کفر) ناوبراون، چونکە (زیناو دزی) زۆر پیس‌ترو گەورەترن لە تانەدان لەڕەچەڵەك (الطعن في النسب) و بەمردووهەڵاگوتن (النیاحة علی المیت) کەبەکوفر ناوبراون.

(ب) ئەگەر هاتبار ئەو گوناح و خراپانەی لەهەندێك فەرموودانەدا بەکوفرو شیرك دانراون، کوفرو شیرکی ڕاستەقینە بوونایە دەبوونە هۆی پاشگەزبوونەوە (الردة) و چوونەدەر لەئایینی خوای بەرزو مەزن، دیارە ئەو کاتەش حوکمەکەی لەدنیادا ئەوە دەبوو کەمسوڵمان لەسەری ڕێك‌کەوتوون و پێغەمبەر ﷺ لەدەقی فەرموودەی خۆیدا بڕیاری لەسەر داوە کەبریتی‌یە لەکوشتن: ﴿من بدل دینه فاقتلوه﴾ رواه البخاري.

دیان ئێمە دەبینین خوا (سبحانه وتعالی) فەرمانی کردووە کەدەستی دز ببڕین و قامچی (جلد) یش لەزیناکەرو بوختانکەر بدەین، جادیارە ئەگەر ئەوانە بەهۆی گوناحەکانیانەوە کافر بووبان، حوکمی سزاکەیان هەر کوشتن دەبوو.

(ج) ئێمە لەدەقەکانی قورئاندا دەبینین کەخوا خاوەنی گەورەترین گوناح ـ دوای شیرك ـ ی هەر بەبڕوادار داناوەو سیفەتی ئیمان و برایەتی ئیمانی بۆ بڕیار داوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ یاءیها الذین آمنوا کتب علیکم القصاص في القتلی الحر بالحر والعبد بالعبد والأنثی بالأنثی فمن عفي له من أخیه شيء فاتباع بالمعروف وأداء إلیه بإحسان ﴾ البقرة (١٧٨).

وەك دەبینین خوای کاربەجێ بابای کوژەری لەبازنەی ئیسلام دەرنەکردووەو کردوویەتی بەبرا بۆکوژراو: ﴿ فمن عفي له من أخیه شيء ﴾.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما فإن بغت إحداهما على الأخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء إلى أمر الله فإن فاءت فأصلحوا بينهما بالعدل وأقسطوا إن الله يحب المقسطين إنما المؤمنون إخوة فأصلحوا بين أخويكم ﴾ الحجرات (٩-١٠).

بەڵام شایانی باسە کە (أهل السنة) هەرچەندە وەك (خوارج) خاوەن گوناحەکان بەکافر دانانێن لەبەر ئەو بەڵگانەی کەباسکران، بەڵام وەك مورجیئە (المرجئة) کانیش ناڵێن: گوناح و تاوان هیچ زیانێکی نیە بۆ ئیمان و موسوڵمانەتی، بەڵکو دەڵێن هەروەك چۆن لەرێی خواپەرستی و چاکەکردنەوە ئیمان گەشەدەکات و زیاد دەکات، بەهۆی تاوان و خراپەشەوە کزو لاواز دەبێ و بگرە جاری وا هەیە بەردەوامبوون لەسەر خراپەو لادان مرۆڤ بەرەو هەڵدێری بێبڕوایی دەبات و بەکجاری لەبازنەی ئیسلام دەری دەکات.

کۆتایی ئەم باسەش بەم چەند قسانە دێنم:

هەرکام لەئیمان و کوفر لەدوو بەش پێکهاتوون بەوێنەی درەخت (شجرة) کەلەقەدو رەگ و ریشە لەلایەك و لق و پۆپ و گەڵا لەلایەکی دیکە پێکهاتووە، ئەسڵ و بنچینەی (ئیمان) بەش ئەو بەشە سەرەکی و گرنگەیەتی کەلەدڵ (قلب) دا جێگیر بووە ﴿ كتب في قلوبهم الإيمان ﴾ ئەویش بەڕاستزانین و دانپێداهێنان (التصديق والإقرار) ە، لق و پۆپەکانیشی کردەوەو ئاکارە چاك و پسندەکانن: ﴿ الإيمان بضع وستون شعبة أعلاها قول لا إله إلا الله وأدناها إماطة الأذى عن الطريق والحياء شعبة من الإيمان ﴾ رواه مسلم. جادیارە (ئیمان) هەتا چاکترین و بەرزترین بەشی کەئەسڵ و بنچینەکەیەتی بمێنێ، کەگوتنی ﴿ لا إله إلا الله ﴾ یە بەدڵ و زمان، ئەوە هەر دەمێنێ هەرچەندە کردەوەی چاکیشی لەگەڵ نەبێ، هەروەك چۆن درەخت هەتا رەگ و ریشەو قەدەکەی بمێنێ ئەگەر هەموو لق و پۆپ و گەڵاکانیشی لێبکرێتەوە هەر دەمێنێ. بەڵام دیارە بەناتەواوی و کەم و کورییەوە زۆرجاران لەهیشکبوون نزیك دەبێتەوە، ئەسڵ و بنچینەی کوفریش بریتییە لەبەڕاستنەزانین و دانپێدانەهێنان (التكذيب والجحود) گوناح و خراپەو تاوانەکانیش لق و پۆپەکانیەتی، جادیارە هەرکەسێك ئەسڵ و بنچینەی کوفری نەبێ ئەگەر هەموو لق و پۆپەکانیشی هەبن بەکافر دانانرێ، هەروەك چۆن کەسێك ئەسڵ و بنچینەی ئیمانی نەبێ ئەگەر هەرچی کردەوەی چاك هەیە هەیبێ. کەئەمەش مەحاڵە. بەبڕوادار و موسوڵمان دانانرێ.

■ ■ ■

تێبینی:

بۆ نووسینی ئەم بەشە سوودێکی زۆرم لەکتێبی (الإيمان) ی دکتۆر محمد نعیم یاسین وەرگرتووە، هەروەها لەکتێبی (شرح العقيدة الطحاوية).

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری بەڕێز..

ئەم بەشی چوارەمە کەبەشێکی زۆر گرنگی پڕۆژەی بەرنامەی فیکرییە، لەدوو بەندان پێکدێ؛ بەندی یەکەم بریتییە لەیازدە (١١) تێبینیی گرنگ دەربارەی جۆرو چۆنیەتی ناسینو تێگەیشتنی ئیسلام، کەهەرکام لەو تێبینییانە یاسار بنچینەیەکی گرنگە بۆ ڕاستو چاکناسینی ئیسلامو بەهەڵەدانەچوون لەوبارەوە.

لەبەندی دووەمیشدا لەحەوت خاڵاندا بەکورتی پێناسەی ئیسلاممان کردووە کەئەمانەن: تێڕوانین، بیروباوەڕ، خواپەرستی، ئەخلاق، برایەتیو کۆمەڵبوون، بانگەوازو تێکۆشان، پەیدابوونی کیانو ڕێکخستنی ژیان.

بەهیوای ئەوە کەئەو بەشەش ئەو ئامانجەی کەبۆی نووسراوە بتوانێ بیهێنێتەدیو دوای خوێندنەوەو هەزمکردنی خوێنەری بەڕێز هەست بکات کەچاکترو قووڵتر لەئایینو بەرنامەی خوای پەروەردگار کەدوایین بەرنامەو چاکترین نوسخەی هیدایەتی شیفا بەخشیەتی بۆ مرۆڤایەتی تێگەیشتووە، بێگومان یەکەمین هەنگاوو سەرەکیترین مەرجی پێگەیشتنیش چاک تێگەیشتنە.

١٩٩٣/١١/١٦

سەرچیای ماکۆک

## بەندی یەکەم:

# یازدە تێبینیی گرنگ

### تێبینیی یەکەم:

ئایین بریتییە لەو دەق (نص)انەی کەلەنێو دوو توێی قورئانو سوننەت دان:

بەڵێ ئایین - کەلێرەدا مەبەست ئایینی ئیسلامە - بەوە لەبیردۆزە مرۆڤکردەکان جوێ دەکرێتەوە کەلەڕێی وەحییەوە بۆ ئێمان هاتووە، جابێگومان بێجگە لەقورئانو سوننەت کەدوو تاقە سەرچاوەی ڕوونو بێچەندوچوونی تەواوترینو دوایین بەرنامەی خوان، هیچ سەرچاوەیەکی دیکەمان نیە کەلەڕێگای وەحییەوە هاتبێ. مادام واش بێ دروست نیە بێجگە لەدەقەکانی قورئانو سوننەت هیچ دەقێکی دیکە بەبەشێک لەئایین

بزانین و وەك (دین) هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین.

### ئەی بیندنی دووەم:

تێگەیشتن لەئایین چەندە پەیوەندیی بەعەقڵەوە هەیە هێندەش بەدڵەوە:

وەچەند لەرێی قورئانو سوننەت لەبەرکردنو کتێب خوێندنەوەو گوێ گرتنەوە تێی دەگەین هێندەش لەرێی فەرمانبەریو پابەندیو کارپێ کردنەوە، وەهەرکام لەم دوو رێیە عەقڵیو دڵی یان فیکری (نظري) و کردەیی (عملي)یە تەواوکەری یەکترنو بەجیاو تەنها بەس نین بۆ ئەو مەبەستە، کەواتە ئەوانەی کەپێیان وایە بەس بەتۆمارکردنی ئایەتەکانی خواو فەرموودەکانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لەمێشکیاندا دەتوانن لەئایینو بەرنامەی خوا حاڵی بنو بیناسن خراپ بەهەڵەداچوو ون. دیارە هۆی ئەمەش ئەوەیە کەئایین بەرنامەی خوایە بۆ رێبروونی کردنی ئینسانو رێکخستنی ژیانیو هەتا بەعەقڵو دڵو ئەندامەکانیشی (تفاعل) ی لەگەڵ نەکاتو نەیکاتە بابەت (موضوع)ی بیرو هۆشو هەستیو کردەوەو چالاکییەکانیو، بەهەموو هەستە دەریو دەروونییەکانی نەیچێژێ لێی حاڵی نابێ. چۆنیەتی ئەو چێژتنو وەرگرتنە هەمەلایەنەش بەوە دەبێ کەبەعەقڵو هۆش لەدەقەکانی ئایین تێبگەین، وەدڵیشمان هەتا دەتوانین یەکتایی خواو بەپاکگرتنیو سوپاسکردنیو شەرملێ کردنیو لێترسانیو خۆشویستنی خۆیو پێغەمبەرەکەیو شوێن کەوتووانیو بەرنامەو رێبازەکەیانی تێبگەین و بەسیفەتە بەرزو جوانەکان بیرازێنینەوە، لەهەموو خەسڵەتە بەدەکانی پاك بکەینەوە، وەئەندامەکانیشمان لەوردو درشتی جمو جۆڵو چالاکییەکانیان لەگەڵ شەرعدا راست بکەین. جائینسانی موسڵمان هەتا عەقڵی شارەزاو وریاترو دڵی پاكو بێدارترو کردەوەی چاكو راستتر بێ، پتر شایستەی ئەوەی تێدا دێتەدی کەخوا بەپلەکانی هیدایەتدا بەرزی بکاتەوەو بەناوو سیفەتە بەرزەکانی خۆیو یاساو دەستوورەکانی ئاشنای بکات.

دیارە جیاوازیی نێوان دینداریو خواپەرستیی هاوەڵە هەڵبژاردەو بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان رازی بێو شوێن کەوتووانی راستەقینەیانو خەڵکی دیکەش هەر لەم مەسەلەیەدا شێرراوەتەوە، چونکە ئەو بەرێزانە[1] بەهەموو گیانو بوونیانو بەدەرو دەروونیان لەئیسلام تێگەیشتبوون، بەڵام خەڵکی دیکە هەروا بەقسەو بەسەرزارەکی یان ئەوپەڕی بەبیروهۆشێکی وشك ئایینیان وەرگرتوەو پێشیان وایە، چونکە ئەوانیش وەك موسڵمانە رەسەنە پێشووەکان دەقەکانی قورئانو سوننەتیان لەبەرکردووەو تۆمارگای زەینیان لێپڕکردوون، گەیشتوونەتە رێزی ئەوانو کاریان تەواوە.

---

(١) واتە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووە رەسەنەکانیان، خوا لێیان رازی بێ وەك قورئان فەرموویەتی: ﴿ والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه.. ﴾ التوبة (١٠٠).

### تێبینی سێیەم:

بەرهەمو کەلەپووری زانایان جۆری تێگەیشتنی ئەوانە لەئیسلام نەك ئیسلام:

چونکە وەك لەتێبینیی یەکەمدا گوتمان جیاوازیی نێوان (ئایین)و بیروبۆچوونە ئینسانییەکان ئەوەیە کە ئایین سەرچاوەکەی (خوا) یە بەڵام بیردۆزە بۆچوونەکان بیرو هۆشی (ئینسان)ن! دیارە گۆزەش چیی تێدابێ هەر ئەوی لێدەڕژێ، مادام وابێ مەودای بەهرەمەند بوونی ئێمە لەبەرهەمو کەلەپووری زاناو پێشەوایانمان هەر ئەوەیە کەیاریدەمان دەداتو ڕێگامان بۆ ئاسان دەکات بۆ چاکترو ڕاسترو زیاتر تێگەیشتنی ئایین.

ئنجا ئەوە کەزۆربەی زانایان ئەو مەسەلانەش کەزاناو پێشەرایانی پێشینمان لەسەریان ڕێك کەوتوونو بەیەکدەنگی (إجماع) ڕایان لەسەر داون، لەدوای قورئانو سوننەتەوە دادەنێنو وەك بەشێکی ئایین ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەن، نابێ ئەوەی لێبفامرێتەوە کەئەوەی لەرێی یەکدەنگی (إجماع) ی زانایانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ کتومت وەك ئەوە وایە کەقورئانو سوننەت بڕیاری لەسەر دەدەن، بەڵکو وەك لەبەشی یەکەم (سەرچاوەی وەرگرتن) دا گوتمان هەرچەندە قورئانو سوننەت هەردووکیان سەرچاوەی هەڵهێنجانی یاساکانی ئیسلامن بەڵام یەکسانو هاوسەنگ نینو قورئان (متن)ەو سوننەت (شرح)ە، قورئان چاودێرو حاکمە بەسەر سوننەتدا، قورئانو سوننەتیش بەسەر (إجماع) دا چاودێرو حاکمنو دەتوانن بڕیارو حوکمەکانی دادگایی بکەن.

### تێبینی چوارەم:

کەدەگوترێ قورئانو سوننەت لەهەمو کاتو شوێنێکدا توانای چارەسەریی هەمو کێشەو گیروگرفتەکانو دابین کردنی تێکرای پێداویستییەکانی ژیانی تاكو کۆمەڵیان هەیە، ئەم قسەیە لەبواری بیروباوەڕ (عقیدە)و خواپەرستی (عبادة)و خوو ڕەوشت (أخلاق) چەمكو واتایەکی هەیەو، لەبوارەکانی دیکەی ژیان وەك: سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی- هتد دا، واتایەکی دیکە:

چونکە لەبواری سێ مەسەلەی یەکەمدا دەقەکانی سوننەت وردو درشتی بابەتەکانیان باس کردووەو نوختەیان لەسەر پیت داناوە بەڵام لەبواری سێ مەسەلەی دووەمدا زیاتر هەر هێڵە سەرەکیو بنچینەییەکان خراونەتەڕوو، حیکمەتی ئەم دیاردەیەش ئەوەیە کەبیروباوەڕو خواپەرستیو ڕەوشت زیاتر پەیوەندییان بەڕووحو شەخسیەتی مەعنەویی ئینسانەوە هەیە کەشتێکی خوارسكو چەسپاوو نەگۆڕە: ﴿ فطرة الله التي فطر الناس عليها لاتبديل لخلق الله ﴾ الروم (٣٠). بەڵام سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتی زیاتر پەیوەندییان بەلایەنی ماددیی ئینسانو ژیانەوە هەیە، کەبەپێچەوانەی لایەنی مەعنەوی هەم گۆڕانو گەشەکردنی زۆری بەسەرداديو هەم عەقڵو پێنج هەستەکانی مرۆڤیش پێی ئاشناترنو زیاترو چاکتر دەتوانن سەرەدەری لێبکەنو کاری تێدا بکەن.

بۆیە خوای کاربەجێ بەس بەدیاریکردنی هێڵە گشتییەکانیان رازی لێهێناوەو پڕکردنەوەی بۆشایی زۆری نێوان هێڵەکانی بۆ بیرو هۆشی ئینسان بەجێهێشتووە

کەلەڕێی بیرکردنەوەو کۆشش (إجتهاد)ەوە لەبەر تیشکی بنچینەو هێڵە گشتییەکاندا یاساو حوکم بۆ وردە بابەتەکان هەڵهێنجێ.

**تێ بینی ی پێنجەم:**

**سەنگی مەحەکی ناسینی ئیسلام و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ڕەفتارو ئاکاری پێغەمبەرو هاوەڵە بەرزو بەڕێزەکانیەتی:**

چونکە جارێ سەبارەت بەپێغەمبەر ﷺ ئەوە شتێکی ڕوونە کەلەلایەن خواوە بەتایبەت بۆ ئەوە ڕەوانە کراوە کەبەرنامەی خوا لەبەندەکانی بگەیەنێ و لەمیانە (خلال)ی ژیان و گوزەران و هەڵس و کەوت و هەڵوێستەکانیدا پێشانیان بدات و لێیان حاڵی بکات کەخواپەرستی و موسوڵمانەتی چییەو چۆنەو ئایینی خوا دەبێ چۆن بەڕێوە ببرێ. هەربۆیەش خوای کاربەجێ شوێن پێ هەڵگرتن و بەدواکەوتنی ئەو زاتە بەرزەی کردۆتە بەڵگەی ئیسپاتی بەندایەتی و خۆشویستنی خواو هۆی خۆشەویستی خوا بۆ ئینسان؛ ﴿ قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ﴾ آل عمران (٣١)، وە هەربۆیەش ئەو بەندە هەڵبژاردەو ڕەندەی خۆی کردۆتە پێشەوار سەرمەشقی هەرکەسێك کەبەئومێدی دیداری خواو پاداشتی دوارۆژە: ﴿ لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجوا الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا ﴾ الأحزاب (٢١). سەبارەت بەهاوەڵە هەڵبژاردەو بەڕێزەکانیشی دەڵێین: خوا بەهیچ کۆمەڵێکی نەفەرمووە لێیان ڕازیم ﴿ رضي الله عنهم ﴾ بێجگە لەو بەڕێزانە: ﴿ والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه وأعد لهم جنات تجري تحتها الأنهار ﴾ التوبة (١٠٠). جادیارە خواش بەس لەکەسانێك ڕازی دەبێ و ڕازییان دەکات کەبەشێوەك بژین و بەڕێوە بچن کەئەو فەرمانی پێ کردوون، مادام وابێ بەدەڵی قورئان دەسەلمێنرێ کەئەو بەڕێزانە بەشێوەیەك ڕەفتاریان کردووەو ئایینیان بەڕێوە بردووە کەخوا پێی خۆشە، کەواتە ئەوان سەنگی مەحەك و پێوەرو تەرازووی موسوڵمانەتی و بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوان.

کەواتە ئەگەر بمانەوێ بەو شێوەو چۆنیەتییە کەخوا فەرمانی پێ کردووەو پێی خۆشە ئایینی خوا بەڕێوە بەرین و بەموسوڵمانانە ژیان بەسەر بەرین پێویستە لەدوای پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ یارەو بەڕێزو وەفادارەکانی (رضي الله عنهم) بکەینە سەرمەشق و جێی سەرنج، هەر بۆیەش خوای میهرەبان ئەوانەش کەبەچاکی شوێن هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر دەکەون خستوونیە بەر ڕێژنەی ڕەحمەت و سێبەری ڕەزامەندیی خۆیەوە: ﴿ والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه ﴾ التوبة (١٠٠).

دیارە هەر لێرەشدا ئەندازەی تاوانباری و لادان و خواریی ئەوانەمان بۆ دەردەکەوێ کەهاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبوغزێنن و لەجیاتی سوپاس و ڕێزو تەقدیرو دووعای خێر بۆکردنیان بەخراپە باسیان دەکەن و دوژمنایەتییان دەکەن!! وەبەڕاستی زانار پێشەوایانی ئوممەتیش ناوی چاکیان لێناون کەپێیان گوتوون (الرافضة)!

**تێبینی ی شەشەم:**

تێگەیشتن لەقورئان‌و سوننەت بەس نیە بۆ بەڕێوەبردنی ئایین بەڵکو ناسینی ئەو واقیعەش کەدەمانەوێ ئایینی تێدا بچەسپێنین پێویستە:

بەڵێ... لەڕاستیدا هەروەك چۆن بەس بەلەبەرکردن (حفظ)ی دەقەکانی ئایین (نصوص الدین) نابینە شارەزا (فقیه) لەئاییندا، بەڵکو پێویستە بەهەرسێك هێزەکانی (عەقڵ)و (دڵ)و (جەستە)، واتە بەبیرو هۆش‌و هەست‌و عاتیفەو کردەوەو رەفتار (تفاعل)ی لەگەڵ بکەین ئنجا تێدەگەین‌و شارەزا دەبین، هەربۆیەش پێشەوامان نەیفەرمووە: ﴿ من یرید به الله خیرا یحفظه نصوص الدین ﴾!!، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ من یرید به الله خیرا یفقهه في الدین ﴾ رواه البخاري. بەڵێ جابەهەمان شێوەش بۆ بەڕێوەبردنی ئایینی خواو جێبەجێ‌کردنی فەرمانەکانی وێڕای تێگەیشتن‌و شارەزابوون لەئایین پێویستمان بەئاشنابوون‌و شارەزابوونی واقیع‌و بارودۆخی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌و فەرهەنگی‌و... هتدی ئەو گەل‌و کۆمەڵگایەش هەیە کەدەمانەوێ بیگۆڕین‌و چاکی بکەین‌و ئیسلامی تێدا بچەسپێنین. بەکورتی: وێڕای (فقه) لەئاییندا پێویستە (فقه)ی واقیعیشمان هەبێ بۆ بەڕێوەبردنی ئایین، دەنا بەمەرەدی (خوارج) دەچین‌و دەسخەڕۆ دەبین!!

**تێبینی ی حەوتەم:**

ئیسلام هیدایەتە بۆ ئینسان، پاشان بەرنامەیە بۆ ژیان:

بەڵگەی ئیسپات‌کردنی ڕاستیی ئەم مەسەلەیە چەند شتێکە:

١. لەچەند ئایەتێکدا تەعبیری: ﴿ هو الذي أرسل رسوله بالهدی ودین الحق ﴾ دووبارە بۆتەوە[1]. دیارە (دین) بەمەعنای (بەرنامە، ئایین) دێ‌و (هدی)ش یانی ڕێڕوونی‌و ڕێ‌پیشاندان.

٢. هەرکاتێك خوای کاربەجێ ویستبێتی فەرمانێك ئاراستەی بەندەکانی بکات بە ﴿ یاأیها الذین آمنوا ﴾ بانگی کردوون، ئنجا دوایی کارو فەرمانەکەی خۆی پێ‌ڕاگەیاندوون.

٣. پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ پاش بڕینی قۆناغی شاری مەککە ئنجا لەقۆناغی دووەم لەشاری مەدینەدا سەرگەرمی ڕاگەیاندنی بەرنامەو چەسپاندنی حوکمی خوا بوو، دیارە قۆناغی مەککەش تەرخان کرابوو بۆ ڕوونکردنەوەی تێڕوانین‌و بیروباوەڕی ئیسلامی، بەواتایەکی دیکە خستەڕووی ڕێڕوونی (هدایة)ی خوا بۆ خەڵکی.

کەواتە: لەنێو هەر گەل‌و کۆمەڵێکدا بویستری حوکم‌و بەرنامەی خوا جێبەجێ بکرێ‌و جم‌وجۆڵ‌و چالاکی‌یەکانی ژیانی پێ‌ڕێك بخرێ، پێویستە پێش ئەوە هەوڵ بدرێ خەڵکەکە تێڕوانین‌و بیروباوەڕی خوایی پێ‌بناسرێ‌و (هدی)ی پێ‌هەزم بکرێ، چونکە

(١) بڕوانە: التوبة (٩)، الفتح (٢٨)، الصف (٩).

ماقوول نیە ئینسان بڕوای نەبێ‌و کارو ڕەفتاری بڕوادارانەی لێ چاوەڕوان بکرێ، وەهیچ ڕێی تێ ناچێ کۆمەڵێکی موسڵمان‌و ڕێبڕوونی کراو (مهتدي) بارنەهاتبێ‌و بەرنامەی خواش ببێتە حاکم‌و دابمەزرێ! حیکمەت‌و سوودی زانینی ئەم ڕاستی‌یەش ئەوەیە کەموسڵمانان هەمیشە کاری خۆیان لەدارشتنی بناغەو پوخت کردن‌و (پیاو) دروستکردنەوە دەست پێ‌بکەن‌و، سەرگەرمی ئیشێك نەبن کەکاتی نەهاتووە‌و، وزەو کاتی خۆیان بەشتی لاوەکی‌و جۆزئی بەفیڕۆ نەدەن.

ئەوە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە زۆر ویای خۆیان بن لەگەرمەی خەبات‌و جم‌وجۆڵ‌و چالاکی‌یاندا ئەوەیان لەبیرنەچێ کەمەبەستی سەرەکی‌و کاری بنچینەیی‌یان هەر ڕێبڕوونی کردنی خەڵك‌و بەرەوخوا بردنیانە، تەنانەت مەبەست لەچەسپاندنی حوکمی ئیسلام‌و کارپێ کردنی بەرنامەکەیشی هەر هێنانە دی‌ی ئەم مەبەستەیە، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ الذين إن مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الأمور ﴾ الحج (٤١).

ئەم تێ‌بینی‌یەشم بۆیە خستەڕوو چونکە زۆر کەسی وام دیوە کەلەمەیدانی کاری ئیسلامی‌دا زیاتر وەك بابایەکی حیزبی‌و سیاسی ڕووت ڕەفتار دەکات‌و بەمەش هەم خۆشی هەم خەڵکیش گرفتاری هەڵەو پەڵەی زۆر دەکات.

## تێ‌بینی‌ی هەشتەم:

ئیسلام لەخواپەرستی‌و خەڵك‌دۆستی‌دا کورت هەڵدێ:

بەڵێ... سەرجەم دەقەکانی قورئان‌و سوننەت ئەوەیان لێ‌دەفامرێتەوە کەئەو مەبەستەی ئایین دەیەوێ لەژیانی ئینساندا، چ‌تاك چ‌کۆمەڵ، بیهێنێتە دی دوو شتن:

١. خواپەرستی بەمەعنای فراوانی ئەم وشەیە، کەئەمە خۆی حیکمەتی خوڵقێنرانی ئینسانیشە وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦).

٢. خەڵك‌دۆستی‌و چاکەکاری کەئەمیش سەنگی مەحەکی ڕاستی‌و ناڕاستی‌و ساغی‌و ناساغی‌و قرپێزکی خواپەرستی‌و دینداری‌یەو بەرهەمیشیەتی، ئەمەش چەند دەقێکی قورئان‌و سوننەت لەوبارەوە:

- ﴿ واعبدوا ربكم وافعلوا الخير لعلكم تفلحون ﴾ الحج (٧٧). دەبینین کەسەرفرازی‌و ڕزگاربوون - لەدنیاو دواڕۆژدا چونکە بەموتڵەقی هاتووە - کراوەتە میوەو بەرهەمی درەختی خواپەرستی‌و چاکەکاری.
- ﴿ إن الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون ﴾ النحل (١٢٨).
- ﴿ فاتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم ﴾ الأنفال (١).
- ﴿ ومن أحسن دينا ممن أسلم وجهه لله وهو محسن ﴾ النساء (١٢٥). دەبینین کەخوای زانا بۆ خواساغبوونەوە ﴿ أسلم وجهه لله ﴾و چاکەکاری ﴿ وهو محسن ﴾ی بەباشترین گەردن‌کەچی‌و دینداری حسێب کردووە.
- ﴿ أكثر مايدخل الناس الجنة؛ تقوى الله وحسن الخلق ﴾.

دیارە عەبدولقادری گەیلانیش ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ هەر لەبەر تیشکی ئەو دەقانەدا

بروە کەفەرموویەتی: (الدین صدق مع الحق وخلق مع الخلق) واتە: ئاینی بریتییە لەراستبوون لەگەڵ خوادا و چاکبوون لەگەڵ خەڵکی خوادا.

دیارە خەبات و جەنگیش لەپێناوی خوادا کەبەرواڵەت دژایەتی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا هەیە کەباسکرا، لەحەقیقەتدا وێڕای ئەوەی کەچاکترین جۆری خواپەرستییە[1] هەر جۆرێکیشە لەچاکەکاری و خزمەتی خەڵك، چونکە بەرگری کردن لەئاین و بەرنامەی خوا کەتاقە بەرنامەیەکە لەئینسان بپۆشێتەوە، وەلەبەینبردنی ئەوانەی دەبنە پەرچ و کۆسپ لەڕێگای گەورەترین و چاکترین جۆری خزمەتگەیاندنە بەمرۆڤایەتی، هەروەك چۆن بەگەورەترین و چاکترین جۆری خواپەرستی (عبادة)یش حسێب دەکرێ، چونکە وەك خوای زانا فەرموویەتی لەسایەی خەبات و جەنگ (جهاد)دا نەبێ پەرستگاکان دەڕووخێن، بگرە هەموو سەرزەوی تێكدەچێ: ﴿ ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع وبيع وصلوات ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا ﴾ الحج (٤٠). ﴿ ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الأرض ولكن الله ذو فضل على العالمين ﴾ البقرة (٢٥١).

## تێبینی نۆیەم:

ئیسلام بۆ یەکتاپەرستکردنی ئینسانەکان و چەسپاندنی داد لەنێوانیاندا هاتووە:

بەڵێ... چونکە یەکتاپەرستی کاکڵ و جەوهەری خواپەرستییە دادگەری (عدالة)یش کاکڵ و نێوەڕۆك و بناغەی چاکەکاری و بەختەوەربوونی ئینسانە، چونکە بەبێ خوابەیەکگرتن (توحید الله) خواپەرستی نایەتەدی و، لەسەر بنچینەی دادگەریش نەبێ چاکەکاری و خزمەتگوزاری ڕاستەقینە بنیاد نانرێ، هەربۆیەش لەقورئانیدا هیچ خەسڵەتێکی دزێو بەد هێندەی هاوبەشی پەیداکردن (الشرك) کەدژی (توحید)ە و، ستەمکاری (الظلم) کەدژی دادگەرییە هێرشیان نەکراوەتە سەر.

دیسان هەربۆیەش لەقورئانیدا هیچ شتێك نەکراوە بەمەبەستی نێکرای پێغەمبەران (علیهم افضل الصلوات وأکمل التسلیمات) بێجگە لەڕاگەیاندنی یەکتاپەرستی و چەسپاندنی دادگەری، خوای تاك و دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لا إله إلا أنا فاعبدون ﴾ الأنبياء (٢٥)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لقد أرسلنا رسلنا بالبينات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط وأنزلنا الحديد ﴾ الحديد (٢٥).

## تێبینی دەیەم:

گەورەترین هۆی دەستەدەستەیی و پەرتەوازەیی پەیڕەوانی ئاین، چاك حاڵی نەبوون و خلتە بەدڵەوە بوونە:

لەڕاستیدا بێزەوزاترین و کوشندەترین دەرد و نەخۆشی کەشوێن کەوتووانی ئاین

(1) بڕوانە لاپەڕە (١٤٢) ی ئەم کتێبە.

گیرۆدەی دەبن بریتی یە لەدەردی پەرتەوازەیی (التفرق)، چونکە گەورەترین و سەرەکی ترین بەرهەمی دینداری لەژیانی کۆمەڵدا بریتی یە لەبرایەتی و تەبایی و دڵپێکەوە جۆشدران، واتە: یەکبوون (الوحدة)، چونکە بنەماو بنچینەی ئایین خوابەیەکگرتن (التوحید)ەو ئەمیش دەبێتە هۆی پەیدابوونی یەکبوون (وحدة)، هەربۆیەش لەقورئانی دا برایەتی و یەکبوون بەخەسڵەتی سەرەکی ی شوێن کەوتووانی ئایین لەقەڵەم دراوە: ﴿ ان هذه امتکم امة واحدة وانا ربکم فاعبدون ﴾ الأنبياء (٩٢)، وەبەپێچەوانەوە تاقم تاقمێتی و لێک جیایی بەخەسڵەتی زەقی بێ بڕوا (کافر)و هاوبەش پەیداکەران (مشرکین) دانراوە: ﴿ ولاتکونوا کالذین تفرقوا واختلفوا من بعد ماجاءهم البینات وأولئك لهم عذاب عظیم، یوم تبیض وجوه وتسود وجوه فاما الذین اسودت وجوههم أکفرتم بعد إیمانکم فذوقوا العذاب بما کنتم تکفرون ﴾ آل عمران (١٠٥-١٠٦) دیسان: ﴿ ولاتکونوا من المشرکین، من الذین فرقوا دینهم وکانوا شیعا کل حزب بما لدیهم فرحون ﴾ الروم (٣١-٣٢). جابێگومان ئەم دەردە پیس و کوشندەیە گەوار میکرۆبەکەی زۆرو جۆراوجۆرەو لەگەڵێک زبڵدانانەدا پەیدا دەبێ و گەشە دەکات، بەڵام گەورەترین و سەرەکی ترین جۆری ئەو میکرۆبانە دوانن؛ یەکەمیان (چاك حاڵی نەبوون لەئایین) و دووەمیشیان (خلتە بەدڵەوەبوون)، کەیەکەمیان لەزبڵدانی کەللەیەکی نەفام (جاهل) دا پەیدا دەبێ و قراژوو دەبێ و ئەوەی دیکەشیان لەزەلکاوی دەروونێکی ناساغ (مریض)دا.

خوای میهرەبان سەبارەت بەیەکەمیان فەرموویەتی: ﴿ ومن الذین قالوا إنا نصاری اخذنا میثاقهم فنسوا حظا مما ذکروا به فاغرینا بینهم العداوة والبغضاء إلی یوم القیامة ﴾ المائدة (١٤). وەك دەبینین وازلێ هێنان و پشت گوێ خستنی بەشێك لەئایین لەلایەن نەصرانی یەکانەوە بۆتە هۆی پەیدابوون و سەرهەڵدانی دوژمنایەتی و ناکۆکی و دووبەرەکی لەنێوانیاندا. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إن الذین فرقوا دینهم وکانوا شیعا لست منهم في شئ ﴾ الأنعام (١٥٩)، لێرەشدا دەبینین کەبەش بەش کردنی ئایین ﴿ فرقوا دینهم ﴾ یەکسەر بەرهەمەکەی پەرتەوازەیی و دەستە دەستەیی ﴿ وکانوا شیعا ﴾یە!!

وەدەربارەی هۆی دووەمیشیان فەرموویەتی: ﴿ وما تفرقوا إلا من بعد ماجاءهم العلم بغیا بینهم ﴾ الشوری (١٤). لەشوێنێکی دیکەش فەرموویەتی: ﴿ کان الناس أمة واحدة فبعث الله النبیین مبشرین ومنذرین وانزل معهم الکتاب بالحق لیحکم بین الناس فیما اختلفوا فیه، وماأختلف فیه إلا الذین أتوه من بعد ماجاءتهم البینات بغیا بینهم ﴾ البقرة (٢١٣).

لەم دوو ئایەتەشدا دەبینین کەپەرتەوازەیی و لێک جیایی ی جوولەکەو دیانەکان بەتایبەتی خاوەن کتێبە ئاسمانی یەکان بەگشتی لەفێتی بێ ئاگایی نەزانراوە چونکە ﴿ من بعد ماجاءهم العلم ﴾ وە ﴿ من بعد ماجاءتهم البینات ﴾ دووچاری ئەو دەردە بوو ون. بەڵکو ئەم جارە میکرۆبی نەخۆشی یەکە بە ﴿ بغیا بینهم ﴾ لەقەڵەم دراوە. کەئەم

بەمەعنای ستەمو دەستدرێژی کردنە سەریەکەو[1] هەم بەمەعنای حەسوودیش دێ!

کەواتە ئەم جارە ماکی نەخۆشی پەرتەوازەیی لەکەللەوە پەیدانەبووە، بەڵکو لەدڵو سینەدا سەرچاوەی گرتووە!

ئێستاش نۆرەی تێبینیی یازدەیەمە کەتەواوکەری ئێرەیەو پەیوەندییەکی پتەوی بەم تێبینییەوە هەیە.

## تێبینیی یازدەیەم:

تاقە شێوەی ڕاستی یەکگرتنو بەڕێوەبردنی ئایین، گرتنی تێکڕای دینو پاکڕاگرتنی دەروونە:

چونکە مادام ماکو بنەمای پەرتەوازەییو دابڕدابڕبوونی بەرەی پەیڕەوانی ئایین بریتی بێ لە:

١. چاك لەدین حاڵینەبوون کەخراپترین جۆری گرتنی بەشێکیو وازلێهێنانی باقییەکەیەتی.

٢. خڵتە بەدڵەوەبوون کەئیرەیی‌بردن (حسد) پیسترینیەتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ إياك والحسد فإن الحسد يأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب ﴾ رواه مسلم.

بەڵێ مادام خراپ حاڵیبوون لەئایین کەئەنجامەکەی گرتنی هەندێکیو وازلێهێنانی هەندێکیەتیو دڵنەخۆشبوونو خڵتاویبوون میکرۆبی دەردی دەستە دەستەییو پەرتەوازەیین.

دیارە چاکتێگەیشتنی ئایینو پەیڕەوی کردنی تێکڕای لایەنەکانیو، پاککردنەوەو پاکڕاگرتنی دڵو دەروونیش دەرمانو چارەسەرو پارێزەری کۆمەڵی موسڵمانیشن لەو دەردە پیسو کوشندەیە، ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کەپێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی وەك لەتێبینیی پێنجەمدا گوتمان سەنگی مەحەکی ئیسلام بەرنوەبردنو موسڵمانەتین، دیارە شوێن‌کەوتنی ئەو زاتە بەرزە پارێزراو (معصوم)ەو هاوەڵە هەڵبژاردەکانی چاکترین بەڵکو تاقە پارێزەری ئێمانە لەنەخۆشیی (بدعة) کەبەپیسترین جۆری گرتنی بەشێکی ئایینو بەرهەڵداکردنی باقییەکەیەتی، جاچ بەبیانووی (تزكية) کردنی نەفسو (تصوف)ەوە بێ، چ بەبەهانەی گرنگیی (عقيدة)و چەسپاندنی (توحيد)، چ بەناوی پەروەردە (تربية)و بارهێنان چلەژێر درووشمی ڕێزگرتن لەپێشەوایانی پێشوو و گرنگیی کەلەپوورەکەیان... هتد.

بەڵێ دەرمانی بیدعەت بەس شوێنکەوتن (اتباع)ی تەواوی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانیەتی.

وەبەهۆی ساغبوونەوە (إخلاص)یش بۆ خوا لەخڵتەو ژەنگەو ژار دەروون خاوێن

---

(١) دیارە کۆمەڵێك لەنێوان خۆیاندا زوڵمو ستەم لەیەك دەکەن کەدڵو دەروونەکانیان پڕە لەرق و کینەو حەسەدو خۆبەزلگرتنو بەکەمسەیرکردنو بەدگومانیو... هتد تێدابێ.

دەبێتەوەو لەهەموو جۆرە نەخۆشییەکان دەپارێزرێ، چونکە ئیمانی یەکتاپەرست (موحد)ی راستەقینە خاوەنی دڵی ساغ (قلب سليم)ە: ﴿ وإن من شيعته لإبراهيم، إذ جاء ربه بقلب سليم ﴾ الصافات (٨٣-٨٤).

کەواتە: باهەوڵبدەین بەهۆی شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ و کردنە سەرمەشقی خۆیو هاوەڵە بەرێزەکانییەوە (خوالێیان رازیبێ) هەرچی زیاترو چاکترو راستترو قوڵترو فراوانتر لەئیسلام حاڵیبین ئنجا حاڵیبوونەکەش لەخۆماندا بکەینە حاڵ تاکو بتوانین فەرمانە گەورەو بەرزەکانی خوا جل جلاله جێبەجێبکەین کەدەفەرموێ: ﴿ واعتصموا بحبل الله جميعا ولاتفرقوا ﴾ آل عمران (١٠٣) وەدەفەرموێ: ﴿ أن أقيموا الدين ولاتتفرقوا فيه ﴾ الشورى (١٣).

بەڵێ... باوا ئیسلام بناسینو بەرێوەبەرین کەپێغەمبەر ﷺ و یاوەرە وەفادارەکانی تێی گەیشتبوونو بەرێوەیان دەبرد کەهەم تێڕوانین بوو هەم بیروباوەڕ هەم خواپەرستی بوو هەم رەوشتو خوو هەم تەقوا بوو هەم غەزا... هتد بائێمەش چیدی بەبەهانەی گرتنی بەشێکو لایەنێکی ئیسلامەوە لایەنو بەشەکانی دیکەی وازلێنەهێنین، بادڵنیابین کەئیسلام تەبیروباوەڕ (عقيدة)ی رووتە تەپەروەردە (تربية)ی بەتەنهایە، تەتەزکیەو (تصرف)ی جیا لەمشوورخواردن لەدەردی کۆمەڵگایە، تەرێکخستن (تنظيم)و کاری سیاسیی دوور لەتەقوایە، تەخواپەرستیو دنیابەکەم گرتن (الزهد) لەگەڵ خەباتو جەنگ پێکەوە دژن، تەکاروکاسبیی نێو بازار لەزیکرو پارانەوەو نوێژی نێو مزگەوتی جیایە، چونکە ئیسلام بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی تاکو کۆمەڵەو ژیانیش هەموو ئەو بوارو لایەنانەی تێدایە.

وەباهەوڵیش بدەین هەرچی چاکتر دڵو سینەمان لەژەنگو ژاری حەسوودیو ریابازیو خۆپەسندیو رقو قینو بەدگومانیو خۆبەزل گرتنو خەڵك بەکەم سەیرکردنو باقی خەسڵەتە پیسو بەدەکانی پاك بکەینەوەو پاکی رابگرین، بۆ ئەوەی شایستەی ئەوەبێ کەیەکتایی (توحيد)ی خواو بەپاك گرتنو سوپاس کردنو بەگەورەگرتنیو خۆشویستنی خۆیو پێغەمبەرەکەی ﷺ تێدا جێگیر بێو پربێ لەخۆشەویستیو رێزو بەزەییو پەرۆش بۆ موسوڵمانان.

دیارە هەر کۆمەڵێکیش بتوانن ئاوا بکەن کەگوتمان، واتە هەم چاك شوێن پێغەمبەرەکەیان بکەونو هەم باش بۆخوای خۆیان ساغ ببنەوە، دوو خەسڵەتی بەرزو والای (الإخلاص والإتباع) لەخۆیاندا بهێننەدی، ئەوە بێگومان دەبنە کۆمەڵێکی یەکگرتوو و پێکەوە جۆشدراو و زۆر باشیش دەتوانن ئایینو بەرنامەی خوا لەواقیعی ژیانی خۆیانو کۆمەڵگاکەیاندا بەرێوەبەرن.

ئالێرەشدا کۆتایی بەتێبینییەکانی خۆمان دەربارەی تێگەیشتنی ئایین (فهم الدين) دێنینو یەکسەر دەچینە سەر پێناسەکردنی ئیسلام.

■ ■ ■

بەندی دووەم:

# پێناسەکردنی ئیسلام لەچەند خاڵێکدا

ئەگەر سەرنجێکی وردو قووڵ و هەمەلایەنە لەدەقەکانی قورئان و سوننەت بدەین دەبینین ئەو ئایین و بەرنامەیەی کەلێیان پێك دێ و خوا ناوی (ئیسلام) ی بۆ هەڵبژاردووە بەریز (ترتیب) لەم حەوت بەشانەدا خۆی دەنوێنێ:

١. تێڕوانین (التصور).
٢. بیروباوەڕ (العقیدة).
٣. خواپەرستی (العبادة).
٤. خوو ڕەوشت (الأخلاق).
٥. برایەتی و پێکەوە جۆشدران.
٦. بانگەوازو تێکۆشان.
٧. پەیدابوونی کیان و ڕێکخستنی ژیان.

چونکە: بناغەو بنچینەی هەر بەرنامەیەك بریتییە لەجۆری تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی بۆ ئەم چوار مەسەلە گەورەو گرنگە: (خوا سبحانه وتعالی، ئینسان، ژیان، بوونەوەر) وەلەڕاستیدا تاقە تێڕوانینی ڕاست و درووست بریتییە لەتێڕوانینی ئیسلامییانە کەخوا بە (گەورەترین ڕاستی)[1] دادەنێ، وەوەك لەبەشی دووەم (تێڕوانین)یشدا گوتمان بەبێ دانهێنان و بڕواهێنان بەخوا، هیچ کام لەئینسان و ژیان و بوونەوەر مەعنا و حیکمەتیان نابێ و دەبنە شتی پووچ و بێئامانج، واتە هەروەك چۆن بوونی زاتیی (الوجود الذاتي) خوایە کەبوونی خوازراو (الوجود المستعار) بۆ شتان (الأشياء) پەیدا دەکات ئەگەرنا نابن، بڕواهێنانیشە بەبوونی خوا کەمەعنا و حەقیقەت و ئامانج بۆ ئینسان و ژیان و بوونەوەر پەیدا دەکات ئەگەرنا دەبنە شتی پووچ و بێحیکمەت و ناماقووڵ.

ئنجا دوای ئەوەی ئەم جۆرە تێڕوانین (التصور)ە، کەلەبەشی دووەمدا ئەختێك بەدرێژی لەسەری ڕۆیشتووین، لەعەقڵدا دەرەوشایەوەو لەدڵدا جێگیر بوو پێویست بەوە دەکات کەئینسان هەڵوێستی هەبێ و، ئەو هەڵوێستەش بریتییە لەوەرگرتن و هەزمکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی کەپایەو بنچینەکانی بریتین لە: بڕواهێنان بەخوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر.

هەرکەسێکیش بیروباوەڕی ئیسلامی بەعەقڵ و دڵ وەربگرێ و بەسەلمێنێ، بەبێ دوا کەوتن ملی ڕێگای بەندایەتیکردن و خواپەرستن دەگرێ و هەوڵ دەدات سۆزی

(١) دەربارەی بوونی خوای پەروەردگار کتێبێکم بەم ناوەوە نووسیوە.

خواپەرستی (عبادة) بەهەموو وردو درشتی جموجۆڵو چالاکییەکانی ژیانی ماددیو مەعنەویو تاکیو کۆمەڵییەوە بنێو ویردی: ﴿ إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين. لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين ﴾ الأنعام (١٦٢-١٦٣) بەعەقڵو دڵو زمانو هەموو ئەندامەکانی بخوێنێو بەشی غەیری خوای پێوە نەمێنێ.

ئنجا گەورەترینو چاکترین بەرهەمی خواپەرستیش بریتییە لە: خوو ڕەوشتی جوان (حسن الخلق)، هەربۆیەش خوای زانا گەورەترینو چاکترین بەندە (عبد)ی خۆی کەمحەممەدە ﷺ بەخوو ڕەوشتی مەزن مەدح کردووە: ﴿ وإنك لعلى خلق عظيم ﴾ القلم (٤).

دیارە هەر کۆمەڵ (جماعة)ێکیش یەك بەکی ئەندامەکانی خاوەنی تێڕوانین بیروباوەڕو خواپەرستیو خوو ڕەوشتی ئیسلامییانە بن شتێکی زۆر سروشتییو چاوەڕوانکراوە کەلەسەر بنچینەی پتەوی برایەتی (الأخوة) کۆبنەوەو دڵیان پێکەوە جۆش بدرێو وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ كالبنيان يشد بعضه بعضا ﴾ رواه مسلم. هەڵبەتە کۆمەڵێکی ئاوەها دڵیان قەناعەت ناکاتو چاویان بەرایی نادات کەکۆمەڵگاو دەوروبەریان لەشەڕەزەنگی نەفامیو ستەمو خراپەو تاراندا بخولێنەوەو لەزەلکاوی ڕێچکەو بیردۆزەو فێڵو پیلانەکانی شەیتانو شەیتانییەکاندا بتلێنەوە، بەڵکو بەدەست گەرمی خەریکی چاکی کردنو تێگەیاندنی خەڵك دەبن لەئایینی خواو بەرەو خواو سەربەرزیو بەختیاریی ئیرەو ئەولا بانگیان دەکەنو، هەرکەسێکیش بوو بەگاشە بەردی بەردەمی سەرچاوەو نەیهێشت ئامادەی بەهرە وەرگرتن بوو لەهیدایەتی خواو نەریتگای خەڵکیشی دەدا، بەگورجی کرینو باریەی لێ دەست دەدەنو وردو خاشی دەکەن و ڕێگای پێ چۆڵ دەکەن!

ئیدی هەروا کۆمەڵی خوا لەبانگەوازو هەموو جۆرو شێوەکانی خەباتدا بەبێ پشوو بەردەوام دەبێ هەتا سەرەنجام پارمەتیی خوای بۆ دێو واقیع دەگۆڕێو لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگادا یاساو دەستوورەکانی شەرع دێنێتە گۆڕێو وردو درشت بەپێی حوکمو بەرنامەی خوا ڕێك دەخات!!

جائێستا کەچۆنیەتیی ڕیزبوونو پەیوەندی پێکەوە هەبوونی ئەم حەوت بەشەمان ڕوون کردەوە، باهەروا بەکورتیو یەکە بەیەکە چاوێك بەهەر کامێکیاندا بخشێنین:

## یەکەم: تێڕوانین:

مەبەست لەتێڕوانین جۆرو چۆنیەتی دیتنو ناسینی بوون (وجود)ە. جادیارە تەنە تێڕوانینی ڕاستو درووستو پڕ بەپێستی واقیعی بوون، تێڕوانینی ئیسلامییە، وەبۆیەش ئەم مەسەلەیەمان کردە یەکەمین بەشی بەرنامەو ئایینی خواو، بەبیروباوەڕ دەستمان پێ نەکرد هەرچەندە بەرواڵەت بیروباوەڕ لەپێشترەو بناغەو بنچینەی ئیسلامەتییە، چونکە

ئەگەرچی بەپلەو پایەو لەڕووی گرنگییەوە بیروباوەڕ پێش تێڕوانین بکەوێ بەڵام لەڕووی ڕیزبوونی کاتی (الترتیب الزمني)یەوە تێڕوانین پێش دەکەوێ لەبەر ئەوەی بیروباوەڕ بریتییە لەهەڵوێستی ئینسان لەبەرانبەر بوون (وجود)دا، جادیارە بەر لەناسینی بوون (خوا، بوونەوەر، ژیان، ئینسان) هەڵوێست نواندن لەئاکاریدا شتێکی نەگونجاوە، بەڵێ وەك گوتراوە: (الحکم علی الشیء فرع من تصوره).

جالەبەر ئەوەی لەبەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا تارادەیەك مەسەلەی تێڕوانینمان تاوتوێ کردووە، لێرەدا لێی نادوێین و خوێنەران حەواڵەی ئەوێ دەکەین[1].

### دووەم: بیروباوەڕ:

بیروباوەڕ (عقیدة)ی ئیسلامییانە ئەنجامی سروشتی و مەنتیقیی تێڕوانینی ئیسلامییانەیە، واتە هەرکەسێك بەو شێوەیەی کەئیسلام دەڵێ خۆی و خوا و بوونەوەر و دەوروبەری ناسی حەتمەن ئەو هەڵوێستە فیکرییەی ئیسلامیش هەڵدەبژێرێ بۆ جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی بەستن و ڕەفتارکردن لەگەڵ بوون (وجود)دا.

جالەبەر ئەوەی بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەشمان بۆ ڕوونکردنەوەی (بیروباوەڕ)ی ئیسلامی تەرخان کردووە، بەپێویستی نازانین لێرەدا بیتوێژینەوە، بەڵام بەپێویستی دەزانم ئەوەندە تەئکید بکەمەوە کە (بیروباوەڕ) لەئیسلامدا، وەك ڕەگ و ڕیشە بۆ درەخت و بناغە بۆ دیوار و ئێسکە پەیکەر (الهیکل العظمي) بۆ جەستە وایە، ئاشکراشە کەبوونی درەخت بەبێ ڕەگ و ڕیشەو دیوار بەبێ بناغەو جەستە بەبێ ئێسکە پەیکەر شتێکی مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە گومانی تێدا نیە کەمرۆڤانێتییەکی تێر و تەواو و تەلەخشاو لەکەسێك چاوەڕوان ناکرێ کەبیر و باوەڕێکی لاواز و لەرزۆك و ناتەواوی هەیە، هەروەك چۆن درەختێکی هێند ئەستوور و لق و پۆپ و گەڵا چڕوپڕ لەسەر ڕەگ و ڕیشەیەکی بێهێز و نەخۆش ڕاناوەستێ.

### سێیەم: خواپەرستی (العبادة):

خواپەرستی (العبادة) بەرهەمی سروشتی و ڕاستەوخۆی (بیروباوەڕ)ە، چونکە هەرکەسێك بەو شێوەیە کەئیسلام دەڵێ خوا بناسێ و بڕوای پێی هەبێ، ئەو ناسین و بڕوا پێبوونەی وای لێدەکات ببێتە بەندەیەکی وەفادار و بەئەمەك بۆ خوای پەروەردگاری و گەورەترین و بەرزترین ئامانج و مەبەستی ببێتە وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی ئەو لەگەڵ گەورەترین ئینسان و سەروەری پێغەمبەراندا ﷺ بڵێ: ﴿ إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين ﴾ الأنعام

---

(١) شەهیدی ئیسلام (سید قطب) لەدوو کتێبی (خصائص التصور الإسلامي) و (مقومات التصور الإسلامي) دا چاك مەسەلەی (تێڕوانین)ی توێژیوەتەوە.

(١٦٢-١٦٣). ئنجا شایانی باسیشە کەبەندایەتیو خواپەرستی چاکترینو جوانترینو گەورەترین خەسڵەتی مرۆڤەو ئینسان هەتا لەو بوارەدا زیاتر بەرەو پێش بچێو خواپەرستو بەندەیەکی ڕاستترو ساغتربێ زیاتر لەخوا نزیك دەبێتەوەو ڕێزو حورمەتی پتر دەبێو چاکتر لەلای بەرز دەبێتەوە، هەربۆیەش خوای کاربەجێ لەبەرزترین پایەو پیرۆزترین حاڵەتدا کەشەوڕۆ و بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج) بوو چاکترین بەندەو گەورەترین پێغەمبەری خۆی (محمد ﷺ) بەخەسڵەتی بەندایەتی ناوبردووە، ﴿ سبحان الذي أسرى بعبده ليلا من المسجد الحرام إلى المسجد الأقصى الذي باركنا حوله لنريه من آياتنا ﴾ الإسراء (١).

بەڵێ... خواپەرستیو بەندایەتی کردن بۆ خوا گەورەترینو چاکترین خەسڵەتی ئینسانەو حیکمەتو هۆی خولقێنرانیشیەتی وەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦). کەواتە: هەرچەندە وشەی خواپەرستی (عبادة) لەئیسلامدا زیاتر بۆ چوار دروشمەکانو هەندێك شتی دیکە بەکاردێ، بەڵام چەمكو واتایەکی فراوانتریشی هەیە کەبریتییە لە (جێگیربوونی ئەوپەڕی بەگەورەگرتنو خۆشویستنو ترسو سامو شەرمو ڕێز سەبارەت بەخوا لەدڵدا بەجۆرێك کەوا هەموو بیرو خولیاکانی مێشكو هەستو نەستەکانی دڵو وشەو ڕستەکانی زمانو جموجۆڵی ئەندامەکان هۆی ئیخلاصیان پێوەبێو بەگوێرەی شەرعی خوا بێو دەروودەروون (ظاهر وباطن)ی ئینسان لەهەموو بوارەکانی مەعنەویو فەرهەنگیو سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیدا ساغو یەکلا ببێتەوە بۆ خواو بەپێی بەرنامەی خوا بەڕێوە بچێ).

کەواتە کاکڵو جەوهەری خواپەرستی ئەوەیە کەبەس خوا بپەرستریو بەس بەو شێوەیەش بپەرستری کەبۆخۆی دیاری کردووە، هەربۆیەش هاوبەشپەیداکردن (الشرك)و شتی تازە لەئاییندا داهێنانو دروستکردن (البدعة) دوو میکرۆبو دەردی هەرە پیسی کەتووشی خواپەرستی دەبن. چونکە (شرك) کەیەکێ لەجۆرەکانی (ریاباری)یە دژی بەس خواپەرستن (التوحيد)ە. (بدعة)یش لاڕێبوونە لەو شێوەو چۆنیەتییەی کەخوا دیاری کردووە بۆ پەرستنی خۆی، دیارە بەهۆی بۆخواساغبوون (الإخلاص لله)وە لەهەموو جۆرەکانی هاوبەشپەیداکردن ڕزگارمان دەبێو بەهۆی شوێنپێی پێغەمبەر هەڵگرتن (إتباع الرسول)یشەوە لەهەموو شێوەکانی بیدعەت قوتارمان دەبێ، بۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ ومن أحسن دينا ممن أسلم وجهه لله وهو محسن ﴾ النساء (١٢٥). وەهەر بۆیەش (فضيل بن عياض) لەتەفسیری ﴿ ليبلوكم أيكم أحسن عملا ﴾ الملك (٢)دا فەرموویەتی (أحسن عملا: أي أخلصه وأصوبه) پاشان (وأخلصه)ی بەوە لێكداوەتەوە کە (ساغترو بێگەردتر بێ بۆ خوا)و (أصوبه)یشی بەوە لێك داوەتەوە کە (ڕاستتر بێو چاکتر بەپێی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێ).

ئیدی بەئومێدی ئەوەی کەهەرچی زیاترو چاکتر بۆخوا ساغببینەوەو بەدوای پێغەمبەر بکەوین هەتا ڕامان لێدێ بەشی غەیری خوامان پێوە نامێنێو هێندەی نووکی دەرزیش

سەرپێچی و گوێنەدان بەسوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ تێدا نامێنێ. کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودە بەرزو پیرۆزەی خوا دێنم کەلەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویەتی:

قال رسول الله ﷺ إن الله تعالى قال: ﴿ من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضت عليه، ومايزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به ويده التي يبطش بها ورجله الذي يمشي به وإن سألني أعطيته ولئن استعاذني لأعيذنه ﴾ رواه البخاري عن أبي هريرة رضي الله عنهما[1].

## چوارەم: خوو ورەوشت (الاخلاق):

هەروەك چۆن خواپەرستی میوەو بەرهەمی بیروباوەڕی ئیسلامییانەو سەنگی مەحەك و تەرازووشیەتی، خوو ورەوشتی جوانو بەرزیش زادەو بەرهەمی خواپەرستنەو پێوەرو تەرازووی پێ ناسینو هەڵسەنگاندنیشیەتی.

بەڵێ... هەروەك چۆن هەتا بیروباوەڕ ساغترو دامەزراوترین خواپەرستیو بەندایەتی خواکردنیش راستترو چاکتر دەبێ، جوانیو بەرزی خوو رەوشتیش پەیوەندییەکی راستەوانەی بەراستیو بێخلەڵی خواپەرستیەوە هەیە.

دیارە مەبەستیش لەخوو رەوشت ئەو ئەدەبو خەسڵەتە پەسەندو دڵگیرانەن کەدەرو دەروونی ئینسان دەرازێننەوەو شیرینو سەنگینی دەکەن، وای لێدەکەن کەبەچاکترین شێوە لەگەڵ خۆیو خواو خەڵك و دەوروبەرو بوونەوەردا رەفتار بکات و، لەهیچ کام لەو پێنج بوارەدا کردەوەو هەڵوێستێکی وای لێنەپێشکوێتەوە کە لەگەڵ رەزامەندیی خوادا نەگونجیو پێی لەکەدار بێ.

جادیارە کەنووێژینەوەی مەسەلەی خوو رەوشت پێویستی بەوە دەکات کەلەشوێنێکی تەرخانکراودا ئەنجام بدرێ[2] بۆیە لێرەدا بەختەتەرەوەی چەند خاڵێك واز لەنووێژینەوەی ئەم بابەتە گرنگە دێنین:

١. پاریزکاریو رەوشت چاکی گەورەترین هۆن بۆ چوونە بەهەشت:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ واعبدوا ربكم وافعلوا الخير لعلكم تفلحون ﴾ الحج (٧٧). پێغەمبەریشمان ﷺ لەوەڵامی کەسێکدا کەلێی پرسی: چ شتێك دەبێتە مایەی چوونە بەهەشت؟ فەرمووی: ﴿ تقوى الله وحسن الخلق ﴾ رواه الترمذي وحسنه.

---

(١) تێبینی: ئێمە سوپاس بۆخوا لەنووسراوێکی سەربەخۆدا بەدرێژی باسی خواپەرستیمان کردووە.

(٢) لەنووسراوێکی دیکەشدا مەسەلەی خوو رەوشتمان تارادەیەکی باش باس کردووە.

٢. ڕەوشتی چاك قورسترین شتە لەتەرازووی ڕۆژی دواییدا:
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ما من شيء أثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من خلق حسن ﴾ رواه أبو داود والترمذي وصححه.

٣. ئینسان هەتا ڕەوشتی جوانتر بێ لەدوارۆژدا لەپێغەمبەر ﷺ نزیكترە:
هەروەك خۆشەویستمان لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ إن أحبكم إلي وأقربكم مني مجلسا يوم القيامة أحاسنكم أخلاقا وإن أبغضكم إلي وأبعدكم مني مجلسا يوم القيامة مساويكم أخلاقا ﴾ رواه احمد وابن حبان والطبراني وقال المنذري رواته رواة صحيح.

٤. خواپەرستی ئەگەر مرۆڤ لەڕەوشتی بەدو خراپەكاری نەگێڕێتەوە بەپووچ و فڕێدراو دادەنرێ:
خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ أرأيت الذي يكذب بالدين فذلك الذي يدع اليتيم ولايحض على طعام المسكين فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون ﴾ الماعون (١-٥). هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إن الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر ﴾ العنكبوت (٤٥). كەواتە: نوێژ كەگەورەترین جۆری خواپەرستی شەخصییە، هەر هێندە بەنوێژ لەقەڵەم دەدرێ كەبێتە هۆی گێڕانەوەی ئینسان لەخراپەو شتی ناڕەوا.

٥. خوو ڕەوشتی خراپ نیشانەی دەغەڵی و ناپاكییە:
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ أربع من كن فيه كان منافقا خالصا ومن كانت فيه خصلة فيهن كانت فيه خصلة من نفاق حتى يدعها: إذا ائتمن خان، وإذا حدث كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر ﴾ متفق عليه.

٦. برواداری و موسوڵمانێتی لەگەڵ ڕەوشتی بەدو خراپدا ناگونجێن:
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ليس المؤمن بالطعان ولااللعان ولاالفاحش ولاالبذي ﴾ رواه الترمذي وحسنه. وەفەرموویەتی: ﴿ المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده والمهاجر من هاجر مانهى الله عنه ﴾ متفق عليه.

٧. ئینسان هەتا ڕەوشتی چاكتربێ بڕوای تەواوترە:
چونكە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا ﴾ رواه الترمذي وصححه. وەفەرموویەتی: ﴿ إن من خيركم أحسنكم أخلاقا ﴾ متفق عليه.

٨- پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لەهەموو کەس ڕەوشتی بەرزترو چاکتر بووە:
چونکە خوا لەمەدحیدا فەرموویەتی: ﴿ وإنك لعلى خلق عظيم ﴾ القلم (٤). وە:
﴿ عن أنس رضي الله عنه قال: كان رسول الله ﷺ أحسن الناس خلقا ﴾ متفق عليه.

٩- ڕەوشتی بەرزو جوان هاوتای گەورەترین جۆرە خواپەرستییە:
عن عائشة رضي الله تعالى عنها قالت سمعت رسول الله ﷺ يقول: ﴿ ان المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة القائم الصائم ﴾ رواه ابوداود.

١٠- خوو وخدەی خراپ دەبێتە هۆی لابردنو شۆردنەوەی چاکەو خێر:
خوای بێهاوتا فەرموویەتی: ﴿ ..لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى.. ﴾ البقرة (٢٦٤). پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ سباب المسلم فسوق وقتاله كفر ﴾ متفق عليه.

## پێنجەم: برایەتیو پێکەوە جۆشدران:

هەرکاتێك کۆمەڵە موسڵمانێك پەیدابوون کەئەو تاکیان خاوەنی (تێڕوانینو بیروباوەڕو خواپەرستیو خوو ڕەوشتی) ئیسلامیانە بوون ئەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەبنە براو خۆشەویستی یەکترو دڵیان پێکەوە گرێ دەدرێو وەك خشتی دیوار پێکەوە جۆش دەدرێن، چونکە کۆمەڵە ئیمانێك کەهەموویان بەس خوا بە بە یەهێنەرو پەروەردگاری خۆیانو، تەنی موحەممەد بەپێشەواو رابەرو، ئیسلام بەبەرنامەی ژیانو، قیبلەو ڕەزامەندیی خوا بەمەبەستو، چەسپاندنی حوکمی خوا بەئامانجو، بەندایەتی کردن بەئەرکی سەرشانیان دەزانن، ئەوسەدن دەبنە خاوەنی یەك دڵو دەنگو ڕەنگو ریزیش، چونکە یەکبوونیان لەپەرستراو (معبود)و پێشەواو بەرنامەو رووگەو ئامانجو مەبەستو ئیشدا دەبێتە هۆی یەکبوونو یەکگرتنیان لەنێو خۆیاندا.
هەڵبەتە شتێکی ئاسایی و چاوەڕوان کراویشە کەکۆمەڵە خشتێك کەهەموویان بەیەك قاڵب داڕێژراونو بەیەك شێوە درووست کراون، زۆر چاك هەموویان پێ لەیەك بەدرێو قایمترین خانوویان لێ درووست بکرێ!
دەقی قورئانو سوننەتیش لەو بارەوە یەکجار زۆرن بۆ وێنە:

- ﴿ ياأيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن إلا وأنتم مسلمون. واعتصموا بحبل الله جميعا ولاتفرقوا.. ﴾ آل عمران (١٠٢-١٠٣)م
- ﴿ إنما المؤمنون إخوة فاصلحوا بين أخويكم.. ﴾ الحجرات (١٠).
- ﴿ فاتقوا الله واصلحو ذات بينكم.. ﴾ الأنفال (١).
- إن الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا كأنهم بنيان مرصوص : الصف (٤).
- عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: ﴿ لاتدخلوا الجنة حتى

تؤمنوا ولاتؤمنوا حتى تحابوا، ألا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم ﴾ رواه مسلم.

- ﴿ المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا، وشبك أصابعه ﴾ متفق عليه.
- ﴿ مثل المؤمنين في توادهم وتعاطفهم وتراحمهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى ﴾ متفق عليه.

ئنجا ئەگەر سەرنجێکی ورد لەهەر چوار دروشمە بنەڕەتیی و گرنگەکانی ئیسلام لەنوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج بدەین، دەبینین یەکێتیی و یەکسانی و پێکەوە پەیوەستیی موسڵمانانیان وەک مانگی چواردە تێدا دەدرەوشێتەوە، چونکە:

لەنوێژدا پاڵ لێکدان و یەکڕیزی و یەک ئامانجی و ڕێکوپێکی (نظام) و گەورەو گچکەیی و گوێ گرتن و فەرمانبەری (السمع والطاعة) و یەکسانی و یەکدەنگی و یەک دڵی و... بەشێوەیەکی واقیعی و کردەیی دەبینرێ و، لەڕۆژوو گرتندا بەتایبەتی ڕەمەزان، یەکسانیی و بەشداری یەکتر کردن لەتینوێتیی و برسێتیدا و خۆراکیان و فەرمان بەجێ هێنان و... هتد دەبینرێ، لەزەکات داندا بەزەیی بەیەکتردا هاتنەوەو یارمەتی و هاوکاری و هەتەنگ یەکەوەبوون و... هتد دێتە بەرچاو، لەحەجیشدا کەهەموو موسڵمانان یەک جۆرە بەرگ و پۆشاک دەبەر دەکەن و یەک جۆرە سروود دەڵێنەوە: ﴿ لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك، لاشريك لك لبيك ﴾ و لەیەک کاتدا لەسەر عەرەفات ڕادەوەستن و بەدەوری یەک کەعبەدا دەسوڕێنەوەو... هتد وەک ڕۆژی ڕووناک بەڕوونی کردەوەو حاڵی موسڵمانان ڕای دەگەیەنن کەبەندەی یەک خواو شوێن کەوتووی یەک پێشەواو وەچەی یەک ئادەم و حەواو عەودالی یەک ئامانج و هیوان.

## شەشەم، بانگەوازو تێکۆشان ( الدعوة والجهاد ):

ئیسلام پەیڕەوو بەرنامەی ژیانی تاک و کۆمەڵەو بۆیە هاتووە کەواقیعی حاڵی کۆمەڵگا چاک بکات و بگۆڕێ، لەکوفرەوە بۆ ئیمان، لەستەمەوە بۆ داد، لەخراپەوە بۆ چاکە، لەنەفامانەوە بۆ زانست، لەجێمانەوە بۆ بەرەوپێش چوون، لەزەبوونییەوە بۆ عیززەتمەندی، لەهەژارییەوە بۆ دەوڵەمەندیی و بەکورتی لەنەفامی (جاهلية)یەوە بۆ ئیسلام: ﴿ أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون ﴾ المائدة: (٥٠). بۆیە هەرکاتێک کۆمەڵی موسڵمانان خوایان ناسی و خۆیان دۆزییەوەو تێگەیشتن و پێگەیشتن، دەزانن کەئەم ژیانە دنیاییە جێگای ئیسراحەت و ئاسوودەیی و ڕابواردن نییە بەڵکو شوێنی تاقی کردنەوەو ڕەنج دان و کارکردنە، ئیدی چاککردن و گۆڕینی خەڵک و دەوروبەر دەبێتە خولیاو ئاواتیان و دەست بەکار دەبن.

ئاشکراشە کەبۆ گۆڕین و چاککردنی هەر کۆمەڵگایەک هەنگاوو قۆناغی یەکەم بانگەوازو تێگەیاندن و حاڵی کردنیەتی کەلەڕاستیدا ئەمیش هەر جۆرێکە لەتێکۆشان

(جهاد)و پاشان جۆرو شێوەکانی دیکەی خەبات. تێکۆشان دێنە پێش. کەجەنگەو حەباتی چەکداری گەورەترین و بەرزترینیانەو. هەر ئەمیشە کەپێغەمبەر ﷺ بە لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلامی داناوەو فەرموویەتی: ﴿ وذروة سنامه الجهاد ﴾.

شایانی باسیشە کەزۆربەی یان تێکرای زانایان لەسەر ئەوەن کەجیهاد گەورەترین جۆرە خواپەرستیی کۆمەڵی (العبادة الجماعية) یە هەروەك چۆن نوێژ گەورەترین جۆرە خواپەرستیی شەخسییە، ئنجا بالەچەند خاڵێكدا بەکورتی باسی هەرکام لەبانگەوازو تێکۆشان بکەین:

## یەکەم: بانگەواز:

١. بانگەوازو خەڵك تێگەیاندن لەبەرنامەو ئایینی خوا هەر جۆرێکە لەجۆرەکانی تێکۆشان:

چونکە خوای زانا بەپێغەمبەر ﷺ ی فەرموو: ﴿ فلا تطع الكافرين وجاهدهم به جهادا كبيرا ﴾ الفرقان (٥٢). دیارە سوورەتی (الفرقان) مەککییەو راناوی سەر ﴿ جاهدهم به ﴾یش بەرای تێکرای توێژەرەوانی قورئان دەگەڕێتەوە بۆ قورئان. کەدیارە مەبەست لەو جۆرە (جهاد)ە تێگەیاندنو حاڵی کردنیانە.

پێغەمبەرەکەمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسنتكم ﴾ رواه أبو داود بإسناد صحيح.

٢. خەڵك بانگ کردن بۆ لای خواو حاڵی کردنیان لەئایینی خوا کردەوەیەکی یەکجار گەورەیە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ من دل على خير فله مثل أجر فاعله ﴾ رواه مسلم. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ من دعى إلى هدى كان له من الأجر مثل أجور من تبعه لاينقص ذلك من أجورهم شيئا ﴾ رواه مسلم. دیسان فەرموویەتی: ﴿ فوالله لأن يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم ﴾ متفق عليه.

٣. چاکترینو پیرۆزترین قسە، قسەی کەسێکە کەخەڵکی بانگ دەکاتە لای خوا:

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ ومن أحسن قولا ممن دعى إلى الله وعمل صالحا وقال إنني من المسلمين ﴾ فصلت (٣٣). هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ولتكن منكم أمة يدعون إلى الخير. وأولئك هم المفلحون ﴾ آل عمران (١٠٤).

٤. بانگەوازکردن بۆ ئیسلام پێویستە لەسەر بنچینەی تێگەیشتنو لەبەر رۆشنایی دا بێ:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قل هذه سبيلي أدعوا إلى الله على بصيرة أنا ومن

اتبعني ﴾ يوسف (١٠٨). ﴿ ولاتقف ماليس لك به علم إن السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسئولا ﴾ الإسراء (٣٦).

٥. خەڵك بانگكردنو تێگەیاندنیان لەئیسلام پێویستە بەلێزانی بێ:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أدع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن ﴾ النحل (١٢٥).

## دووەم: جیهاد:

٦. خەباتی چەكدارانە گەورەترینو چاكترین كردەوەیە لەئیسلامدا:

- خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ أجعلتم سقاية الحاج وعمارة المسجد الحرام كمن آمن بالله واليوم الآخر وجاهد في سبيل الله؟ لايستون عندالله والله لايهدي القوم الظالمين ﴾ التوبة (١٩).
- عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سئل رسول الله ﷺ: اي العمل افضل؟ قال: ﴿ إيمان بالله ورسوله، قيل ثم ماذا؟ قال: الجهاد في سبيل الله ﴾ متفق عليه.
- وعن ابي ذر رضي الله عنه قال: قلت يارسول الله أي العمل افضل؟ قال: ﴿ الإيمان بالله والجهاد في سبيله ﴾ متفق عليه.
- وعن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه قال اتى رجل رسول الله ﷺ فقال: أي الناس افضل؟ قال: ﴿ مؤمن يجاهد بنفسه وماله في سبيل الله ﴾ متفق عليه.

٧. مەبەست لەوشەی (جهاد) بەكارهێنانی هەرچی وزەو توانایە لەڕێی خوادا:

بەڵێ... وەك زانایان فەرموویانە: (الجهاد بذل أقصى ما في الوسع)، كەواتە وشەی (جیهاد) هەر لەفەسەكردنو نووسینو ماڵخەرجكردنو نیشتماندو ماڵو حاڵ بەجێهێشتنەوە بگرە هەتا گیانی خۆبەختكردن لەپێناوی خوادا هەمووی دەگرێتەوە، جیهادی ڕاستەقینە ئەوەیە كەئینسان هەموو هێزو توانا ماددیو مەعنەوییەكانی خۆی لەپێناوی خوادا بەكاربێنێ، خوایش فەرموویەتی: ﴿ وجاهدوا في الله حق جهاده ﴾ الحج (٧٨). بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە لەناوهێنانی (جهاد)دا بەس جەنگو خەباتی چەكداری دێتە زەینەوە چونكە بەرزترینو گرنگترین جۆریەتیو بەبێ ئەویش واقیع ناگۆڕێ.

٨. جیهاد بەمەبەستی ئەوە دەكرێ كەپەرچو كۆسپ لەڕێی بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا نەمێنێو حوكمی خوا لەزەوی‌دا بچەسپێ:

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت

صوامع وبيع وصلوات ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا﴾ الحج (٤٠).
﴿ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الأرض ولكن الله ذو فضل على العالمين﴾ البقرة (٢٥١).

١٠. تەنها ئەوانە جیهادی ڕاستەقینەیان بۆ دەکرێ کەخاوەنی خەسڵەتە بەرزو بنچینەییەکانی مسوڵمانەتین:

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ إن الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة يقاتلون في سبيل الله فيقتلون ويقتلون وعدا عليه حقا في التوراة والإنجيل والقرآن ومن أوفى بعهده من الله فاستبشروا ببيعكم الذي بايعتم به وذلك هو الفوز العظيم، التائبون العابدون الحامدون السائحون الراكعون الساجدون الآمرون بالمعروف والناهون عن المنكر والحافظون لحدود الله وبشر المؤمنين﴾ التوبة (١١١-١١٢)[1].

## حەوتەم: پەیدابوونی کیان و ڕێکخستنی ژیان (تنظيم الحياة):

لەبڕگەی هەشتەمی خاڵی شەشەمدا گوتمان (جیهاد بەمەبەستی ئەوە دەکرێ کەپەرچ و کۆسپ لەڕێی بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا نەمێنێ و حوکمی خوا لەزەوی بچەسپێ) جابێگومان لەکاتێکدا لەسایەی تێکۆشان و خەباتی کۆمەڵی خوا (حزب الله)دا ئیسلام بڵاودەبێتەوەو حوکمی خوا سەقامگیر دەبێ. وردە وردەش هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگا لەبەر تیشکی حوکم و یاساکانی ئیسلامدا ڕێک دەخرێن. کەواتە دەتوانین بڵێین: پەیدابوونی کیان و ڕێکوپێکبوونی کۆمەڵگاو ڕێکخستنی هەموو لایەنەکانی ژیانیش زادەو بەرهەمی خەبات و تێکۆشانە. هەر بۆیەش مەگەر بەدەگمەن دەنا هیچ پێغەمبەرێك بۆی نەکراوە لەپاش خەبات و تێکۆشان نەبێ ژیانی کۆمەڵگەی ڕێك بخات.

ئاشکرایە کەمەبەستیش لەڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگە ئەوەیە کەلەهەموو بوارەکانی فەرهەنگی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و مەعنەوی و... هتدا پرس بەس بەپەیڕەوی بەرنامەی خوا بکرێ و، ئینسان بەتاك و کۆمەڵیەوە بەشێوەیەك ڕەفتار بکاو بەڕێوە بچێ کەجێگای ڕەزامەندیی خواو پێغەمبەرەکەی بێ.

ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگاش بەشێوەیەکی گشتی سێ ڕووی هەیە:

١. سیاسی ٢. کۆمەڵایەتی. ٣. ئابووری.

(١) لەمەشی حەوتەم (شێوازەکان گەری ئیسلام)دا زیاتر ئیشکمان هاوێشتوتە سەر ئەم جۆرە باسانەم.

## ١. سیاسی :

لەرووی سیاسیەوە ئیسلام کاروباری کۆمەڵگا لەسەر ئەم بنچینانە ڕێك دەخات:

(أ) بەس خوا مافی ئەوەی هەیە بەرنامە دانانی هەیە بۆ ژیانی ئینسان چونکە خواو پەروەردگارو بەدیهێنەری بەس ئەوە: ﴿ إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ﴾ يوسف (٤٠).

(ب) ڕاوێژ (الشورى)، وەك خوای زانار مەزن فەرموویەتی: ﴿ وأمرهم شورى بينهم ﴾ الشورى (٣٨).

(ج) مەرکەزیەت، خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ ياأيها الذين آمنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم ﴾ النساء (٣٩)، پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم ﴾ رواه ابو داود.

(د) گوێ گرتن و فەرمانبەری لەسنووری شەرع دایە: ﴿ على المرء المسلم السمع والطاعة مالم يؤمر بمعصية ﴾ رواه البخاري.

(ه) هاوکاری یەکتر کردن لەسەر چاکەو پارێزکاری: ﴿ وتعاونوا على البر والتقوى ﴾ المائدة (٢).

(و) هەموو موسڵمانێك بەرپرسیارە لەئاقار کیان و کۆمەڵگای ئیسلامیدا وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته ﴾ رواه البخاري.

## ٢. کۆمەڵایەتی :

لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە کیان و کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەر چەند بنەمایەك بنیات دەنرێ کەئەمانە گرنگترینیانن:

(أ) ئینسانەکان لەرێشەو بنچینەدا یەکن: ﴿ ياأيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى ﴾ الحجرات (١٣).

(ب) ئینسانەکان بۆ چەند تیرەو گەلێك دابەشبوون بەمەبەستی یەکتر ناسین و بەپێزبوونی ژیان: ﴿ وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ﴾ الحجرات (١٣).

(ج) تەرازووی گەورەو بچووکی و گرانی و سووکی تەقوایە: ﴿ إن أكرمكم عند الله أتقاكم ﴾ الحجرات (١٣).

(د) براداران هەموویان دۆست و پشتیوانی یەکترن: ﴿ والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله عزيز حكيم ﴾ التوبة (٧١).

(ه) یەکەمین شانەی درووستبوونی کۆمەڵگای موسڵمانان خێزانی موسڵمانە (الأسرة المسلمة): ﴿ ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا إليها وجعل

بينكم مودة ورحمة ﴾ الروم (٢١).

(و) خزمایەتی‌و بەرو پشت لەئیسلامدا رێزێکی تایبەتی لێنراوە: ﴿ وأولوا الأرحام بعضهم أولى ببعض في كتاب الله ﴾ الأحزاب (٦).

## ٣- ئابووری :

لەرووی ئابووریشەوە دەتوانین ئەم چەند بنچینە گشتی‌یە بخەینەروو:

(أ) هەرچی لەئاسمانەکان‌و زەوی دایە مڵکی خوایە: ﴿ ولله ملك السموات والأرض ﴾ آل‌عمران (١٨٩).

(ب) هەرچی لەبوونەوەر دایە بۆ سەرفەندبوونی ئینسان مەیسەر کراوە: ﴿ وسخر لكم مافي السموات وما في الأرض جميعا منه ﴾ الجاثية (١٣).

(ج) خێرو بێرو نیعمەتەکان بۆ تێکرای ئینسانەکان بەیەکسانی خولقێنراون نەك بۆ دەستەیەکی تایبەت: ﴿ هو الذي خلق لكم مافي الأرض جميعا ﴾ البقرة (٢٩)، ﴿ والأرض وضعها للأنام ﴾ الرحمن (١٠).

(د) هەموو ئینسانێك بۆی هەیە لەنازو نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند بێ: ﴿ هو الذي جعل لكم الأرض ذلولا فامشوا في مناكبها وكلوا من رزقه ﴾ الملك (١٥).

(ه) هەروەك چۆن نوێژو رۆژوو پێویستە، کاسبی‌ی حەڵاڵ‌و رۆزی پەیداکردنیش هەر پێویستە: ﴿ فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض وابتغوا من فضل الله ﴾ الجمعة (١٠).

(و) درووست نیە سەرچاوە سرووشتی‌یەکان بکرێنە موڵکی تایبەتی: ﴿ ثلاث الناس فيهم شركاء: الماء والكلأ والنار ﴾ رواه ابو داود وفي رواية ﴿ والملح ﴾.

(ز) نابێ رێگا بدرێ ماڵ‌و دارایی لەدەستی کۆمەڵێك سامانداری دەوڵەمەندا گورت هەڵێ: ﴿ كي لايكون دولة بين الأغنياء منكم ﴾ الحشر (٧).

(ح) هەموو ئەو وەسیلەو هۆیانەی زیانبەخشن قەدەغەکراون لەبواری کاروکاسبی‌دا وەك: دزی، ماڵ‌زەوت‌کردن (غصب)، هەر جۆرە فێڵ (غش)ێك، شت هەڵگرتن بۆ کاتی گرانی (إحتكار)... هتد.

(ط) موڵکایەتی تاك (الملكية الفردية) شتێکی رەوایە لەسنووری شەریعەتی ئیسلامدا بەڵام وەك رژێمی سەرمایەداری بەرهەڵدار بێ سنوور نیە.

(ی) رێگا بەتاك نادرێ بەهۆی ئازادی‌ی شەخسی‌و موڵکایەتی تایبەتی‌یەوە زیان بەکۆمەڵ بگەیەنێ بۆیە سوودخۆری (الربا)و شت هەڵگرتن بەمەبەستی گرانبوون‌و دزی‌و فێڵ بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە قەدەغەکراون‌و، زەکات لەماڵی دەوڵەمەندەکان‌دا بۆ نەداران پێویست کراوە، بەڵام ئیسلام هەروەك چۆن بەناوی ئازادکردنی تاکەوە نایەڵێ زیان بەکۆمەڵگا بگات وەك لەرژێمی سەرمایەداری (کاپیتالیزم)دا دەبینرێ، بەناوی پاراستنی بەرژەوەندی‌ی گشتی‌و خزمەتکردنی کۆمەڵگاشەوە نایەڵێ تاك (فرد) لەژێر پێی

دەوڵەت و کۆمەڵدا وردوخاش بکرێ و بپلیشێنرێتەوە وەك لە کۆمەڵگا سۆشیالیزمییەکاندا بینرا.

(ك) زەکات کەئەندازەیەکی دیارکراوە لەسەر دەوڵەمەندەکان فەرزە بیدەن بەنەدارو موستەحەقان، بەپێچەوانەی بیرکردنەوەی گەلێك کەسەوە خێر پێکردن و دەستگرۆیی سامانداران نیە بۆ نەداران، بەڵکو هەقێکی شەرعییە کەدەوڵەت وەری دەگرێ و لەرێی خۆیەوە وەك مووچە (معاش) بەسەر موستەحەقانیدا دابەش دەکات.

(ل) ئەوانەی کەناتوانن پێداویستییەکانی ژیانیان دابین بکەن لەبەر نەخۆشی و پیری و پەککەوتەیی و مشوورگێڕو سەرپەرشتێکی واشیان نیە کەبیان ژیەنێ، لەسەر دەوڵەت پێویستە ئەگەر بتوانێ دەنا لەسەر کۆمەڵگا، کەژیانیان دابین بکات و بێ ئیحتیاجیان بکات.

شایانی باسە ئەم مەسەلەیش یەکێکە لەبابەتە هەرە گرنگەکانی سیاسەتی ئابووری لەئیسلامدا کەزانایانی هاوچەرخ پێی دەڵێن (التكافل الإجتماعي) واتە بەتەنگ یەکترەوەبوونی کۆمەڵگاو مشوور لەیەکتر خواردنیان، بەلام زۆربەی خەڵکی لێی بێ ئاگان[1].

■ ■ ■

ئەلێرەشدا کۆتایی بەم بەشی چوارەم (تێگەیشتن)ە دێنین و دەچینە سەر بەشی پێنجەم، کەبریتییە لەبناغەی کۆبوونەوە (أساس التجمع)، چونکە کەسانێك لەسەر (سەرچاوەی وەرگرتن) و (تێڕوانین) و (بیروباوەڕ) و جۆری (تێگەیشتن) لەنێو خۆیاندا یەکدەنگ بووبن و رێك کەوتبن دیارە کاتی ئەوە هاتووە بۆ ئەوە دەشێن کەبەدەم بانگی خوا و پێغەمبەرەوە ﷺ بچن و چیتر بەپرژوبلاوی و شیرازە پچڕاوی نەمێننەوە کۆمەڵ بن، چونکە ئەسڵ لەمسوڵمانەتیدا کۆمەڵبوون و پێکەوەبوونە لەگەڵێك دەقی قورئان و سوننەتدا هەڕەشەی توندو بێڕەزا لەتاك گەرایی و جیاجیایی و پرژوبلاوی کراوە تەنانەت مەترسیی لەجوغزی ئیسلام چوونەدەریشی پێش چاو خراوە.

بەلام بێگومان هەموو کۆمەڵبوون و یەکدەنگبوونێکیش راست و شەرعی و بەجێ نیە، بۆیە بەشی پێنجەم لەژێر سەرباسی (بناغەی کۆبوونەوە)دا پێشکەش کراوە، چونکە مەسەلە ئەوە نیە داخوا چەند کەس و کۆبوونەوە یان نا! بەڵکو گرنگ جۆرو چۆنیەتی کەسەکان و بناغەی کۆبوونەوەیانە.

■ ■ ■

م

---

(١) لەنامیلکەی پێنجەمی ئیسلام و رێچکاندا بەناوی (دادگەری کۆمەلایەتی) تاڕادەیەك ئەو مەسەلەیە تۆێژراوەتەوە.

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری بەڕێز...

وەك لەکۆتایی بەشی چوارەم (تێگەیشتن)دا گوتمان دوای ئەوەی چەند کەسێك لەسەر (سەرچاوەی وەرگرتن)و (تێڕوانین)و (بیروباوەڕ)و (تێگەیشتن) ڕێك کەوتن کاتی ئەوە دێ‌و بۆ ئەوە دەشێن کەپێکەوە کۆ ببنەوەو بهۆنرێنەوە. بەڵام بێگومان مەسەلە هەر کۆبوونەوەو یەکدەنگبوون نیە، بەڵکو پێویستە لەسەر بناغەی پتەوو دامەزراوی هەق بێت و بەرێك و پێکی بێ، نەك هەر بەهەرەمەکیی و بەبێ لێکدانەوەو حیساب و کیتاب.

جائێمە خوا پشتیوان بێ ئەم بەشە لەچوار خاڵاندا پێشکەش دەکەین؛ لەخاڵی یەکەمدا باسی شەرعیەتی کۆبوونەوەو پێویستبوونی دەکەین و دەیسەلمێنین کەموسڵمانان نەك هەر بۆیان هەیە کۆمەڵ و پێکەوە پەیوەست و جۆش‌دراو بن، بەڵکو لەسەریشیان فەرزەو بەبێ ئەوە گوناحبار دەبن!

وەلەخاڵی دووەمیشدا چارێك بەسەر ئیشکالاتی ئەواندا دەگێڕین کەکۆبوونەوەی موسڵمانان بەشەرعیی و ڕەوا نازانن مەگەر لەژێر سایەی حوکمی خەلیفەدا، وەڕوونی دەکەینەوە کەچەندە سەرکێڵن و بەسەهوو چوون.

پاشان لەخاڵی سێیەمدا دەچینە سەرباسی تۆژینەوەی بناغەی کۆبوونەوەی کۆمەڵێکی موسڵمان کەدەیانەوێ لەکاتی نەمان و نەبوونی خەلیفەشدا کارو خەباتی ئیسلامی پەکی نەکەوێ و هەر بەردەوام بێت.

وەلەکۆتاییدا لەخاڵی چوارەمیشدا چەند ڕاستییەکی گرنگ لەمەڕ کۆمەڵبوونی موسڵمانان دەخەینەڕوو.

ئیدی بەهیوای ئەوە ئەو ڕۆژە زوو بێت کەبەهەوڵ و هیممەتی هەموو لایەك و بەتایبەت کۆمەڵە ئیسلامییەکان جارێکیتر (کۆمەڵی موسڵمانان) بێتە کایەوە.

## ١- شەرعیەتی کۆبوونەوەو فەرزبوونی:

لەڕاستیدا نەدەبوو پێکەوە ڕیزبوون و هۆنرانەوەو کۆبوونەوەی موسڵمانان لەهەرکات و شوێنێکدا و لەهەر بارو دۆخێك و هیچ کاتێکدا جێگای مشت و مڕ بوایەو پێویستی بەوە کردبا قسەی لێبکرێ و بەڵگەی لەسەر بهێنرێتەوە! بەڵام حەیفێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆربەی موسڵمانان دووچاری گەلێك دەردو نەخۆشی بوون و هەندێکیان شتێکی ئاشکراو بەڵگەنەویستیشیان لەلا بۆتەوە شتێکی نامۆو جێگای ئیشکال و مشتومڕ!

بەهەر حاڵ ئێمەش چەند بەڵگەیەك لەسەر شەرعیبوون و فەرزبوونی کۆبوونەوەی موسڵمانان لەکاتی نەبوونی خەلیفەدا لەیەك کۆمەڵدا . ئەگەر بلوێ چونکە یەك کۆمەڵ بوون ئەسڵە بۆ ئوممەتی ئیسلام . وەئەگەر نەشگونجا لەچەند کۆمەڵێکدا لەبەر ناچاری و

پێویستی:

## یەکەم: سرووشتی ئیسلام داخوازیی کۆمەڵبوونی مسوڵمانان دەکات:

بەڵێ... بەڕاستی هەرکەسێك بەئەقڵەو بیری ئیسلام ئاشنا بێت دەزانێ کەئیسلام بەرنامەیەك نیە بەچەند تاکو کەسێکی پرژوبڵاوو لێك ترازاو بەڕێوە بچێ.

ئاخر ئیسلامێك کەدەیەوێ بالادەستی مرۆڤایەتی بێت‌و حاکمی سەرزەوی بێ‌و بەتەواوی مەعنا دادگەری بچەسپێنێ‌و ستەم‌و خراپە لەبن بێنێ‌و... هتد، کەی کۆڵێکە بەچەند تاکێك هەڵبگیرێ‌و ببرێتە هەوارو مەنزڵ؟!!

ئنجا بۆ زیاتر دڵنیابوون لەڕاستیی ئەم مەسەلەیە باسەرنجی ئەم ڕاستییانەش بدەین:

(أ) لەقورئانی مەککیدا خوای کاربەجێ هەر بە ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ ﴾ و ﴿ يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ ﴾ و ﴿ يَابَنِي آدَمَ ﴾ لەگەڵ دوێنراو (مخاطب)ەکانیدا دواوە. وەجگە لەمەسەلەکانی عەقیدەو هەندێك شتی مەعنەوی‌و شەخسی ئەگینا هیچ حوکم‌و یاسایەکی ئەوتۆی دیاری نەکردووە، چونکە ئەوکاتە مسوڵمانان کۆمەڵ‌و کیان‌و بوونێکی تایبەت‌و سەربەخۆیان نەبوو کەبتوانن لەهەموو بوارەکانی ژیا و گوزەرانیاندا یاساو دەستوورەکانی خوا جێبەجێ بکەن. بەڵام لەقورئانی مەدەنیدا دواندن (خطاب)ی خوا بۆ مسوڵمانان هەر بە: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾یەو پڕبەپڕیشە لەیاساو حوکمە جۆراو جۆرەکانی هەموو لایەن‌و بوارەکانی ژیان!!

کەواتە: هەتا مسوڵمانان کیان‌و کۆمەڵ‌و بوونێکی تایبەت‌و جیاو سەربەخۆیان نەبێ توانای فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و جێبەجێ کردنی یاساو دەستوورەکانی بەرنامەکەیان نابێ.

(ب) زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەلەکاتی نەبوونی (خەلیفە)دا ئوممەتی ئیسلام (ملزم)ە بەبەڕێوەبردنی هەموو ئەو حوکم‌و یاسا شەرعییانەی کەدەتوانێ جێبەجێیان بکات. دیارە ئەمەش بەکۆمەڵ‌و هەرەوەزکاری نەبێ مەحاڵە[1].

(ج) هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش ڕێککەوتوون کەلەکاتێکدا حوکمی ئیسلام نامێنێ‌و مسوڵمانان بێ خەلیفە دەبن، لەسەر هەموویان پێویستە خەلیفەیەك هەڵبژێرن‌و حوکمی ئیسلام بخەنەوە گەڕ، ئنجا بێگومان کارێکی واگرنگ‌و گەورەش بەبێ

---

(١) جوەینی لەکتێبی (الغياثي)دا لەوبارەوە دەفەرموێت: (وإذا لم يصادف الناس قواما بأمورهم يلوذون به فيستحيل أن يؤمروا بالقعود عما عليه من دفع الفساد، فإنهم لو تقاعدوا عن الممكن عم الفساد البلاد والعباد... وقال بعض العلماء: لو خلا الزمان من السلطان لحق على قطان كل بلدة وسكان كل قرية أن يقدموا من ذوي الأحلام والنهى، وذوي العقول والحجى من يلتزمون امتثال اشارته واوامره وينتهون عن مناهيه ومزاجره فإنهم لو لم يفعلوا ذلك ترددوا عن إلمام المهمات وتبلدوا عن إصلاح الواقعات) لەڕێگەی: شرعية الإنتماء إلى الأحزاب والجماعات الإسلامية، ل١٨.

پێشەکیی و ڕێخۆش کردن لەخەیاڵ پڵاو بەولاوە هیچی تر نیە، دەجا کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی یەکانی ئەم ڕۆژگارە ئەو ڕێخۆش کردن و پێشەکی یانەن! پێشینانیش گوتوویانە: هیچ کەس لەپڕ نابێتە کور!

(د) دیسان زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کەلەکاتی نەمانی (خەلیفە)ش دا جیهادو جەنگ لەسەر ئوممەت هەر فەرزەو دەبێ لەکات و شوێنی خۆی دا بکرێ و درانەخرێ، چونکە مانەوەو بەردەوامبوونی ئایین لەگرەوی (جیهاد) دایە، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لن يبرح هذا الدين قائما يقاتل عليه عصابة من المسلمين حتى تقوم الساعة ﴾ رواه مسلم عن جابر بن سمرة.

ئنجا ئاشکراو ڕوونیشە کەجەنگ و جیهاد بەبێ هەبوونی کۆمەڵ و فەرماندە جێبەجێ ناکرێ.

## دووەم: دەقەکانی قورئان و سوننەت فەرمان بەکۆمەڵ بوونی مسوڵمانان دەکەن:

بۆ وێنە:

- ﴿ ياءيها الذين آمنوا اطيعوا الله واطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم ﴾ النساء (٥٩) کەواتە: لەسەر مسوڵمانان پێویستە لەدوای خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانبەریی براگەورەو کاربەدەستانی خۆیان بکەن. دیارە هەبوونی فەرماندەو کاربەدەستیش ڕاستەوخۆ هەبوونی (کۆمەڵ) دەگەیەنێ، چونکە سەر بەبێ جەستە نابێ.
- هەم لەسوورەتی (المائدة)و هەم لەسوورەتی (المجادلة)دا خوای زاناو کاربەجێ بەوشەی (حزب الله) ناوی ئەو مسوڵمانانەی بردووە کەبەراست و ساغیان دەزانێ و خۆشی دەوێن و یارمەتییان دەدات و دەتوانن ئایینەکەی بەرێوەبەرن و سەرکەوتوو و سەرفرازن: ﴿ ياءيها الذين آمنوا من يرتد منكم عن دينه فسوف ياتي الله بقوم يحبهم ـ ومن يتول الله ورسوله والذين آمنوا فإن حزب الله هم الغالبون ﴾ المائدة (٥٤-٥٦)، ﴿ لاتجد قوما يؤمنون بالله واليوم الأخر يوادون من حاد الله ورسوله ـ أولئك حزب الله ألا ان حزب الله هم المفلحون ﴾ المجادلة (٢٢).

ئاشکراشە کە (حزب)یش بەکۆمەڵە خەڵکێک دەڵێن کەبیرو بۆچوون و کردەوەو ڕەفتارو هەڵوێستیان وەک یەک بێ وەک (راغب الأصفهاني) فەرموویەتی.

- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ـ وأنا آمركم بخمس الله أمرني بهن: الجماعة والسمع والطاعة والهجرة والجهاد ﴾ رواه احمد والترمذي وابن ماجة باسناد صحيح.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ الجماعة رحمة والفرقة عذاب ﴾ رواه احمد.
- عومەری کوڕی خەتتابیش خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: (انه لا إسلام إلا بجماعة، ولاجماعة إلا بإمارة، ولا إمارة إلا بطاعة) رواه الدارمي من تميم الداري موقوفا.

**سێیەم: یاسایەکی شەرعی هەیە دەڵێ: هەرچی فەرزێک پەکی لەسەری بکەوێ ئەویش فەرزە (مالایتم الواجب إلا به فهو واجب):**

بەڵێ... ئەمیش بەڵگەیەکی تری یەکجار بەهێزو نکوڵی لێنەکراوە کەهەموو زانایانی ئیسلام لەسەری رێککەوتوون. جابێگومان بەرپاکردنی ئایین (إقامة الدين) وەك خوای دادگەر لەسووڕەتی (الشورى)دا لەئایەتی ژمارە (١٣) فەرموویەتی: ﴿ أن أقيموا الدين ولاتتفرقوا فيه ﴾ ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانانەو لەسەر هەموویان فەرزە کەمەعنای وشە هەوڵی بەرپاکردنی ئایین بدەن بەهەموو بەشەکانییەوەو لەهەموو بوارەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵدا، ئنجا بێگومان ئەرکی وا گەورەو گرانیش بەکۆمەڵێکی رێك و پێك و لێهاتوو نەبێ بەرێوە نابرێ، کەوابێ فەرزە موسڵمانان وابن.

**چوارەم: عەقڵ و ئەزموونی مێژووی کۆن و تازەی ئیسلام و واقیعی ئەمڕۆ:**

دەیسەلمێنن کەبەبێ کارێکی بەکۆمەڵ و رێك و پێك ئەئامانجە گەورەو گرنگەکانی ئیسلام دەهێنرێنە دی، ئەبەرهەڵستی پیلان و تەڵەو تەخشەو کاری بەکۆمەڵ و زۆر وردی ناحەزانیش دەکرێ!

**پێنجەم: وەلەکۆتاییدا دەڵێین:**

ئایا بەدیلی کۆبوونەوە پرژوبڵاوی و بەدیلی رێکخستن و هێزنینەوە بێسەروبەرەیی (فوضى) وبەدیلی فەرمانبەر براگەورە هەبوون بێسەری و بەدیلی بەڵێن و پەیمان ناپابەندی و هەرەمەکی... نیە!

جا ئایا کەسێك هەر لوێچە شارەزایییەکی دەربارەی ئیسلام و مستە عەقڵێکی هەبێ دەڵێ ئیسلام لەگەڵ پرژوبڵاوی و بێسەرەو بەرەیی و بێسەری و ناپابەندی دایە؟!

## ٢- هەڵسەنگاندنی قسەی ئەوانەی کەکۆبوونەوە بەشەرعی نازانن:

ئەوانەی کەکۆبوونەوەو کۆمەڵبوونی موسڵمانان لەکاتی نەبوونی خەلیفەدا بەشتێکی هەڵەو ناشەرعی دەزانن چەند شتێك - بەحیسابی خۆیان - بەبەڵگە دێننەوە کەئەمانەی خوارەوە بەهێزترینیان:

**یەکەم:**

دەڵێن موسڵمانان دەبێ یەك کۆمەڵ بن و تەنها یەك براگەورەو فەرماندەشیان هەبێ،

چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ إن هذه أمتكم أمة واحدة وأنا ربكم فاعبدون ﴾ الأنبياء (٩٢).

**دووەم:**

وەدەڵێن هەبوونی چەند کۆمەڵێکی ئیسلامی دەبێتە هۆی ناکۆکیو دژایەتی نێو خۆیانو ئەمەش زەبرێکی گرچوبڕ لەکاری ئیسلامیو ئابڕووی ئیسلامو موسڵمانانیش دەدات.

**سێیەم:**

وەدەڵێن چەند دەقێکی قورئانو سوننەت هەن کەرەفزی ئەوە دەکەن موسڵمانان چەند کۆڕو کۆمەڵێکیان هەبێ، بۆ وێنە:

- ﴿ إن الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا لست منهم في شيء ﴾ الأنعام (١٥٩).
- ﴿ ولاتكونوا من المشركين من الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا كل حزب بما لديهم فرحون ﴾ الروم (٣١،٣٢).
- ﴿ إن أهل الكتابين افترقوا في دينهم على ثنتين وسبعين ملة، وإن هذه الأمة ستفترق على ثلاث وسبعين ملة - الأهواء - كلها في النار إلا واحدة وهي الجماعة ﴾ رواه أبو داود وغيره، واته: بەتەئکید خاوەنی دوو کتێبەکان (جوولەکەو دیانەکان) لەئاینی خۆیاندا پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو دوو کۆمەڵ، وەبێگومان ئەم ئوممەتەش پەرتەوازە دەبێ بۆ حەفتاو سێ کۆمەڵ - واتە ئەوانەی دەکەونە شوێن ئارەزوو - هەموویان لەئاگر - ی دۆزەخ - دان جگە لەیەکێکیان ئەویش کۆمەڵ - ی هەق - ە.
- ﴿ عن حذيفة قال: كان الناس يسالون رسول الله ﷺ عن الخير وكنت أساله عن الشر مخافة أن يدركني. فقلت يارسول الله: كنا في جاهلية وشر فجاءنا الله بهذا الخير، فهل بعد هذا الخير من شر؟ قال: نعم قلت: وهل بعد ذاك الشر من خير؟ قال: نعم وفيه دخن. قلت وماذخنه؟ قال: هو قوم يهدون بغير هدي تعرف منهم وتنكر. قلت: وهل بعد ذلك الخير من شر؟ قال: نعم دعاة على أبواب جهنم من أجابهم إليها قذفوه فيها. قلت: يارسول الله صفهم لنا. قال: هم من جلدتنا ويتكلمون بالسنتنا. قلت: فما تامرني إن أدركني ذلك؟ قال: تلزم جماعة المسلمين وإمامهم قلت: فإن لم يكن لهم جماعة ولاإمام؟ قال: فاعتزل تلك الفرق كلها ولو أن تعض باصل شجرة حتى يدركك الموت وأنت على ذلك ﴾ رواه البخاري. واتە: لە حوذیفە گێڕراوەتەوە فەرموویەتی: خەڵك عادەتیان وابوو پرسیاری چاکەو خۆشییان لەپێغەمبەر ﷺ دەکرد، بەڵام من پرسیاری خراپەو ناخۆشیم لێدەکرد نەوەك تووشم بێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە

لەنەفامێتی‌و خراپە دابووین، پاشان خوا ئەم خێرو چاكەیە - ئیسلام - ی بۆ هێناین، جائایا دوای ئەم چاكەیە خراپە دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتم: ئەدی دوای ئەو خراپەیە چاكە - دووبارە - دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام خڵتەی پێوە دەبێ. گوتم خڵتەكە چی‌یە؟ فەرمووی: كۆمەڵێك دەبن كەڕێ‌و شوێنی من ڕەچاوناكەن - لەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئیسلامدا - هەندێك شتیانت پێ باش دەبێ‌و هەندێ شتیشیان خراپ. گوتم: ئایا دوای ئەو چاكی خراپە دەبێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ بانگەوازكەرانێك لەسەر دەرگاكانی دۆزەخن هەركەسێك بەدەنگیانەوە بچێ فڕێی دەدەنە نێویەوە. گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانەمان بۆ وەسف بكە. فەرمووی: لەخۆمانن‌و بەزمانی خۆشمان قسە دەكەن! گوتم: باشە ئەگەر ئەو ڕۆژگارەم تووش بوو فەرمانم بەچی پێدەكەی؟ فەرمووی: كۆمەڵی موسڵمانان‌و پێشەوایەكەیان بگرە. گوتم: ئەی ئەگەر نەكۆمەڵیان هەبوو نەپێشەوا؟ فەرمووی: خۆت دوور بگرە لەو كۆمەڵانە گشتیان ئەگەر بەرەگی درەختێكیش دانووسابی هەتا مردنت دەگاتێ‌و ئەتۆ لەو حاڵەدا دەبی.

جائێستا باهەركام لەم سێ بەڵگانە هەڵسەنگێنین داخوا تاچ ڕادەیەك بەكەڵكی ئەوە دێن بكرێنە سەلمێنەری دەعوای ناشەرعی‌بوونی كۆبوونەوەو كۆمەڵ‌بوونی موسڵمانان لەكۆمەڵێك یان زیاتردا بۆ خزمەتی ئیسلام لەكاتی نەبوونی فەرمانڕەواو دەستەڵاتدارێكی شەرعی‌دا كەموسڵمانان بخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو یاساكانی شەرعیان بەسەردا جێبەجێ بكات:

## هەڵسەنگاندن‌و لێكدانەوەی ئەم بەڵگانە

### دەربارەی یەكەمیان دەڵێین:

ڕاستە كەئەسڵ لەئوممەتی ئیسلامدا ئەوەیە كەیەك كۆمەڵ بن‌و یەك ئاڵە سەرۆكیشیان هەبێ، بەڵام زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن كەهەر كارێكی خێری فەرز یان سوننەت، ئەگەر نەكرا هەمووی جێبەجێ بكرێ، پێویستە چەندی لەتوانادا هەیە ئەنجام بدرێ‌و درێغی تێدا نەكرێ، چونكە خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ لایكلف الله نفسا إلا وسعها ﴾ البقرة (٢٨٦)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ فاتقوا الله مااستطعتم واسمعوا واطیعوا ﴾ التغابن (١٦). ئنجا هەر لەسەر بنچینەی ئەم ئایەتانەش بووە كەزانایان فەرموویانە: (مالایدرك كله لایترك جله)م كەواتە ئەگەر نەكرا هەموو موسڵمانانی دنیاش لەیەك بازنەو چوارچێوەدا كۆ بكەینەوە با موسڵمانانی هەر شوێنێك لەبازنەی كۆمەڵێك - یان ئەگەر نەگونجا - زیاتردا كۆ ببنەوە، وە وردە وردەش كاربكرێ بۆ كۆكردنەوەو یەكگرتنەوەی هەموو موسڵمانان لەبازنەیەكی فراواندا، نەك دەستەوئەژنۆ دابنیشین‌و چونكە هەنگاوی گەورەمان پێنانرێ لەنێو گچكەش بگەڕێین. ئاشكرایە

کەسێکیش بەردی زلی پێنەهاویشرێ دەست بۆ ئی گچکە دەبات ئەگەر بیەوێ بەجددی شەڕ بکات، ئەگەرنا پێشیان گوتەنی: بەردی گەورە نیشانەی پێدانەدانە!!

## دەربارەی بەڵگەو ئیشکالی دووەمیش دەڵێین :

خودی کۆبوونەوەی مسوڵمانان نابێتە هۆی ناکۆکیی و دووبەرەکی بەڵکو جۆرو جۆنیەتی یەکی ناشەرعی یە کەئەو حاڵەتە پەیدا دەکات، کەدیارە بەبێ کۆبوونەوەو کۆمەڵبوونیش ئەو حاڵەتە هەر دروست دەبێ. دیارە هیچ کاتێکیش دروست نیە شتی باش و شەرعی لەبەر بەهەڵە بەکارهێنرانیی و بەخراپە سوودلێبینرانی وازی لێبهێندرێ، هیچ کەسێکیش لەترسی ئەوەی بەراز گەنمەکەی بشێلێتەوە وازی لەگەنمکردن نەهێناوە مەگەر زۆر بەستەزمان بووبێ!

ئاشکراشە کەلەیەکتر گەیشتن (تفاهم)ی دوو کۆمەڵ یان زیاتر ئاسانترەو نزیکترە لە لەیەکتر گەیشتن و یەکگرتنی هەزاران کەسی پرژوبڵاوو بارنەهێنراو!

کورتەی قسان: کۆمەڵ کۆمەڵبوونی مسوڵمانان لەم رۆژگارەدا کەسەرو سێبەرێکی وایان نیە هەموویان کۆبکاتەوە، لەگەڵ هەموو خراپەیەکیش کەلێی پەیدا دەبێ بەهەزاران کەڕەت و پلە چاکترو بەسوودترە بۆ بەرەو پێش بردنی کاری ئیسلامیی و بەرپاکردنەوەی ئاینی. دیارە لەپێنار قازانج و سوودی گەورەشدا چاوپۆشی لەزەرەرو زیانی گچکە دەکرێ. هەروەك چۆن بۆ خۆپاراستن لەزیانی گەورەتر ئی گچکەتر تەحەممول دەکرێ، وەك زانایانی (اصول الفقه) بەدرێژی باسیان کردووە.

## ئنجا دەربارەی سێیەمیش دەڵێین :

هیچ کام لەم ئایەت و فەرموودانە ئەوە ناگەیەنن کەمسوڵمانان لەکاتی نەمانی حوکم و دەسەڵاتی ئیسلامیی و نەبوونی خەلیفەدا بۆیان نیە کەلەشێوەی کۆمەڵێك یان چەند کۆمەڵێكدا کاروباری خۆیان تەرتیب بکەن و هەوڵبدەن و کۆشش بکەن کەحوکمی ئیسلامی بێننەوە کایەو خەلافەتی ئیسلامی پەیدا بکەنەوە.

جارێ دەربارەی هەردوو ئایەتەکەی (الأنعام)و (الروم) ئەوە خوای پەروەردگار بەراشکاوی خستوویەتەڕوو کەمەبەستی لەتاقمەکان ﴿ شيعـ ﴾ ئەو دەستەو پێرانەن کەلەسەر بنچینەی کوفرو شیرك و لادان لەرێبازی شەریعەت بنیات دەنرێن و سەرنجێکی خێراش لەو دەقانە ئەوەی گوتمان دەردەخات.

دەربارەی دەقی سێیەمیش کەلەلای هەندێك لەزانایان ئەو فەرموودەیە بەفەرموودەی (الفرقة الناجية) ناسراوە هەر بەکورتی دەڵێین:

ئەم فەرموودەیە بەراشکاوی رایدەگەیەنێ کەهەموو ئەو پێڕو کۆمەڵانەی لەئوممەتی پێغەمبەر ﷺ جیادەبنەوەو پەرتەوازە دەبن لەنێو ئاگری دۆزەخدان، کەواتە هیچ پێویست ناکات بگەرێین و بسووڕێین بەدوای ئەو دەستەو تاقمانەدا کەئەم فەرموودەیە بەئەهلی

دۆزەخیان دادەنێ لەنێو کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییەکاندا، چونکە فەرموودەکە بەراشکاری پێناسەی کردوون کەلەڕێبازی ئیسلام جیابوونەوەو پەرتەوازە بوونو لەکۆمەڵی هەق دوور کەوتوونەوە، کۆمەڵی هەقیش وەك لەهەندێك ڕیوایەتی تری ئەم فەرموودەیەدا هاتووە ئەوانەن کەلەسەر خەت و ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی دان﴿ ما أنا عليه وأصحابي ﴾، کەواتە: هەموو ئەو کۆمەڵو بزووتنەوانە کەلەڕووی دروشمەوە ﴿ لا إله إلا الله محمد رسول الله ﴾یان بەرزکردۆتەوەو لەڕووی بەرنامە (منهج)یشەوە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانین ئەوە بەبەشێك لەکۆمەڵی سەرفراز (الفرقة الناجية)ی ڕۆژگاری خۆیان دادەنرێن بەدەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وەدەربارەی فەرموودەکەی حوذەیفە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێین: ئەم فەرموودەیە زۆر بێپەردە تاقمەکان (الفرق) پێناسە دەکاتو پەردەیان لەسەر هەڵدەماڵێ کەهیچ کەس هیچ جۆرە گومانو دوودڵییەکی دەربارەیان نامێنێ چونکە:

یەك: بە ﴿ دعاة على أبواب جهنم ﴾ پێناسەیان دەکات، بەڵام بێگومان کۆمەڵە ئیسلامییەکان خەڵکی بەرەو دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکەن!

دوو: بە ﴿ من أجابهم إليها قذفوه فيها ﴾ کارو ڕێبازیان دەناسێنێ دیاریشە کێ خەڵکی دەخەنە دۆزەخەوە، خەڵك بەهۆی شوێنکەوتنی کام حیزبو کۆمەڵەوە دەچنە دۆزەخ!

سێ: بە ﴿ هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا ﴾ وەسفیان دەکات کەئەو تاقمو حیزبانەی مەبەستن کەتەنها لەڕەنگو ڕەگەزو دەنگو زماندا لەئێمەن، بەڵام لەبیروباوەڕو ڕێبازو ڕەوشتدا جیان!

چوار: فەرمان بە (حوذەیفە) دەکات کەئەو تاقمو پێڕانە هەموویان وێڵ بکاتو خۆیان لێ دوور بگرێو ڕەگەڵیان نەکەوێ ئەگەر لەبرسانیش بمرێ، کەواتە: هەر دیارە کەمەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە ﴿ تلك الفرق ﴾ حیزبو کۆمەڵە شەیتانییەکانن کەبێگومان لەسەر موسڵمان حەرامە شوێنیان بکەوێ یان ڕەگەڵیان بکەوێ بەبەهانەی نەداریو برسێتی وەك ئەمڕۆ دەبینین.

ئێستاش کەزانیمان لەبەرچی کۆبوونەوەو کۆمەڵبوونی موسڵمانان بۆ کاری ئیسلامی لەم ڕۆژگارەدا نەك هەر دروستو جائیزە بگرە پێویستیشە، وە تەمومژی ئەو ئیشکالانەشمان ڕەواندەوە کەکەسانێکی کرچوکاڵو ناحاڵی لەو بارەوە دەیانخەنە ڕوو، کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر خاڵی سێیەم.

## ٣- بناغەی کۆبوونەوە:

دیارە بناغەی کۆبوونەوەی موسڵمانان چ لەحاڵەتی ئاساییدا کەکۆبوونەوەیانە

لەڕووی فیکرییەوە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانیو لەڕووی سیاسییەوە لەبازنەی حوکمو خەلافەتی ئیسلامیدا، وەچ لەحاڵەتی نائاساییدا کەبریتییە لەنەبوونی خەلیفەو دەسەڵاتدارێکی ئیسلامیو کیانێکی یەکگرتوو، بەڵێ لەهەردووک حاڵەتی ئاساییو نائاساییدا بناغەی کۆبوونەوەی موسڵمانان بریتییە لەیەکبوون (وحدة)یان، جائەگەر کۆبوونەوەکەیان گشتی بێ ئەوە یەکبوونیان لەبیروباوەڕدا بەسە بۆ کۆبوونەوەو ڕیزکردنیان لەچوغزی برایەتی ئیسلامی (الأخوة الإسلامية)دا، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ إنما المؤمنون أخوة ﴾ الحجرات (١٠)، بەڵام ئەگەر کۆبوونەوەکەیان کۆبوونەوەیەکی تایبەت (إجتماع خاص) بێ، کەلێرەدا مەبەستم کۆمەڵبوونیانە بۆ پێکەوە کارکردنیان لەچوارچێوەی کۆمەڵو بزووتنەوەیەکی شەرعیدا بۆ خەباتو تێکۆشان لەپێناوی خوادا بۆ هێنانەوە کایەی حوکمی ئیسلامی، ئەوە لەم حاڵەتەدا وێڕای یەکبوونیان لەبیروباوەڕ (عقيدة)دا پێویستییان بەیەکبوونیش هەیە لە: بەرنامە (منهج)و ئامانج (هدف)و فەرماندەیێتی (قيادة)دا، کەواتە: بۆ کۆمەڵێکی ئیسلامی کەئەندامەکانی بیانەوێ پێکەوە کاربکەن بۆ چەسپاندنی بەرنامەی خواو هێنانەوە کایەی حوکمو دەسەڵاتی ئیسلامی، پێویستە لەبیروباوەڕو بەرنامەی کارو فەرماندەیێتیو ئامانج (العقيدة والمنهج والقيادة والهدف)دا یەك بن.

جابۆ یەکبوون لەعەقیدەدا پێویستە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕیان هەڵهێنجراوی قورئانو سوننەت بێ، کەبەچاکترین شێوە لەپێشینە چاکەکانمان (سلفنا الصالح)دا ڕەنگی داوەتەوەو ئەوانیش ئەو زاناو پێشەوایانەن کەلە سێ سەدەکان (القرون الثلاثة)ی سەرەتای ئیسلامدا ژیاون یان شوێن ئەوان کەوتوون لەڕۆژگارەکانی تری مێژووی ئیسلامدا.

وەبۆ یەکبوون لەبەرنامەی کار (منهج العمل)دا بەلای کەمەوە دەبێ ئەندامانی وردو درشتی ئەو کۆمەڵە لەسەر ئەم مەسەلانە یەکدەنگو یەك هەڵوێست بن:

١. بنچینەکانی کاری ئیسلامی.
٢. شێوازەکانی کاری ئیسلامی.
٣. دۆستانی پشتیوان.
٤. دوژمنو ناحەزان.
٥. ئامانجی کاری ئیسلامی.
٦. مەبەستی کاری ئیسلامی.

بۆ یەکبوونیش لەفەرماندەیێتیدا بێگومان دەبێ هەموویان یان زۆربەیان ڕێك بکەونو پێك بێن لەسەر هەڵبژاردنی براگەورەو فەرماندەیەك کەلەسنووری شەرعدا گوێی بۆ بگرنو بەقسەی بکەنو سەرپێچی لەفەرمانی نەکەن مەگەر بەئاشکراو بێپێچو پەنا بێشەرعی بێت.

وەبۆ یەکبوونیش لەئامانجی کاری ئیسلامیدا دەبێ هەموویان لەسەر ئەوە کۆو یەکدەنگ بن کەئامانجی هەرەبەرزو ستراتیژی کاری ئیسلامی ئەم ڕۆژگارەدا

چەسپاندنی حوکمی خواو گێڕانەوەی دەسەڵاتی ئیسلامییە، سەرەتا لەشوێنی ئەو کۆمەڵە ئیسلامییەو پاشانیش لەسەرتاسەری دنیادا.

وەلەکۆتاییدا بۆ یەکبوون لەمەبەست (غاية)دا دەبێ کۆمەڵی موسڵمان یەك یەکی ئەندامەکانی بۆ خوا ساغ‌و یەکلا بووبنەوەو جگە لەرازی کردنی خواو پاداشتی دوارۆژ؟ هیچ مەبەستو هیوایەکی تریان بەکاری ئیسلامی نەبێ.

حەزیش دەکەم هەر بۆ تەئکید کردنەوە دووبارەی بکەمەوە کەیەکبوون لەبیروباوەڕو بەرنامەی کارو فەرماندەیێتی‌و ئامانجی کاردا مەرجی کۆبوونەوەی کۆمەڵە موسڵمانێکن کەدەیانەوێ پێکەوە کار بکەن بۆ ئیسلام‌و هێنانەوەو گێڕانەوەی بۆ مەیدانی ژیان، ئەگەرنا موسڵمانان بەگشتی تەنها ئیمان‌و عەقیدەکەیان بەسە بۆ کۆبوونەوەو هۆنینەوەیان لەژێر سێبەری چەتری فراوانی ئیسلامدا، دیارە هەتا ئیمانەکەشیان چاکترو تەواوتربێ برایەتی‌و ڕیزیشیان پتەوترو دامەزراوتر دەبێ‌و دەبێتە هۆی یەکبوونیان لەبنەماکانی تری یەکبوون (وحدة)و ڕیزبوونیاندا.

کەواتە: کۆبوونەوەو برایەتی تایبەتی ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامی لەگەڵ برایەتی‌و کۆبوونەوەی گشتیی موسڵمانان لەجوغزی ئوممەتی موحەممەد ﷺ دا وەك دوو بازنەی گچکەو گەورە وان، کەبازنە گچکەکە کەوتبێتە نێو بازنە گەورەکەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:



دیارە هەموو ئەو موسڵمانانەی کەلەنێو بازنە گچکەکەدان لەهەمان کاتدا لەنێو بازنە گەورەکەش‌دان، بەڵام بەپێچەوانەوە نا. کەواتە هەموو ئەو موسڵمانانەی کەلەبازنەی تەسکی کۆمەڵێکی ئیسلامی دان‌و پەیوەندیی تایبەتییان لەگەڵ یەکتردا هەیە، هاوکات لەگەڵ ئەوەش پەیوەندی‌و برایەتی گشتییان لەگەڵ باقی ئەو موسڵمانانەشدا هەیە کەلەبازنەی فراوانی ئیسلامدا لەگەڵیان کۆبوونەوەو بەهەموویان ئوممەتی مەزنی ئیسلام لەسەرتاسەری دنیادا پێك دێنن.

ئێستاش نۆرەی خاڵی چوارەم‌و کۆتاییە.

# ٤- چەند ڕاستی‌یەکی گرنگ لەمەڕ کۆمەڵبوونی موسڵمانان[١]:

بەپێویستم زانی بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی هەندێك لەمەبەستەکان و زیاتر تەئکید کردنەوەی هەندێکیان لەم خاڵەشدا چەند ڕاستی‌یەکی گرنگ لەپێنج بڕگەدا بخەینەڕوو:

## یەکەم: مەعنای کۆمەڵ (الجماعة)ی موسڵمانان:

لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەقی زۆرو زەوەند هەن سەبارەت بەپابەندبوون بەکۆمەڵ (جماعة)ەوەو هەڕەشەی زۆریش لەوانە کراوە کەبەهەر بەهانەیەك بووە لەکۆمەڵ لادەدەن و دوورەپەرێز دەبن، بەڕاشکاوی گوتراوە کەهەرکەسێك ڕیزپەڕ بێت بەرەو ئاگری دۆزەخ دەچێ: ﴿ ومن شذ شذ إلى النار ﴾، وەهەرکەسێك بەو حاڵەتەوە بمرێ مردنێکی نەفامانە مردووە: ﴿ مات ميتة جاهلية ﴾ بۆیە زۆر گرنگ و پێویستە کەمەعناو چەمکی وشەی (کۆمەڵ)ی موسڵمانان لەهەموو حاڵەتەکانی‌دا بەڕوونی بزانین تاکو هەرکەسێك ڕاست بزوە بەهەڵە چوونە نێو دۆزەخ و مردنی نەفامانە بەباڵای خەڵکی نەبڕێ!

پاش لێکۆڵینەوە لەدەقەکانی سوننەت و سەرنجدان بۆمان دەردەکەوێ کەمەبەست لەکۆمەڵ (جماعة) دوو شتە:

١- لەسەر هەقبوون، کەڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی، کەپێچەوانەکەی پەرتەوازە (تفرق) بوونە لەئاییندا و خاوەنەکەشی بە ڕێونکەر (ضال) و داهێنەر (مبتدع) ناسراوە، هەرچەندە ملکەچی فەرمانی پێشەوا (إمام)ی موسڵمانانیش بێ، بۆ وێنە فەرموودەی: ﴿ إن أهل الكتاب افترقوا ﴾ کەپێشتر باس کرا ئەم واتایە بۆ کۆمەڵ (جماعة) دەگەیەنێ.

٢- کۆبوونەوە لەسەر پێشەوا (إمام) و فەرمانبەری بۆ (سلطان) لەسنووری شەرعدا مەگەر کوفری بێ‌پێچ و پەنا (الكفر البواح)ی لێ‌ببینرێ. پێچەوانەکەشی (بغي)یەو خاوەنەکەشی بە (باغي) و (مفارق للجماعة) و (ناکث) ناونراوە هەرچەندە لەڕووی فیکری و تیۆریشەوە هەر لەسەر سوننەت بێ بۆ وێنە. ئەم فەرموودانەی خوارەوەش ئەم واتایە دەگەیەنن:

- ﴿ من رأى من أميره شيئا فليصبر عليه فإنه من فارق الجماعة شبرا فمات إلا ميتة جاهلية ﴾ متفق عليه عن ابن عباس.
- ﴿ من خرج من الطاعة وفارق الجماعة ثم مات مات ميتة جاهلية ﴾ رواه مسلم.

دیارە بەکۆبوونەوەی هەردوو واتایەکەش کۆمەڵی موسڵمانان (جماعة المسلمين) دێت، واتە ئەو (جماعة)ەی کەئەم فەرموودانەی باسکران مەبەستیانە، نەك هەر کۆمەڵێکی

---

(١) بۆ نووسینی ئەم خاڵە چوارەمە سوودێکی زۆرم لەکتێبی (شرعية الإنتماء إلى الجماعات الإسلامية) وەرگرتووە، خوا پاداشتی خاوەنەکەی بداتەوە.

موسوڵمان[1]!

کەواتە: کۆمەڵی موسوڵمانان (جماعة المسلمین) لەروانگەی سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ کاتێك دێتەدی کەسەرجەمی موسوڵمانانی ئوممەت لەڕووی عیلمی‌یەوە لەسەر بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەر کۆببنەوە کەقورئان‌و سوننەتە، وەلەڕووی سیاسی‌یەوە لەژێر سایەی حوکمی پێشەواو فەرمانڕەوایەکدا کۆببنەوە کەبەزاراوەی شەرع (خلیفة ) یان (أمیر) یان (سلطان)ی پێدەگوترێ.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەلادان لەکۆمەڵ بەهەردووك مەعنای عیلمی‌و سیاسی یەك پلەی نیە چەند حاڵەتێکی هەن کەجاری‌وا هەیە خاوەنەکەی هەر بەفاسیق‌و گوناحبار دادەنرێ، بەڵام جاری‌واش هەیە بەدەرچوو لەدین (خارج عن الملة) لەقەڵەم دەدرێ بەئەندازەی سووکی‌و قورسی لادان‌و ترازانەکەی.

دیارە هەر لەسەر ئەم بناغەیەش شوێنکەوتووە ڕاستەقینەکانی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزی کەجەماوەری موسوڵمانانن بە (أهل السنة والجماعة) شۆرەتیان دەرکردووە، لەڕووی عیلمی‌یەوە لەسەر هەمان کەوڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی: ﴿ ما انا علیه واصحابي ﴾ کەواتە: خاوەنی (سوننەت)ن، وەلەڕووی سیاسی‌شەوە پابەندی فەرمانی دەسەڵاتداری ئیسلامین لەسنووری شەرعدا.

کەواتە خاوەنی (کۆمەڵ)یشن بۆیەش پێیان گوتراوە: خاوەنی سوننەت‌و کۆمەڵ (اهل السنة والجماعة).

بەڵام بۆ تەئکید کردنەوە دەڵێین: زانایانی ئیسلام تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەهەرکاتێك دەسەڵاتداری ئیسلامی کوفری بێپێچ‌و پەنای لێبینرا ئەوە بێ سێ‌و دوو ویلایەت‌و فەرمانڕەوایەتی بەسەر موسوڵماناندا نامێنێ‌و لێدەکەوێ، ئەگەر لەسەر کورسی‌ی حوکمیش لانەچوو لەسەر هەموو موسوڵمانان فەرزە لای‌بەرن‌و حەرامیشە هیچ فەرمانێکی جێبەجێ بکەن، چونکە خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ ـولن یجعل الله للکافرین علی المؤمنین سبیلا ﴾ النساء (١٤١).

پێغەمبەریش ﷺ لەهەموو ئەو فەرمایشتانەدا کەتیاندا فەرمان بەموسوڵمانان دەکات کەگوێگرو فەرمانبەر بن بۆ دەسەڵاتداری شەرعی فەرموویەتی: ﴿ إلا أن تروا کفرا بواحا ﴾، واتە: مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینن، ئیبنو حەجەری عەسقەلانیش لەو بارەوە فەرموویەتی: (..انه ینعزل بالکفر اجماعا فیجب علی کل مسلم القیام في ذلك فمن قوي علی ذلك فله الثواب، ومن داهن فعلیه الإثم، ومن عجز فعلیه الهجرة من تلك

---

(١) هەندێك کەس کەخۆشیان بەزانا دەزانن زۆر سادەو سەرکێڵانە دێن لەو دەقانەو فەرموودانەی کەلەبارەی کۆمەڵی موسوڵمانانەوە گوتراون بەو چەمکەی کەڕوونم کردەوە، بەسەر کۆمەڵ‌و بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکاندا دەچەسپێنن‌و سەرەنجام تووشی حوکمو بڕیارو هەڵوێستی سەیرو سەمەرە دەبن‌و خەڵکیش چەواشە دەکەن!

الأرض..)[١].

## دووەم: کۆمەڵی مسوڵمانان لەحاڵەتی ئاسایی و نائاسایی دا[٢]:

کۆمەڵی مسوڵمانان وەك لەبڕگەی یەکەمدا گوتمان لەحاڵەتی ئاسایی‌دا ئەوەیە کەسەرجەمی مسوڵمانان لەسەر بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی کەقورئانو سوننەتە لەڕووی عیلمی‌یەوەو، لەژێر چەترو سێبەری حوکمو دەسەلاتی فەرمانڕەوایەکی شەرعی‌دا لەڕووی سیاسی‌یەوە کۆ ببنەوە، بەڵام لەحاڵەتی نائاسایی‌دا کۆمەڵی مسوڵمانان یان بەواتایەکی‌تر کۆمەڵبوونی مسوڵمانان بەم شێوەیە دەبێ:

لەڕووی عیلمی‌یەوە ـ وەك حاڵەتی ئاسایی بێ کەمو زیاد ـ تێکڕای مسوڵمانان لەسەر بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەری پێشەواو هاوەڵانی بەڕێزی کەقورئانو سوننەتە ـ لەبەر تیشکی تێگەیشتنی زاناو پێشەوایانی پێشینو شوێن‌کەوتنیان ـ کۆدەبنەوە، بەڵام لەڕووی سیاسی‌یەوە چونکە حوکمو دەسەلاتێکی شەرعی‌و مەرکەزی‌یان نیە کەلەچوارچێوەیەکی سیاسی‌دا کۆیان بکاتەوە، ویلایەتیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زاناو کاربەدەستانەی کەبە (أولوا الأمر) یان (أهل الحل والعقد) ناسراون، چونکە (أهل الحل والعقد) تاقە نوێنەری شەرعی‌ی ئوممەتن‌و براگەورەو خەلیفەشیان ئەگەر ئەمان هەڵی‌نەبژێرن یان دانی پێدا نەهێنن ویلایەت‌و فەرمانڕەوایەتی شەرعی‌ی بەسەر مسوڵماناندا بۆ درووست نابێ.

(أهل الحل والعقد)یش وەك زانایانی ئیسلام بەتایبەتی (نووي)و (إبن تيمية)و (إبن حجر العسقلاني)و (شوكاني) فەرموویانە بریتین لە: (أهل العلم والقدر )ی نێو ئوممەتی ئیسلام[٣]،چونکە بەبێ زانیاری (علم) نازانرێ شەرع‌و ناشەرع چین‌و، بەبێ دەسەلات (قدرة)یش دەستوورو یاساکانی دین پیادە ناکرێن، لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەهلی حەلل‌و عەقد ئەمانەن:

١. هەموو ئەوانەی کەگوێیان بۆ دەگیرێ‌و فەرمانبەری‌یان دەکرێ لەگۆڕەپانی کاری ئیسلامی‌دا، بەتایبەت فەرماندەو بەرپرسی کۆمەڵ‌و بزووتنەوەکان.
٢. هەموو ئەو زاناو بانگبەرانەی کەخەڵکی مسوڵمان ڕێزیان دەگرێ‌و بەقسەیان دەکات، چ‌لەجوغزی کۆمەڵ‌و بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکاندا بن، چ‌لەدەرەوەی ئەو جوغزو بازنانەدا کەهەرکامێکیان کۆمەڵێکی لەمسوڵمانان کۆ کردۆتەوە نەك هەموو مسوڵمانان.
٣. هەموو ئەوانەی کەڕوو و ڕێزێکیان لەنێو مسوڵماناندا هەیە، یان خاوەنی توانار

---

(١) بڕوانە: فتح الباري، ب١٣، ل١٢٣.

(٢) حاڵەتی ئاسایی مسوڵمانان هەبوونی کیانو دەسەلاتێکی شەرعی‌و مەرکەزی‌یە کەبۆیان دەبێتە چەترو سەرسێبەرو پەرژین‌و هەموویان کۆدەکاتەوە، وەحاڵەتی نائاسایی نەبوونی ئەو سەرو سێبەرو دەسەلاتەیە.

(٣) بۆزیاتر بڕوانە: (مجموع الفتاوى)ی ئیبنو تەیمیە، ب٢٨، ل١٧٠، وە: (نهاية المحتاج)ی رەملی، ب٧، ل١٢٠.

شارەزایین لەبوارێکەوە کەکاری ئیسلامیو درووستکردنی کیانو دەسەڵاتی ئیسلام پێویستی پێیەتی.

بەڵام هەرکام لەم سێ جۆرە کەسانە بەو مەرجە بەئەندامی کۆڕی ئەهلی حەلل‌و عەقد حیساب دەکرێن، کەلای کەسی پابەندی بەکۆمەڵی مسوڵمانانیان لەلایەنی بەرنامەییو عیلمییەوە نەیدابێتو، لەشتێکی بنەڕەتیو گرنگدا سەرپێچی لەرێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی نەکەن بەجۆرێك کەبڕی ببنە ئەهلی بیدعەت.

## سێیەم: کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییەکان لەژێر سایەی فەرمانڕەوایەتی ئیسلامو غەیری ئیسلامدا:

کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییەکان لەو شوێنانەدا کەحوکمڕانێتی شەرعیان بەسەرەوەیە بۆ شەرعی بوونیان ئەم مەرجانە پێویستن:

١. نابێ دژایەتی دەسەڵاتی شەرعی بکەن ئەگەرنا مۆری (بغاة)یان بەنێوچاوانەوە دەنرێ.

٢. نابێ ئەو کۆمەڵو بزووتنەوانە بکرێنە بناغەی دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الولاء والبراء)، چونکە لەنێو مسوڵمانان مەسەلەی (ولاء وبراء) بەس دەبێ لەسەر بناغەی قورئانو سوننەت بێ، کەواتە هەرکۆمەڵو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لەرووی عیلمیو بەرنامەییەوە بەپێی قورئانو سوننەت بەرێوەچوو . کەرێبازی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەتی . وەهەر لەسەر ئەو ئەساسەش دۆستایەتیو دوژمنایەتی لەگەڵ خەڵکیدا کرد ئەوە بەکۆمەڵێکی مسوڵمانی شەرعی دادەنرێ، ئەگەرنا نا.

٣. نابێ لەبناغەی کۆبوونەوەو کۆمەڵبوونی ئەو کۆمەڵو بزووتنەوانەدا هیچ بنەمایەکی سەرەکی هەبێ کەپێچەوانەی یەکێك لەبنەما بنەڕەتییەکانی(أهل السنة والجماعة) بێ.

بەڵام ئەگەر لەو شوێنانەدا بوون کەحوکمڕانێتی شەرعیان بەسەرەوە نیە، ئەوە پێویستە مەرجی دووەمو سێیەمیان تێدابێ. یەکەمیش لەبەر ئەوەی کیانو دەسەڵاتێکی ئیسلامی لەگۆڕێ دانیە، بۆیە باسی دژایەتی‌نەکردنی نەکراوەو ئەویان بەمەرج نەگیراوە.

## چوارەم: مەرجی بنەڕەتی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بوونی کۆمەڵە ئیسلامییەکان:

بۆ ئەوەی هەرکام لەکۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییەکان رێك بەپێی رێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی بێ، بەلانی کەمەوە ئەم چوار مەرجە پێویستن:

١. پابەندی بەرێبازی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیو تێکەڵ‌نەکردنی هیچ بیدعەتێك، واتە هیچ فیکرەیەك لەوانەی کەئەهلی بیدعەتیان پێدەناسرێ.

٢. دۆستایەتیو دوژمنایەتی دەبێ بەس لەسەر بناغەی قورئانو سوننەت بێ، نەك لەسەر شتێکی‌تری پەیداکراوو داهێنراو.

٣. نەبوونی مشتو مڕو کێشەو ئیکاری‌کردن لەگەڵ هیچ کام لەمسوڵمانان لەسەر ئەو

مەسەلانەی کەدەکەونە بازنەی ئیجتیهادەوە[1].

٤. دەبێ هەرکامێکیان لەئاستی خۆیەوەو پێکەوەش چەمکو واتای ڕاستو هەمەلایەنەی کۆمەڵی موسڵمانان (جماعة المسلمین) ڕوون بکەنەوەو کاریشی لەسەر بکەن کەببێتە واقیع، وەهیچ کامیان لای ئەوە لێنەدات کەکۆمەڵی موسڵمانانە!!

## پێنجەم: چەند بنەمایەکی گرنگ بۆ هەڵسو کەوت پێکەوەکردنی کۆمەڵە ئیسلامی یەکان:

١. دەبێ جیاجیایی کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامی یەکان لەسەر بناغە پسپۆڕیو جۆراوجۆری بێت لەکارو چالاکی دا، نەك خوانەکردە بەمەبەستی ناکۆکیو دژایەتی یەکترکردن.

٢. دەبێ یەکدەنگی لەسەر بنەما گشتیو نەگۆڕەکان هەبێو سینگ فراوانیو چاوپۆشیش لەمەسەلە ئیجتیهادیو تایبەتی یەکاندا.

٣. دەبێ پەیوەندیی برایەتی یان لەسەر بناغەی قورئانو سوننەت ببەستن نەك لەسەر بناغەی کۆمەڵو بزووتنەوەکانیان.

٤. دەبێ هەڵوێستیان یەك بخەن لەئاست مەسەلەو کێشە گرنگو بەرژەوەندی یە گشتی یەکاندا.

٥. پێویستە ئامۆژگاریی یەکترکردنو یەکتر ڕاستکردنەوە بەشێوازی برایانەو حەکیمانە هەمیشەو بەردەوام بێ بۆ یەکتر کامڵ کردن.

٦. دەبێ هەموو لایەك ئەندامو لایەنگرانی خۆیان بۆ ئەوە پەروەردە بکەنو بەرەو ئەوە ئاراستە بکەن کەلەداهاتوودا کۆمەڵی موسڵمانان پێك بێنێنو سەر لەبن سەبەتەی جۆغزو بازنە گچکەو تەسکەکانیان دەربێنن.

---

(١) لەکتێبی (الرسالة)ی ئیمامی شافیعیدا خوا لێی ڕازی بێ ئەم وتەو وێژە هاتووە دەربارەی مەسەلە خیلافیو ئیجتیهادی یەکان: «..قال: فإني أجد أهل العلم قديما وحديثا مختلفين في بعض أمورهم، فهل يسعهم ذلك؟ قال: فقلت له: الإختلاف من وجهين: أحدهما محرم ولا أقول ذلك في الآخر. قال: فما الإختلاف المحرم؟ قلت: كل ما أقام الله به الحجة في كتابه وعلى لسان نبيه منصوصا بينا لم يحل الإختلاف فيه لمن علمه، وما كان من ذلك يحتمل التأويل ويدرك قياسا، فذهب المتأول أو القايس إلى معنى يحتمله الخبر أو القياس وإن خالفه فيه غيره، لم أقل يضيق عليه ضيق الخلاف في المنصوص» ل٥٦.

ئیبنو تەیمیەش لەم بارەوە فەرموویەتی: «..وأما من ترجح عنده فضل إمام على إمام أو شيخ على شيخ بحسب اجتهاده كما تنازع المسلمون أيهما أفضل الترجيع في الأذان أو تركه؟ وإفراد الإقامة أو إشفاعها؟ وصلاة الفجر بغلس أو الإسفار بها؟ والقنوت في الفجر أو تركه؟ والجهر بالتسمية أو المخافتة بها، أو ترك قراءتها؟ ونحو ذلك فهذه مسائل الإجتهاد التي تنازع فيها السلف والأئمة. فكل منهم أقر الآخر على اجتهاده. من كان فيها أصاب الحق فله أجران، ومن كان اجتهد فأخطأ فله أجر وخطؤه مغفور له. فمن ترجح عنده تقليد الشافعي لم ينكر على من ترجح عنده تقليد مالك...» مجموع الفتاوى، ب٢، ل٢٠٧.

# ڕێخۆشکردن

شتێکی ئاشکرایە کە(کاری ئیسلامی) کەگرنگترین و مەزنترین کارە وەك هەر کارێکی تر چەند بنچینەو بنەمایەکی هەن کەلەسەریان بنیاد نراوەو بەگوێرەی وان ئەنجام دەدرێ، جائێمە لەم بەشی شەشەمەدا هەوڵمان داوە کەگرنگترین و سەرەکی‌ترین ئەو بنەمار بنچینانە بخەینەڕوو کەلەڕۆژگاری ئێستاماندا کارو جموجۆڵی ئیسلامی‌یان لەسەر بنیاد دەنرێ، دیارە مەرج نیە ئەو چەند بنچینەیەش هەموو ئەو بنچینانەبێ کەبۆ کاری ئیسلامی پێویستن، بەڵام وەك گوتمان هەوڵ دراوە گرنگ‌و سەرەکی‌یەکانیان دەست نیشان بکرێن.

## ١- کارکردن‌و بەڕێوەچوون بەپێی نەخشەو بەرنامە :

یەکەمین‌و گرنگترین کۆڵەکەو بنچینەی کاری ئیسلامی ئەوەیە کەبەپێی نەخشەو بەرنامەیەکی شەرعی‌ی ڕاست‌و ڕەوان بێ. خوای کاربەجێ لەوبارەوە بەپێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿ قل هذه سبيلي أدعوا إلى الله على بصيرة أنا ومن اتبعني وسبحان الله وما أنا من المشركين ﴾ يوسف (١٠٨)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ثم أنزلنا إليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الكتاب ومهيمنا عليه فاحكم بينهم بما أنزل الله ولاتتبع أهوائهم عما جائك من الحق لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا ﴾ المائدة (٤٨)، دیسان فەرموویەتی: ﴿ ثم جعلناك على شريعة من الأمر فاتبعها ولاتتبع أهواء الذين لايعلمون ﴾ الجاثية (١٨).

دیارە ئەو بەرنامەیەش کەدەبێ مشوور خۆرو کارگێڕانی ئیسلامی لەهەر کات‌و شوێنێکدا ڕەچاوی بکەن‌و پەیڕەوی لێبکەن بەس یەك سەرچاوەی هەیە ئەویش قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوایە، ئەو یاسار بنچینانەن کەعەقڵی ساغ‌و سەلیم لەقورئان‌و سوننەت هەڵیان دەهێنجێ، بۆیەش قورئان‌و سوننەتمان بەسەرچاوەی ئەو نەخشەو بەرنامەیە داناوە نەك خودی بەرنامەکە، چونکە قورئان‌و سوننەت بەرنامەو پەیڕەوی گشتی‌و سەرتاسەری‌ی موسڵمانانن بەدرێژایی ڕۆژگارو بەپانایی زەمین، بەڵام لەهەرکات‌و شوێنێکی دیاری‌کراودا پێویستە موسڵمانان چەند بنەمار بنچینەیەك لەقورئان‌و سوننەت هەڵبهێنجن کەئەو کارو بارانەیان لەسەر هەڵسووڕێنن‌و ئەو گیروگرفت‌و کێشانەی خۆیان پێ چارەسەر بکەن کەلەو بارودۆخ‌و ژینگە (بیئة) تایبەتی‌یەی خۆیاندا پەیدا دەبن‌و یەخەیان پێدەگرن. کەواتە هەرچەندە ئێمە تەنها یەك قورئان‌و سوننەتمان هەیە. بەڵام بەئەندازەو ژمارەی ئەو بارودۆخ‌و ژینگە جیاجیاو جۆراو

جۆرانە پێویستە نەخشەو بەرنامەی كارو چالاكی جیاجیاو جۆراوجۆرمان هەبێ هەرچەندە لەنێوەرۆكو ئامانجە سەرەكییەكانیشیاندا هەر یەكن!

دەتوانین بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی مەبەستیش هەركام لە (حسن البنا) و (أبو الأعلى المودودي) و (سەعیدی نوورسی) بەنموونە بهێنینەوە، كەهەریەكێكیان لەسەر بنچینەی قورئانو سوننەت ڕۆیشتوون، بەڵام لەبەر جیاوازیی كۆمەڵگاو باروودۆخی جێگای كارتێداكردنیان كە (میسرو پاكستانو توركیا) بوون، بەشێوەیەكی سرووشتیو وەك ئەنجامێكی مەنتیقیو چاوەڕوانكراو بەرنامەو نەخشەكانیشیان جۆراوجۆر بوون!

## ٢. كاروبار هەڵسووڕاندن لەسەر بنچینەی ڕاوێژ ( الشورى ):

پاش هەبوونی بەرنامەو نەخشەی ڕاستو درووست بۆ كار، هەبوونی خەسڵەتی ڕاوێژ لەئاستی قیادەو قاعیدەی كۆمەڵو كۆمەڵگای ئیسلامیدا گرنگترینو كاریگەرترین بنچینەی كاری ئیسلامییە، چونكە مادام بەڕێوەبردنی ئیسلامو موسڵمانەتیكردن وردەو درشتی موسڵمانان لەدنیاو قیامەت تێیدا بەرپرسیارن، شتێكی سرووشتیو مەنتیقییە كەئەو كارەی هەموویان لەئاكامەكەی بەرپرسیارن لەسەرەتاو چۆنیەتی كردنو ئەنجامدانیشیدا بەشدار بن، دیارە جەوهەری (ڕاوێژ) یش بریتییە لەكۆكردنەوەی شێلەی هەموو عەقڵو دڵەكان بۆ پێكهێنانی شاندی پوختی بڕیارەكان، بەدیلی شوراش جگە لەحوكمی تاكیو دیكتاتۆریەت هیچیتر نییە!

هەربۆیەش خوای زانا كەباسی (ڕاوێژ) ی كردووە لەسوورەتی (الشورى) دا خستوویەتە نێوان نوێژو ماڵبەخشین (زەكات) ەوە كەدوو كۆڵەگەی هەرە گرنگی ئیسلامەتین، ﴿ والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون ﴾ الشورى (٣٨) تاكو موسڵمانان تێبگەن كەڕاوێژكردنو پرسوڕا بەیەكتركردنیان لەهەموو ئاستەكاندا هەروا شتێكی سووكو سادە نییە لەڕیزی نوێژو زەكاتە! دیارە نوێژو زەكاتیش لەدوای شایەتمان گەورەترین پایەن لەو پێنج پایە ئیسلامەتییان لەسەر بنیات نراوە بەدەڵی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ﴿ بني الإسلام على خمس: شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وصيام رمضان، والحج ﴾ متفق عليه.

دیارە دەقی تریش لەقورئانو سوننەت زۆرن دەربارەی (ڕاوێژ) كەبەپێویستی نازانم هەموویان بنووسین، پێشینانیش جوانیان گوتووە: (ڕازت لای یەكێك بێ‌و پرست لای هەزار!).

## ٣. مەرکەزیەتێکی هەڵقوڵاو لەشورا :

مەرکەزیەت کەبریتی‌یە لەکۆبوونەوەی دەسەڵات‌و ئاراستەکردن لەیەك چەق (مرکز) دا ئەمیش ئەسڵێکی تری گرنگە لەکاری ئیسلامی‌داو ئایەت‌و فەرموودەی زۆریش لەبارەوە هەن، بۆ وێنە، ﴿ یاأیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولی الأمر منکم ﴾ النساء (٥٩). ﴿ إذا خرج ثلاثة فی سفر فلیؤمروا أحدهم ﴾ رواه ابوداود.

بۆیەش گوتوومانە (هەڵقوڵاو لەشورا) چونکە مەرکەزیەت ئەگەر لەسەر بنچینەی راوێژ نەبێ دەبێتە تاکڕەوی‌و دیکتاتۆریەت. بەڵێ هەروەك چۆن بەدیلی مەرکەزیەت پاشگەردانی‌و بێ‌سەروبەری (الفوضی) یە. بەدیلی شوراش تاکڕەوی‌یە کەئەمیش جگە لەخودای زاناو دادگەر ماف‌و شایستەی کەس نی‌یە ئەگەر پێغەمبەری خواش بێ ﷺ، هەربۆیەش پێغەمبەری خواو چوار خەلیفە رێنمایی‌کراوەکانی لەهەموو کەس زیاتر خاوەنی ئەوخەسڵەتە بەرزە بوون مەگەر چۆن دەنا هیچ کارو بارێکیان بەبێ راوێژ ئەنجام نەدەدا.

پێشینانیش دەبارەی گرنگی مەرکەزیەت ئەم مەسەلەیە دەگێڕنەوە:

دەڵێن لەکابرایەکیان پرسی بەڵگەت چی‌یە لەسەر (یەکتایی خوا)؟ ئەویش گوتی: ئاشەکەی مام ئاوەدل، چونکە ئەو ئاشە هەتا مام ئاوەدل بەس خۆی سەرپەرشتی‌ی دەکرد زۆرباش کاری دەکرد، بەڵام کەوەستا زۆربوون ئاشەکە تێکچوو!

## ٤. پێگەیاندنی کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی پێشڕەو :

بەڵێ... ئەمیش بنچینەیەکی گەورەو گرنگی کاری ئیسلامی‌یە لەهەرکات‌و شوێنێك‌دا، چونکە بەبێ هەبوونی کەسانێکی ئەوتۆ ئەو بەرنامەیەی لەبەرچاو گیراوە پیادە ناکرێ‌و ئەو ئامانجانەی رەچاوکراون نایەنەدی. هەبۆیەش پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لەشاری مەککەدا سێزدە ساڵی رەبەق سەرگەرمی پەروەردەکردن‌و پێگەیاندنی ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردەو دانسقەیە بوو، کەپاشان هەر ئەوانیش شایستەی جێنشینایەتی‌و درێژە پێدانی خەت‌و رێبازەکەی بوون لەدوای خۆی. بۆیەش خوای کاربەجێ لەو قۆناغەدا پێی دەفەرموو: ﴿ واصبر نفسك مع الذین یدعون ربهم بالغداة والعشی یریدون وجهه ولاتعدوا عیناك عنهم ﴾ الکهف (٢٨).

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەپەروەردەکردن‌و پێگەیاندنی کەسانێکی ئاواش تەنهاو تەنها لەکەش‌و باروودۆخێکی پڕ کردو کۆشش‌و خەبات‌و خەم‌و خوێن‌و ئێش‌و ژانەدا مەیسەر دەبێت‌و باهیچکەس واگومان نەبات کەئەو بەدانیشتنەوەو لەنێو نوێنی گەرم‌و نەرمەدا ئەو کارەی بۆ دەکرێ. خوای زاناش هەر لەکەسێکی وادا باسی بارهاتن‌و لەکاڵ دەرچوونی ئەو جۆرە پیاوان (رجال) ە دەکات: ﴿ لقد کان لکم فی رسول الله أسوة حسنة لمن

کان یرجوا الله والیوم الآخر وذکر الله کثیرا. ولما رای المؤمنون الأحزاب قالوا هذا ما وعدنا الله ورسوله وصدق الله ورسوله ومازادهم إلا إیمانا وتسلیما. من المؤمنین رجال صدقوا ماعاهدوا الله علیه فمنهم من قضی نحبه ومنهم من ینتظر وما بدلوا تبدیلا ﴾ الأحزاب (٢١-٢٣). پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ مامن نبي بعثه الله في أمة قبلي إلا کان له من أمته حواریون وأصحاب یأخذون بسنته ویقتدون بأمره ﴾ رواه مسلم.

## ٥- یەکدڵیو یەکریزی ، یەکدەنگیو یەکڕەنگی :

یەکبوون (وحدة) ی موسڵمانان ئەنجامو بەرهەمی سرووشتیی بیرو باوەڕو بەرنامەو ئامانجیانە، بەڵام لەسزنگەی ئەوەوە کەخوای کاربەجێ بەمەبەستی بەهێزو پێزبوونو ڕەنگاو ڕەنگبوونی ژیانی مرۆڤایەتی ئینسانەکانی بەعەقڵو سەلیقە جیاجیاوە خوڵقاندووە، ئیسلام جیاوازی لەبیروڕاو بۆچوونەکاندا بەڕەوا داناوە. بەڵام یەکگرتنو پێکەوە جۆشخواردنی دڵەکانی بەلەوز لەقەڵەم داوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ واذکروا نعمة الله علیکم إذ کنتم أعداءا فألف بین قلوبکم فأصبحتم بنعمته إخوانا ﴾ آل‌عمران (١٠٣)، بەڵێ لەئیسلامدا جێگای (إختلاف العقول) هەیە. بەڵام بۆ (قلوب) تەنها (إئتلاف) ڕەوایە. چونکە دڵی برواداران لەسەر بناغەی خواناسیو ئیمان هەموویان یەکتر دەناسنو پێکەوە جۆش دەدرێن هەربۆیە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ الأرواح جنود مجندة فما تعارف منها ائتلف وما تناکر منها اختلف ﴾.

هەڵبەتە کەدەڵێین جیاوازی عەقڵو سەلیقەکان لەئیسلامدا ڕێگای هەیە مەبەست لەو جیاوازییانەیە کەلەبازنەی فراوانی شەریعەتدان، ئەگەرنا یەکبوونی موسڵمانان لەشتە بنەڕەتیو سەرەکییەکاندا هەر پێویستە مەرجە بۆ یەکڕەنگیو یەکدەنگیانو سوپاس بۆ خوا زاناو پێشەوایانی ئیسلامیش زۆر باش ئەو دوو بوارەیان . واتە ئەو بوارەی کەجیاوازی تێدا ڕەوایەو ئەوەیان کەتێیدا ڕەوا نییە . ڕوون کردوونەوەو وەك ماشو برنج لەیەکیان هەڵاواردوون.

## ٦- فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە مافی هەمووانەو هەمووش بەرپرسیارن :

ئەمیش یەکێکی ترە لەبنچینە هەرە گەورەو گرنگەکانی کاری ئیسلامی لەهەموو قۆناغەکانیدا چونکە حیکمەتی خوای کاربەجێ لەهێنانە سەر شانۆی دنیای ئومەتی ئیسلام چەسپاندنی هەموو چاکەیەكو بنبڕکردنی هەموو خراپەیەکە، وەك فەرموویەتی: ﴿ کنتم خیر أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنکر وتؤمنون

بالله ﴾ آل‌عمران (١١٠).

بۆیە لەخاڵە هەرە گرنگەکانی پێناسەکردنی کۆمەڵی موسڵمانان‌دا فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەی کردۆتە سەرمەشق، وەك فەرموویەتی: ﴿ والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله ﴾ التوبة (٧١).

پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو ئەرکە گرنگەو پیرۆزەی وەك فەرزێکی عەینی خستۆتە ئەستۆی تاك تاکی موسڵمانانی ئومەتەکەیەوەو فەرموویەتی: ﴿ من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه ﴾ رواه مسلم.

دەربارەی بەرپرسیارێتی (مسؤولية) ی یەك یەکی ئەندامانی کۆمەڵگای ئیسلامیش لەئاقار کۆمەڵگاکەیان‌دا فەرموویەتی: ﴿ كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته ﴾ متفق عليه. تاکو بڕوبیانوو بەدەست هیچ کەسێکەوە نەهێڵێ بۆ کەمتەرخەمی و خۆکرکردن و خۆبواردن!

## ٧- ئازادی دەربڕینی بیروڕاو گوێ‌گرتن لەهەموو کەس:

کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەر بناغەی ئازادی و ڕزگاربوون لەهەر جۆرە کۆت و زنجیرێکی ماددی و مەعنەوی بنیاد دەنرێ و ڕێزو حورمەتی تەواو لەئینسانێتی هەر ئینسانێك و ویستی ئازادی دەگیرێ و، نەهیچ کەس لەوە بەگەورەتر کەرەخنەی لێبگیرێ تەماشا دەکرێ. ئەگەر تەنانەت پێغەمبەری خواش بێ لەبواری ئیجتیهادو ڕەئی شەخسی خۆیدا. وەنەهیچ کەسیش لەوە بەبچووکتر دادەنرێ کەرەخنەو تێبینی و بۆچوونی خۆی دەربارەی هەرکەسێك و هەرشتێك بخاتەڕوو. خوای پەروەردگار لەپێناسەی کۆمەڵی موسڵمان‌دا فەرموویەتی: ﴿ فبشر عباد الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه أولئك الذين هدى الله وأولئك هم أولوا الألباب ﴾ الزمر (١٧-١٨).

لەسیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدینەکانیشی‌دا دەیان هەڵوێستی وا تۆمارکراوە کەرەخنەو پێشنیارو تێبینی لەگچکەترین کەس قبووڵ کراوەو بەدڵەبشی کراوە. بۆوێنە: (ابن إسحق) لەکتێبی (السيرة النبوية) دا لەبەسەرهاتی جەنگی (بەدر) دا دەگێڕێتەوە کەچۆن پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێشنیاری (حەبابی کوڕی مونذیری کوڕی جەموح) هەڵوێستی خۆی دەگۆڕی و بەپێی نەخشەی (حەبباب) سوپاکەی لەو شوێنە دەگوازێتەوە کەتێیدا دایمەزراندووە!

هەروەها مەسەلەی عومەری کوڕی خەتتاب و باسی (مارەیی زۆر) کەلەسەر ڕەخنەو تێبینیی ئافرەتێك لەسەر قسەی خۆی دێتە خوارو دەفەرموێ: ﴿ أصابت امرأة وأخطأت عمر ﴾!

## ٨- هەوڵدانی بەردەوام بۆهەرچی زیاتر تێگەیشتنی دین و باشتر ئاشنابوون بەژین :

چونکە بەبێ شارەزایی لەدیندا ئینسان نازانێ چی دەکات و، بەبێ ئاشنابیش بەواقیعی ژین نازانێ چۆن بکات!

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين ويلهمه رشده ﴾ متفق عليه.

دیارە بەخۆرایی نییە کەپێغەمبەری پێشەوامان ﷺ خێرو خۆشی هاتنەری بەهەرکام لە (فقه) و (رشد) هوە بەستۆتەوە، ئاخر ئەگەر (فقه) لەئایندا مایەی شارەزایی و بەرچاو ڕوونییە، (رشد) یش مایەی سەرراستی و وەستایی و لیزانییە. ڕوونتر بڵێین: ئەگەر لەسۆنگەی (فقه) هوە دەتوانین دیاری بکەین (چی) و (چەند) ی ئایین دابەزێنینە سەر واقیعێکی دیاری کراوو تووشی هەڵە نەبین! بەهۆی (رشد) یشەوە دەتوانین بەوەستایی و دانایی پرۆسە (عملية) ی ئەو دابەزاندن و پیادەکردن (التنزيل والتطبيق) ە جێبەجێ بکەین و گیرۆدەی داوو تەڵە نەبین!

## ٩- لێهاتوویی و شایستەیی کردنە سەنگی مەحەکی کارپێسپاردن :

ئەمیش کۆڵەکەیەکی تری گرنگی کارو خەباتی ئیسلامیە بەو هەم لەقورئانی بەپێزو هەم لەسوننەتی پێغەمبەری بەڕێزیشماندا ﷺ زۆر داکۆکی لەسەر کراوە. بڕوانە: ﴿ إن الله اصطفاه عليكم وزاده بسطة في العلم والجسم ﴾ البقرة (٢٤٧). هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وجعلنا منكم أئمة يهدون بأمرنا لما صبروا وكانوا بآياتنا يوقنون ﴾ السجدة (٢٤). هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ياأبت استأجره إن خير من استأجرت القوي الأمين ﴾ القصص (٢٦).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ والله نحن لانولي هذا الأمر من طلبه أو حرص عليه ﴾.

بەڵێ... جگە لەبەمەرج گرتنی ئەو خەسڵەتانەی کەئینسان پێیان دەبێتە شیاوی کار ڕاپەراندن و مشوورخواردن، لەئیسلامدا هیچ خەسڵەت و ئیمتیازێکی تر لەڕەگەزو ڕەنگ و ڕەچاو و سامان و... هتد ڕەچاوکراوەو حیسابی بۆ نەکراوەو بەڕێزترینی موسڵمانان بەپارێزکارترینیان لەقەڵەم دراوە: ﴿ إن أكرمكم عند الله أتقاكم ﴾ الحجرات (١٣). دیارە ڕێی پارێزکارتربوونیش هیچ کۆسپ و ئاستەنگێکی لەسەر نییەو لەبەردەم هەمووناندا تەخت و ئاچووغەو بەس هەوڵ و هیممەتی ئینسانی دەوێ!

## ١٠. پەروەردەو پارهێنانێکی هاوسەنگ:

هاوسەنگی (توازن) یەکێکە لەسیفەت و دروشمە هەرە زەقەکانی ئیسلام و پێویستە کۆمەڵێکیش کەدەویسترێ ئیسلامیان پێ ببووژێنرێتەوە هەر لەسەر ئەم بنچینەیە پەروەردە بکرێن چونکە گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەشی لێدەڕژێ و کەسێک یان کۆمەڵێک خۆیان لاتەڵ و لاسەنگ بن دیارە کارو بەرهەمیشیان هەروا دەبێت.

دیارە دەقی قورئان و سوننەتیش دەربارەی ڕەچاوکردنی هاوسەنگی لەدینداری کردندا زۆر زۆرن لەهەموو بوارەکانی ژیندا بەڵام یەکی نموونەیەک لەقورئان و سوننەت دێنینەوە:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وابتغ فيما آتاك الله الدار الآخرة ولاتنس نصيبك من الدنيا وأحسن كما أحسن الله إليك ولاتبغ الفساد في الأرض إن الله لايحب المفسدين﴾ القصص (٧٧).

ئەمەش نموونەیەک لەسوننەت: ﴿جاء رهط يسألون عن عبادة النبي ﷺ فلما اخبروا تعالوها، قال احدهم: أما أنا فإني أصلي الليل أبدا، وقال آخر: أنا أصوم الدهر ولا أفطر أبدا، وقال آخر: وأنا أعتزل النساء فلا أتزوج أبدا. فجاء رسول الله ﷺ إليهم وقال: أنتم القوم الذين قلتم كذا وكذا؟ أما والله اني لأخشاكم الله وأتقاكم له، لكني أصوم وأفطر، وأصلي وأرقد وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني﴾ رواه البخاري ومسلم.

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە هەم تەرازوویەکی گرنگە و هەم هەڕەشەیەکی گەورەتە بۆکەسانێک کەدەیانەوێ بەناوی دینداری و موسڵمانەتی لەجیاتی (هدى) شوێن (هوى) دەکەون و لەباتی (شرع) بەقسەی (طبع) ی خۆیان بکەن.

بەڵێ دەبێ هەرکام لەئەندامانی کۆمەڵی موسڵمان واپەروەردە بکرێ کەلەیەک کاتدا: خواپەرستێکی صالح، سیاسەتمەدارێکی کارامەو، پارێزکارێکی چاوبەفرمێسک و جەنگاوەرێکی چەنگ بەخوێن و، عاقڵمەندێکی تێگەیشتوو وردبینێکی پێگەیشتوو ودوارۆژخوازێکی بێ پشوو و دنیاناسێکی بەعەقڵ وخوو و... هتد بێ!

نەک وەک زۆربەی موسڵمانانی ئێستا کەیان خواپەرستێکی فەقیرحاڵ و بێسیاسەتە یان سیاسییەکی پارێزنەکەرو کەم حورمەتە! یان تەقوای هەیەو لەتەقە دەترسێ. یان خەریکی شەڕەو لەتەقوا ناپرسێ! یان شەرعزانێکی دڵمردووە یان صۆفییەکی ڕێلێ‌ونبووە! یان (سەلەفی) یەکی ئیشک و مەزهەب نەناسە. یان مەزهەبییەکی بیر تەسک و کەساسە!

## ١١. چەسپاندنی دادگەری لەنێو خۆدا لەهەموو ڕوویەکەوە:

ئەمیش یەکی ترە لەپایەو بنچینە گرنگەکانی کاری ئیسلامی کەکۆمەڵی موسڵمان بێی هەڵدەستێ، چونکە ئیسلام . کەبەرنامەی تێکڕای پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوایە .

لەدوای خوا بەیەکگرتن (التوحید) گەورەترین ئامانجی چەسپاندنی دادگەری هەمەلایەنەیە لەژیانی مرۆڤایەتیدا، وەك خوای دادگەر بەراشکاوی فەرموویەتی: ﴿ لقد أرسلنا رسلنا بالبينات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط وأنزلنا الحديد ﴾ الحديد (٢٥).

جابەدەردی پێشینان کەگوتوویانە (بەردی گەورە نیشانەی پێ‌نەدانە) و کۆمەڵێکی ئیسلامی نەتوانێ لەنێو خۆیدا دادگەرانە ڕەفتار بکات. مەحاڵە بتوانێ لەنێو خەڵکیدا دادگەری بچەسپێنێ چونکە (چێشتی خۆش لەبەرەوە دیارە)!

دیارە دادگەریش زۆرشت دەگرێتەوە کەدەتوانین ئەم چەند خاڵەی بەنموونە لێ‌بخەینەروو:

یەکەم: خەڵکی لەمافی ژیانو کاسبیو رادەربڕینو بەرپرسیارێتی... دا یەکسانن وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ الناس مستوون كأسنان المشط ﴾ اخرجه الديلمي.

دووەم: هەموو کەس بەپێی لێوەشاوەیی‌و لێهاتوویی خۆی مافی ئەوەی هەیە کاربەدەست‌و بەرپرسی کاروباربێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته ﴾.

سێیەم: خەڵکی لەبەرانبەر دەستوورو یاساکاندا یەکسانن‌و هیچ کەس لەسەرووی بەرنامەوە نی‌یەو لە (یاسا) بەرزتر نی‌یە. وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ والذي نفس محمد بيده لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها ﴾ رواه البخاري.

چوارەم: سەنگی مەحەکی بەرزی‌و نزمی‌و پێوەری هەڵسەنگاندنی موسڵمانان بەس پارێزکاری (تقوى) یە: ﴿ إن أكرمكم عند الله أتقاكم ﴾ الحجرات(١٣).

## ١٢. چاوکردنەوەو فێرکردن‌و هۆشیارکردنەوەی جەماوەر:

(حق) لەسۆنگەی ئەوەوە کەلەخۆی دڵنیایەو پشت ئەستوورە، بێ‌منەتە لەکەشف‌بوون‌و دەرکەوتن. بگرە زۆر زۆریش حەز بەڕووناکی دەکات‌و زۆریش دوژمنی تاریکی‌و پەنار پەسیوو شوێنی پەنهان‌و نەدیوە. بەڵام (باطل) بەپێچەوانەوە چونکە هەمووی سەرتاپا عەیب‌وعارو عەورەتە زۆر بەرۆشنایی قەڵسەو هەمیشە عەودالی تاریکی‌و حەشارگەو پەنار پەسیوە. هەربۆیەش بەدرێژایی مێژوو نەمروودو فیرعەون‌و ئەبووجەهلەکان لەئاقار ڕووی درەوشاوەو گەشی هەق‌و دەنگی سازگارو زوڵاڵی‌دا کەلەسەر دەستی پێغەمبەرانی پایەبەرزی وەك ئیبراهیم‌و موسا‌و موحەممەد ڕانوێنراوە. پەنایان بردۆتە بەر سەرەتا چەواشەکردن‌و فریودان‌و خەڵەتاندنی جەماوەر. کەلەمەش بێ هیوا بوو ون پەنایان بردۆتە بەر هەرەشەو گوڕەشەو زەبرو زەنگ: ﴿ قالوا حرقوه وانصروا آلهتكم إن كنتم فاعلين ﴾ الأنبياء (٦٨). ﴿ قال لئن اتخذت إلها غيري لأجعلنك من

المسجونين ﴾ الشعراء (٢٩). ﴿ وإذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك أو يقتلوك أو يخرجوك ﴾ الأنفال (٣٠).

بەڵێ چاوکردنەوەی جەماوەر لەئاقار بەرنامەی خواداو هۆشیارکردنەوەو حاڵی کردنی لەڕاستییەکان (الحقائق) کاریگەرترین و بەهێزترین چەکی دەستی هەڵگرانی مەشخەڵی دینی خوایە. هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ وجێنشینە ڕەسەنەکانیشی خوا لێیان ڕازی بێ هەمیشە لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا پەیوەندیی توندو تۆڵیان هەبووەو هەر ڕووداو مەسەلەیەکی گرنگ هاتبێتە[1] پێش لەسەر مینبەر بەڕاشکاوی بۆ جەماوەریان باس کردووەو ئەگەر خواستبێتی پرس و ڕایان پێ کردووەو گوێیان لەبیرو بۆچوون و پێشنیارەکانیشیان گرتووە.

دیارە جەماوەرێکیش چاوەڕوانی هەڵوێستنواندن و پشتگیری کردنی هەق و ڕاستی لێدەکرێ کەهۆشیارو چاوکراوەبێ و بزانێ دنیا چ باسە.

## ١٢. بەتەنگ خەڵکەوە بوون و حەل کردنی گیروگرفتەکانیان:

خوای کاربەجێ دەربارەی کۆمەڵی موسڵمانان فەرموویەتی: ﴿ الذين إن مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وآتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ﴾ الحج (٤١). دیسان فەرموویەتی: ﴿ يا أيها الذين آمنوا اركعوا واسجدوا واعبدوا ربكم وافعلوا الخير لعلكم تفلحون ﴾ الحج (٧٧).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ خير الناس أنفعهم للناس ﴾ رواه القضاعي عن جابر. دیسان فەرموویەتی: ﴿ ومن أصبح لا يهتم للمسلمين فليس منهم ﴾ رواه الحاكم.

بەڵێ... کۆمەڵی موسڵمان تاك تاکیان و بەتێکڕاش خزمەتگوزاری و بەتەنگ خەڵکەوەبوون و بەدەنگەوە چوونیان و چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانیان و بەختەوەرکردنیان بەجۆرێکی بەرزی خواپەرستی و دینداریەکەیان دەزانن و لەهیچ چاکەو هاوکاری و دەستگرۆیییەك دریغی ناکەن چونکە دەزانن کەهەر لەڕووخۆشیبوون و قسەیەکی خۆشەوە بگرە هەتا هەموو جۆرە شێوەکانی چاکەکاری و خزمەتگوزاری پاداشتی بەرزی خوایان لەبەرانبەردا هەیەو مایەی سەربەرزی و ڕووسووری دنیاو قیامەتن. خوای دادگەرو میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ من عمل صالحا من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة ولنجزينهم بأحسن ما كانوا يعملون ﴾ النحل (٩٧).

دیارە بەبەلاشیش نییە کەگوتراوە: (الإنسان عبد الإحسان)! پێشینانیش جوانیان

---

(١) بەڵگە نەویستە کەمەسەلەو بابەتی واش هەبوو ون بەرژەوەندی لەوەدا بووبێ کەهەنێکێوەی تایبەت و لەبازنەی تەسکدا ڕاوێژوو لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ و بەگشتی باس نەکرێن.

گوتووە: (بۆیە پێت دەڵێم خاڵە چۆڵەکانم بۆ بگری!).

## ١٤. لێبڕان و پشوودرێژی و کاری بەردەوام:

ئەمیش بنچینەیەکی تری گرنگی کارو خەباتی ئیسلامییە لەهەموو چاخ و رۆژگارێکدا، چونکە بەڕاستی هیچ کارێکی گرنگ بەبێ راوەستاوی (إستقامة) و خۆڕاگری و پشوودرێژی ناکرێ، هەربۆیەشە کەلەدەیان جێگەی قورئانیدا خوای زانا ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کەخۆڕاگرو نەبەز بێت، دڵدامەزراوو نەلەخشاو بێت، هەڵبەتە دەقی قورئان و سوننەت لەوبارەوە یەکجار زۆرن، بۆوێنە: ﴿ إن الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة أن لاتخافوا ولاتحزنوا وابشروا بالجنة التي كنتم توعدون ﴾ فصلت (٣٠).

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ خير الأعمال أدومها وإن قل ﴾.

بێگومان کاری ئیسلامی کارێکی یەکجار بەرزو مەزن و گرنگە و پیاوی لەقەدەر خۆشی پێویستە و هەرکەسەش و هەر کۆمەڵەش بەئەندازەی ئەوە کە (تجرد) و ئیخلاص و هەوڵ و هیممەت و کردوکۆشی بەو کارە دەبەخشێ بەبارتەقای ئەوەش کرێ و پاداشتی دوارۆژ و بەرێزو بەرهەمی دنیاشی دەستگیر دەبێ. کەم بەکەم و زۆریش بەزۆر ﴿ وماربك بظلام للعبيد ﴾.

## ١٥. چاودێری و لێپرسینەوەی خەڵکی بەگشتی و کاربەدەستان بەتایبەت:

خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا ﴾ البقرة (١٤٣) لەم ئایەتە بەپێزەدا خوای کاربەجێ چاودێرایەتی و بەسەرراگەیشتن و مشوورخۆرێتی بەئەرکی سەرشانی پێغەمبەری کۆتایی و تێکڕای ئوممەتەکەی لەقەڵەم داوە، بەڵام دیارە توانای شایستەیی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گرنگ و مەزنەی بەستۆتەوە بە (چاکتر) بوونی ئوممەتەوە کەلێرەدا بەوشەی (وسطا) تەعبیری لێداوەتەوەو لەسوورەتی (آل‌عمران) یشدا بە(خير أمة)!

بەڵام چاودێرێتی پێغەمبەر ﷺ ی تایبەت کردووە بۆ ئوممەتەکەیەوەو ئی ئوممەتەکەشی گشتاندووە بەهەموو مرۆڤایەتییەوە. جاشتێکی روونە کەپێغەمبەری پێشەوا ﷺ بەچاکترین شێوە ئەرکی چاودێرایەتی و بەسەرراگەیشتن و مشوورخۆرێتی لەگەڵ ئوممەتەکەیدا ئەنجام داوە و هەربەوەندەش لێنەگەڕاوە کەلەرۆژگاری خۆیدا ئەو ئەرکە بەجێ بێنێ بەڵکو بۆدوای خۆشی لەچەندان فەرموودەیدا ئاماژەی کردووە بۆ حاڵ و باڵی ئوممەتەکەی و گەلێک لەو نەخۆشی و دەردانەی کەلەسەدەکانی دوای خۆیدا

ئومەتەکەی گیرۆدەیان دەبێ پەنجەی لەسەر داناوەو ئومەتەکەی لێیان ئاگادار کردۆتەوە!!

کەواتە: ئێستا ئومەتی ئیسلام لەژێر ئەزموونێکی گەورەو گرنگ دایە. داخوا تاچ رادەیەك دەتوانێ شوێن پێی پێغەمبەری خۆی هەڵگرێو شایستەی ئەوەبێ کەچاوەدێرو مشوورخۆربێ بەسەر رەوتی کاروانی مرۆڤایەتیو نەهێڵێ دووچاری هەڵدێربوونو لادانبێ!!

چاپارە هەر کۆمەڵو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی دەبێ هەم لەچوارچێوەی تایبەتی خۆیدا ئەو ئەرکە ئەنجام بداتو، هەم لەبازنەی فراوانی کۆمەڵگاو دواتر ئومەتیشدا، بەتایبەت لەگەڵ کاربەدەستو دەسەڵاتداراندا.

## ١٦. پشت بەخوا بەستنو لەسەر پێیخۆ وەستان:

ئەمیش یەکێ ترە لەکۆڵەکەو پایە گرنگەکانی کارو خەباتی ئیسلامیو هەر کۆڕوکۆمەڵێکی ئیسلامی بەئەندازەی ئەوە کەدەتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێو لەسەر پێی خۆی بوەستێو پشت هەر بەخوا ببەستێ، بەرەوسەرو داسەزراو دادەنرێو بەپێچەوانەوەش بەپێچەوانەوە. هەربۆیەش خوای زاناو وردبین بەپێغەمبەری خۆی فەرمووە: ﴿ یاأیها النبي حسبك الله ومن اتبعك من المؤمنین ﴾ الأنفال (٦٣).

دیارە پشت بەخوابەستنو متمانەو باوەڕ بەخۆبوونو رەگو ریشە بەئاوبوونەوەو رۆچوون بەنێو خەڵكو جەماوەردا سێ کۆڵەکەی سەرکەوتنو بەمراد گەیشتنی هەر کۆمەڵو بزووتنەوەیەکی ئیسلامینو هیچ کامێشیان جێگای ئەوانیتر پڕناکاتەوەو هەرسێکیان پێکەوە پێویستن. پێویستە ئەوەش بگوترێ کەلەسەرپێی خۆوەستانو پاراستنی سەربەخۆیی (إستقلال) یخۆ لەشارو قورساییەکی زۆردەخاتە سەر کۆمەڵی موسڵمانو باج (ضریبة) یکی گەورەیان لێ داوا دەکات، بەڵام هەرچۆن بووەو بەهەر نرخێك بووە ناچارنو بەدیلیان بۆی نییە.

## ١٧. پاراستنی ئابروو و عیززەتی ئیسلام:

دیارە ئابروو و عیززەتی ئیسلام لەموسڵماناندا تەجەللا دەکات. موسڵمانانیش بەتایبەت کۆمەڵو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی کەلەگۆڕەپانی کارو تێکۆشانی دایە بۆ ئیسلام. ئابرووی ئیسلام بەوە دەپارێزن کەلەبواری هەڵسوکەوتو رەفتاردا لەگەڵ خەڵکی نموونەی هەرە بەرزو جوانی چاکەکاریو دادگەری بن. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ أن تبروهم وتقسطوا إلیهم إن الله یحب المقسطین ﴾ الممتحنة (٨).

وەنابێ هیچ کاتێك بهێڵن کەغەیری خۆیان لەوان چاکترو خۆشڕەفتارترو بەرێزترو حورمەتتر بنو دەبێ هەوڵ بدەن هەمیشە دەستی چاکەو پیاوەتییان لەسەر غەیری

خۆیان بێ‌و هیچ کەس لەو بوارەدا نەتوانێ تۆزی ڕێگاشیان بشکێنێ. چ‌جای خوانەکردە بەجێیان بهێڵێ‌و لەتەپ‌و تۆزی چاکەو پیاوەتی‌دا تێوومیان بکات!

پاراستنی عیززەتیش بەوە دەبێ کەکۆمەڵی مسوڵمان سیاسەتی ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاری بەچەك‌و هێز نەگرێتە بەر هەتا دەگاتە قۆناغ‌و کاتی خۆی‌و پێداویستی‌یەکان (مستلزمات) ی بۆ دابین دەکات بەگوێرەی توانا. وەهەرکاتێك کەوتە قۆناغی بەرەنگاری‌و جەنگیشەوە هێندە زەبری توندو گورچووبڕ بوەشێنێ‌و بەشێوەیەك لەدوژمن بدا کەبەچۆکی دابێنێ‌و لەخۆڵی وەرگەوزێنێ! وەك قورئان فەرموویەتی: ﴿ فشرد بهم من خلفهم ﴾ الأنفال (٥٧).

## ١٨. ڕەچاوکردنی ڕۆیشتن لەگرنگترەوە بۆ گرنگ:

ئەمیش یەکی ترە لەبنچینە گرنگ‌و مەزنەکانی کاری ئیسلامی. وەلەڕاستی‌دا کارو خەباتی ئیسلامی بەبێ ڕیزکردنی (اولویات) دوچاری گەلێك هەڵەو پەڵەو لادان دەبێ. دیارە دەقی قورئان‌و سوننەتیش لەبارەوە زۆرن بۆزینە؛ هەمیشە لەقورئان‌دا کەئیمان‌و کردەوەی باش باس کرابێ (الإیمان) پێش (العمل الصالح) خراوە. مەگەر بەدەگمەن‌و ئەوەش لەبەر هۆو حیکمەتێك.

پێغەمبەری خوایش ﷺ کاتێك (موعاذی کوڕی جەبەل) ی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: بایەکەمین شت کەئەوانی بۆ بانگ دەکەی (لاإله إلا الله) بێت. پاشان پێنج نوێژە فەرزەکان. پاشان زەکات....

عائیشەش خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: یەکەمین شت کەخوا بۆ پێغەمبەری نارد باسی بەهەشت‌و دۆزەخ بوو. جاکاتێك خەڵکی گەڕانەوە بۆ ئیسلام ئەوجا باسی حەڵاڵ‌و حەرامیان بۆکرا. خۆ ئەگەر هەر لەسەرەتاوە پێیان گوترابا دزی مەکەن! دەیانگوت قەت دزی تەرك ناکەین. یان پێیان گوترابا شەراب مەخۆنەوە.دەیانگوت قەت دەست بەرداری شەراب خواردنەوە نابین.

بەڵێ... دەبێ کۆمەڵی مسوڵمان داناو لێزان بێ‌و دیوار پێش بناغەو فەرع پێش ئەصڵ‌و گرنگ پێش گرنگتر نەخات‌و. هەر هەنگاوە لەقۆناغ‌و کاتی خۆی‌دا بنێ‌و ڕیز (ترتیب) ی سرووشتی‌و مەنتیقی بەش‌و قۆناغەکانی دیندای تێك نەدات. کەبەداخەوە لەگۆزەپانی کاری ئیسلامی‌ی ئەم ڕۆژگارەدا کرچ‌وکاڵی‌و فەقیرحاڵی‌و ناشی‌یی زۆر دەبیندرێ‌و زۆر ئیش دەکرێن ئیسلام لەسەریان قەرزدار دەبێتەوەو بەنە تۆزەکەشیان ناکەنەوە!

## ١٩- پلەپلەیی هەبوون لەکارو چالاکی‌یەکاندا:

پلەپلەیی (التدرج) یش یەکی ترە لەپایەو بنچینە گرنگەکانی کاری ئیسلامی و پشت گوێ خستنی و رەچاونەکردنی بەلای گەورەو گیروگرفتی بێ‌وزا بەسەر کارو کۆمەڵی ئیسلامی‌دا دێنێ. سەرنج‌دانێکی خێرای هاتنەخوارەوەی یاساکان (أحکام) ی ئیسلامیش لەبواری عیبادەت و موعامەلات و سیاسەت و جەنگدا ئەم راستی‌یە دەخاتەڕوو. خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وقرآنا فرقناه لتقرأه على الناس على مكث ونزلناه تنزيلا ﴾ الإسراء (١٠٦)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وقالوا لولا أنزل عليه القرآن جملة واحدة كذلك لنثبت به فؤادك ورتلناه ترتيلا ﴾ الفرقان (٣٢).

لەکۆتاییشدا ئەم سەرگوزەشتە پڕ واتایەی پێنجەمین خەلیفەی راشید (خامس الراشدين) عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خوا لێی خۆش بێ) دەگێڕمەوە کە ئیمامی (شاطبي) لەکتێبی (الموافقات) دا هێناویەتی:

«إن عبدالملك بن عمر بن عبدالعزيز قال له يوما: ياأبت مالك لاتنفذ الأمور! فوالله ماأبالي لو أن القدور غلت بي وبك في الحق؟! فقال عمر: لاتعجل يابني، فإن الله ذم الخمر في القرآن مرتين وحرمها في الثالثة. وإني اخاف أن أحمل الحق على الناس جملة فيدعوه جملة ويكون من ذا فتنة!!»[1].

واتە: رۆژێکیان عەبدولمەلیکی کوڕی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەباوکی گوت: ئەی بابە! بۆچی بەخێرایی کاروبارەکان جێبەجێ ناکەی! خۆ بەخوا بەلامەوە گرنگ نی‌یە کەلەسەر هەق من و تۆ لەمەنجەڵاندا بکوڵێنێ؟! عومەر گوتی: کوڕی خۆم پەلە مەکە. چونکە خوا دوو جار لەقورئاندا زەمی شەرابی کردووەو بۆ جاری سێیەم قەدەغەی کردووە، وەمن مەترسی‌ی ئەوەم هەیە کەئەگەر بێت و بەیەك جار هەقی لەخەڵکی بار بکەم و دارای پابەندی‌یان لێ بکەم، ئەوانیش بەیەك تەکان رەفزی بکەن و لەئەنجامی ئەمەشدا ئاژاوەیەك پەیدا بێت!

## ٢٠- وریایی تەواو لەتەقدیری تواناو ناسینی قۆناغی کاردا:

بەڵێ بەراستی ئەم بنچینەیەش یەکجار کاریگەرە لەکارو خەباتی ئیسلامی‌دا، چونکە بەبێ (خۆناسین) ئینسان چ لەئاستی تاك چ کۆمەڵدا ناتوانێ لەسەر بناغەیەکی راست و دروست لەگەڵ دۆست و دوژمن و دەوروبەری‌دا هەڵس و کەوت بکات و، سەرەنجام تووشی هەڵس و کەوت و رەفتاری بێ‌جێ و هەڵە دەبێت.

دیارە جیاوازی نێوان ئاراستەکان (توجيهات) ی قورئانیش بۆپێغەمبەرو هاوەڵانی لەبواری جەنگ و رووبەروو بوونەوەدا هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بنچینەیە. چونکە لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ بەوپەڕی دانایی و واقیع‌بینی‌یەوە دەیزانی هێزو توانای

[1] بڕوانە الموافقات: ب٢، ل٩١.

ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاری واقیعی پڕ کوفرو ستەمو فەسادی شاری مەککەو دەوروبەریان نییە بەشێوەیەك کەتەرکەوتنی شێنانە (إحتمال) ی پتر بێت لەتێشکان، هەرچەندە هەندێك لەهاوەڵە بەڕێزەکانی زۆر زۆر هەڵیان دەپێچار لەشاریان دەخستەسەر کەدەست بەکاربن، بەڵام ئەو هەر دەیفەرموو (صبرا) یان هەروەك قورئان دەفەرمویێ: ﴿ ألم تر إلى الذين قيل لهم كفوا أيديكم وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة ﴾ النساء (٧٧)! بەڵام دوابی کەزانی هێزو پێزی جەنگو بەرەنگارییان پەیدا بووە لەقەدەر ئەو قۆناغو دەوروبەرەی ئەوسار خوای مۆڵەتی دانو فەرمووی: ﴿ أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وإن الله على نصرهم لقدير ﴾ الحج (٣٩). بەڵێ... دوای ئەوە سەرەتا بەشێوەی مەفرەزەی گچکە گچکەو بۆسە (کمین) داناو ڕێگا بەکاروان گرتنو پاشان جەنگی گەورەی وەك بەدرو ئوحودو ئەحزابو تەبووك... دەست بەکاربوونو هەموو توانای ماددیو مەعنەوی خۆیان لەو بوارەدا خستەکار.

وەلەڕاستیدا سواربوونی ئەسپی عاتیفەو هەڵچوونو هەرەشەو گوڕەشەو (تهور) هەموو کاتێكو بەتایبەت لەم بوارەدا کارو کۆمەڵی گیرۆدەی دەردو داوی وا دەکاتو زیانی وا لەئیسلامو موسڵمانان دەدات کەدوایی زۆر بەزەحمەت بەڵکو بگرە ڕەنگە هەر قەرەبوو (تعويض) نەکرێتەوە. موسڵمانان بۆماوەیەکی زۆر بەدەست شوێنەوارو بەرهەمی شوومی ئەو جۆرە لەسەر هەڵسو کەوتە خەیاڵیو عاتیفیو ناواقیعییانەوە بناڵێن!!

## ٢١. بەرزو پاكڕاگرتنی دروشمو ئاڵا :

ئەمیش یەکێ دیکەیە لەبنچینەو بنەما گەورەکانی کاروخەباتی ئیسلامی. چونکە مەبەستمان لەئاڵاو دروشمەکانی ئیسلام ئەو خەسڵەتو نیشانانەن کەئیسلامو ئیسلامییەکانیان پێدەناسرێن. ئاشکرایە کەئاڵاو دروشمەکانی ئیسلامیش هەتا بڵێی بەرزو پاکنو دەبێ هەڵگرانی مەشخەڵی کارو جووڵانەوەی ئیسلامی بەهەر نرخێك بۆیان تەواو بووە هەروا بەرزو پاکیان ڕابگرنو نەهێڵن بزڕو چڵکنو لێخن بن بەهۆی: نزم کردنەوەیان بۆ ئاستی ئامانجو دەستکەوتە گچکەو دنیایییە ماددیو شەخسییەکان. یان بەهۆی هەڵسو کەوتو ڕەفتاری نزمو پەستو عەیبدار. یان بەهۆی تێکەڵکردنی ڕەنگو بۆیەیتر لەگەڵ ڕەنگی پاكو بێ پەڵەو بێوێنەیاندا وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ صبغة الله ومن أحسن من الله صبغة ﴾ البقرة (١٣٨).

دیارە ئەمەش - واتە بەرزو پاك ڕاگرتنی ئاڵاو دروشمەکانی ئیسلام - بەس بەوە مەیسەرو مسۆگەر دەکرێ کەتاك تاكو تێکڕای کۆمەڵی موسڵمان هەوڵبدەن دڵو دەمو دەستو داوێنو گەدەو گیرفانو گوزەرانیان یەکجار پاك بێو، ئاواتو خولیایەکانیانو ڕەوشتو ئاکارو ڕەفتاریان زۆر زۆر بەرزبێو، نەهێڵن هیچ کەس لەبواری دادگەریو چاکەکاریو لەبواری جەنگو بەرەنگاریدا بالادەستیان بێو بکەوێتە پێشیانەوە چونکە خوای دادگەرو میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ وإذا حييتم بتحية فحيوا بأحسن منها أو ردوها إن الله كان على كل شيء حسيبا ﴾ النساء (٨٦)، وەوەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەجەنگی بەدردا بە ئەبوجەهلی گوت: (الإسلام يعلو ولا يعلى).

## ٢٢. لەبەرچاو ڕۆشن بوونی ئامانجی بنەڕەتی و مەبەستی مەزن و باڵا :

بەڵێ... بەبێ لەبەرچاوڕۆشن بوون و دەرهۆشانەوەی ئەو ئامانجە (هدف) ەی کەهەموو کاری ئیسلامی بۆ ئاراستە دەکرێ لەجوڵەی ژیانی دنیادا. ئەو مەبەست (غایة) ەی کەئیمانی مسوڵمان هەوڵی وەدەستهێنانی دەدەن لەدوارۆژدا. کارو خەباتی ئیسلامی لەحاڵەتی یەکەمیان ـ ڕۆشن نەبوونی ئامانج ـ دا گردوگۆڵ و ڕەنج و تەقەلای بێ ئەنجام و، لەحاڵەتی دووەمیشیان ـ ڕۆشن نەبوونی مەبەست ـ دا قرپۆک و بۆش و بێتام دەبێ.

شایانی باسیشە کەمەبەست (غایة) ی کاری ئیسلامی هەموو دەمێ شتێکی چەسپاو و نەگۆڕە کەبریتییە لەڕازیکردنی خواو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوە: ﴿ يبتغون فضلاً من الله ورضوانا ﴾ الفتح (٢٩). بەڵام مەرج نییە ئامانجی کاری ئیسلامی لەهەموو قۆناغ و سەردەمەکاندا هەر یەك شت بێ.

بۆوێنە کاتێك حوکمی ئیسلامی لەگۆڕێدا بێ، ئامانجی حوکمی ئیسلامی زیاتر چەسپاندن و فراوانکردنی حوکمی ئیسلامی و چاککردن و نەهێشتنی کەلێن و کەم و کوڕییەکانیەتی وەپتر گەشە پێدان و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵی ئیسلامییە. بەڵام لەکاتێکدا کەحوکمی ئیسلامی نامێنێ و حوکمی طاغوت و نەزمی باڵی ڕەشی بەسەر وڵاتی مسوڵماناندا دێنێ، ئامانجی هەرە بەرز و ستراتیژی کاری ئیسلامی دەبێ گێڕانەوەی حوکمی ئیسلام و هێنانەوە مەیدانی ژینی دین بێ، وەك ئەم ڕۆژگارە تاڵ و دژوارەی ئێستای ئێمە، چونکە غەیری ئەم ئامانجە گەورەو گرنگە ـ واتە بەرپا (إقامة) کردنەوەی دین ـ هێنانەوەی هەر ئامانجێکی تر هەرچەند گرنگ بێ دەردی مسوڵمانان دەرمان ناکات و برینەکان ساڕێژ ناکات و، واقیعی ناشەرعییان ناگۆڕێ. دیارە ئیسلامیش بۆهێنانەوەی و خەملاندنی واقیعێکی ئیسلامیی ڕەسەن هاتووە، ڕازی نابێ بکرێتە پینەچی بۆ بۆ پینەو پەڕۆی واقیعێکی نەئیسلامی و ناشەرعی!!

## ٢٣. پێکهێنانی بنچینەی جەماوەری و ئامادەکردنی پێداویستییەکانی جەنگ دوو شاباڵی مەلی کاری ئیسلامین و هیچیان بەدیلی ئەوی تریان نین :

ئەم ڕاستییەش کەزۆر کەس تێیدا تووشی زیادەڕۆیی و بەزایەدان (الإفراط والتفريط) بوو ون یەکێ دیکەیە لەبنچینە هەرە گرنگەکانی کاری ئیسلامی و هەم دەقەکانی قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەن و، هەم وەك سانگی چواردەش لەسیرەو ژیانی پێغەمبەرماندا ﷺ دەدرەوشێتەوە.

جارێ دەربارەی یەکەمیان ـ واتە پێکهێنانی بنچینەی گەلی (القاعدة الشعبية). ئەوە شتێکی ڕوونە کەپێغەمبەر ﷺ هەرچەندە سێزدە ساڵی ڕەبەق لەمەککەدا سەرگەرمی

بانگەوازو کردوکۆش بوو، بەڵام چونکە ئەوانەی بڕوایان پێهێنا لەگەڵی بوون بەس (کاف) نەبوون بۆ پێکهێنانی بنچینەیەکی جەماوەری پتەوی وا کەبگونجێ کیانو حوکمێکی ئیسلامییان لەسەر شان بنیاد بنرێ، بەڵێ لەسۆنگەی ئەمەوە نەیتوانی لەوێدا جاری درووستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی بدات! کەچی لەشاری مەدینەدا هەرچەندە هەرتازە نیشتەجێ بووبوو، بەڵام لەسایەی هەبوونی بنچینەیەکی جەماوەری پتەوو دامەزراوەوە بەزوویی لەدایکبوونی دەوڵەتی ئیسلامی راگەیاند، هەربۆیەش خوای کاربەجێ پێی فەرموو: ﴿ فإن حسبك الله هو الذي أيدك بنصره وبالمؤمنين وألف بين قلوبهم ﴾ الأنفال (٦٢،٦٣).

هۆی فەلسەفەی ئەم مەسەلەیەش ئەمەیە کەلەئیسلامدا هەرچەندە سەرچاوەی یاسادانان (مصدر التشريع) بەس خوایە (جل جلاله)، واتە تەنیا خوا مافی فەرمانڕەوایەتی (الحاكمية) و سەروەریتی (السيادة) ی بەسەر خەڵکەوە هەیە، بەڵام سەرچاوەی دەسەڵات (مصدر السلطة) خەڵکو جەماوەرە، چالەکاتێکدا بەئەندازەی پێویست خەڵک نەبێ کەئامادەبێ جێبەجێ کردنو پیادەکردن (تنفيذ وتطبيق) ی یاساو دەستوورەکانی ئیسلام بێ، ئەوە دیارە فەرمانڕەوایی خواو سەروەری بەرنامەکەی زەمینەو بارودۆخێکی وایان بۆ نەڕەخساندووە کەتێیدا تەجەللا بکەن لەمیانە (خلال) ی ویستو هەڵبژاردنی بەندەکانەوە. ئەگەرنا لەواقیعو (نفس الأمر) دا فەرمانڕەوایەتیو سەروەری هەر ئی خواو تایبەتەکەیەتی، بالەجیاتی هەندێك سەرجەم ئینسانەکانیش ئەو حەقیقەتە قبوڵ نەکەن، خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ أفغير دين الله أبغ وله أسلم من في السموات والأرض طوعا وكرها وإليه يرجعون ﴾ آل‌عمران (٨٣).

دەربارەی دووەمیش ـ واتە ئامادەکردنی پێداویستییەکانی جەنگو بەرەنگاری ـ ئەگەر سەرنجێکی ورد لەو دەقانەی قورئان بدەین کەقۆناغ بەقۆناغ بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهاتە خوار تاکو کۆمەڵی موسڵمانیان لەسەر پەروەردە بکاتو بار بهێنێ، زۆر بەروونی دەبینین کەخوای پەروەردگار کۆمەڵی موسڵمان بۆ ئەوە هەڵدەدنێو بەرەو ئەوە ئاراستە دەکات کەبۆ ئەوە بشێنو بەکەڵکی ئەوە بێن ببنە خاوەن دەسەڵاتو مشوورخۆرو. هاوکات لەگەڵ پەروەردەکردنیان لەڕووی عەقیدەییو مەعنەویو ئەخلاقییەوە لەسەر سیفەتەکانی ئازایەتیو بوێریو بەخشندەییو فیداکاریو راوێژکردن لەکاروبارو دەستبەجێ بەدەم هەموو فەرمانێکی پەروەردگارەوە چوونو، دەستەوەستان نەبوون لەبەرانبەر ستەمو دەستدرێژیداو... هتد پەروەردەیان دەکات، بۆوێنە سەرنجی ئەم چەند ئایەتەی سووڕەتی (الشورى) بدەین: ﴿ فما أوتيتم من شئ فمتاع الحياة الدنيا وماعند الله خير وأبقى للذين آمنوا وعلى ربهم يتوكلون والذين يجتنبون كبائر الإثم والفواحش وإذا ماغضبوا هم يغفرون والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون والذين إذا أصابهم البغي هم ينتصرون وجزاء سيئة سيئة مثلها ﴾ الشورى (٣٦ـ٤٠).

ئنجا بێگومان ئەگەر هێزو دەسەڵات‌و شمشێرەکانی (بنی هاشم) نەبووایە کەبەپێی باری ئەو سەردەم‌و عورفی قەبیلەیی‌و دەمارگیری (تعصب) ەوە بەرگرییان لەپێغەمبەر ﷺ و بانگەوازەکەی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ نەیدەتوانی لەشاری مەککە ئاوا بەئاشکاوی‌و بێ‌منەتی - لەگەڵ هەبوونی ئازارو ئەشکەنجەش‌دا کەبەیی ئەوەندەبوو ڕێگا بگرێ - کاری ئیسلامیی خۆی بکات‌و درێژەی پێ‌بدات!

پاشانیش کەلەمەدینەدا جاری حکوومەتی ئیسلامی درا پاشی خوا هەر چەك‌و مەچەك‌و هێزو دەسەڵاتی هاوەڵە بەڕێزەکانی بوو کەئەو کیان‌و قەوارە ئیسلامییەیان لەهەڕەشەی هەموو ئەو دوژمن‌و ناحەزانە پاراست کەشەوو ڕۆژ سەرگەرمی پیلان‌و فێڵ بوون لەدژی‌دا!

کەواتە، ئیسلام‌و کاری ئیسلامی‌و کۆمەڵی موسڵمان چ‌لەقۆناغی بانگەوازو چ‌لەقۆناغی کیان‌و دەوڵەتیش‌دا پێویستییان بەهێزو دەسەڵاتێك هەیە کەبۆیان ببێتە سێبەرو سوپەرو قەڵغان‌و بەرگرییان لێ‌بکات‌و لەهەڕەشەو پیلان‌و تەڵەی دوژمن‌و ناحەزانیان بیانپارێزێ، دیارە مەرجیش نییە هەموو دەمێ (بنی هاشم) ێك بۆ هەر کارو کۆمەڵێکی ئیسلامی پەیدا بێت‌و بەبێ بەرابەر (مقابل) بەرگری لێ‌بکات، کەواتە دەبێ خۆیان مشووری کاری خۆیان بخۆن‌و هەوڵ بدەن لەچەك‌و هێزو توانا‌و دەسەڵاتی ئامادەکراوی زاتیی خۆیان (بدیل) ێك بۆو سێبەرەی (بنی هاشم) پەیدا بکەن تاکو (ئەبو جەهل) ەکان‌و دەستەو داریەرەیان نەتوانن ڕێگایان لێ‌بگرن‌و پەکی کاروبارییان بخەن‌و زەبوونیان بکەن.

ئەمە لەلایەکەوە - واتە وەك بەڵگەی شەرعی - لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانین وەك بەڵگە هێنانەوەیەکی عەقلی‌و واقیعی بڵێین؛

بەدرێژایی مێژووی کۆن‌و نوێی مرۆڤایەتی هەمیشە مەنتیقی هێز (منطق القوة) بەسەر هێزی مەنتیق (قوة المنطق)دا زاڵ‌و دەسەڵاتدار بووە، ئێستاش ئەم مەسەلەیە بەجوانترین شێوەی لەم عورفە زاڵە سیاسییەدا دەبینری کەناویان لێناوە: سیستەمی نوێی جیهانی (النظام الدولي الجديد)، کەلەڕاستی‌دا هەر کۆلۆنیالیزم‌و ئیمپریالیزم‌و ئیستیعمارەکەی جارانە بەڵام بەدەمامك‌و ڕووێکی نوێوە!

بەڵێ... لەجەزائیر دیتمان کەدوای ئەوەی ئیسلامییەکان (بەرەی ڕزگاری ئیسلامی) بە (هێزی مەنتیق) بردیانەوەو ئیسپاتیان‌کرد کەلەسەدا هەشتا (٨٠ %) ی جەماوەر زیاتریان لەگەڵدایەو بەرنامەکەیان - کەئیسلامە - پەسند دەکەن، بەئاراستەو فیتووری سیستەمی نوێی جیهانی (مەنتیقی هێز) ی جەزائیری وابەستە بەبێگانە کەوتە کارو ئەو قۆڵەی دیموکراسییەش کەدەستی حوکمی ئیسلامی لێوە هاتبووە دەرێ لەبیخەوە بڕی‌و بڕۆ بەخێر هاتی‌و نەئەمریکاو نەهیچ زلهێزێکی تری دنیاش تەنانەت تاقە فرتێکێکیشیان بۆ سەرەنجامی مەزڵوومانەی ئیسلام ئەوە هیچ بەڵام دیموکراسییە لەقیرەکەی لەمەڕ خۆشیان نەڕشت!!

کەواتە: هەرچەندە خەڵك‌و جەماوەری زۆرمان لەگەڵ بێ‌و پشتگیریمان لێ‌بکات، ئەو

لەگەڵبوونو پشتیوانی لێکردنەی جەماوەر، کەلێنی ئەو چەکو هێزو دەسەڵاتە پڕناکاتەوە کەئەگەر نەمانبێ دوژمنان نەڕێگای بانگەوازمان پێدەدەن، وە نەلەکاتێکیشدا ئیسلامەمان لەکورسیو تەختی حوکمڕانی نزیک خستەوە هەرچەندە . لەو ڕێگایانەشەوە بێ کەئەوانیش قەناعەتیان پێ‌یانە ـ ڕێگای فەرمانڕەوایی بەئیسلام دەدەن!

لەکۆتایی ئەم برە توێژینەوەیەشدا ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە: ﴿ قد خلت من قبلكم سنن فسيروا في الأرض فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين. هذا بيان للناس وهدى وموعظة للمتقين ﴾ آل‌عمران (١٣٧ـ١٣٨).

کۆتایی ئەم بەشی شەشەمەش بەم ڕاستی‌یە گرنگو مەزنە دێنم کەهەوڵدەدەم لەم چەند دێڕەدا بەگوشراوی بینووسم؛

شتێکی ئاشکرایە کەمەبەست لەپێکهێنانو دامەزراندنی کیانو دەسەڵاتێکی ئیسلامی ئەوەیە کەبەهۆی ئەو کیانو سێبەرەوە باروودۆخێک بڕەخسێ بتوانرێ (خەڵکی تێدا چاک بکرێو بەرەو خوا ببرێ)! مادام وابێ دەبێ هەر بەرێوەش ـ واتە بەر لەوەی بشگەینە ئەو هەوارو مەنزڵە بەرزو پیرۆزە ـ هەرکام لەئەندامانی کۆمەڵی موسڵمانو بەتێکڕاش بەهەموو تواناکانیانەوە سەرگەرمی هێنانەدی ئەو ئامانجەو ئەنجامدانی ئەو کارە مەزنە بن، دیارە مەبەستیش لەچاککردنی خەڵکو بەرەو خوا بردنیان ئەوەیە کەهەم فیکرو فەرهەنگو عەقیدەیان ئیسلامی‌یانەو بێ‌خلتەوخاڵ بێ، هەم عیبادەتو ئەخلاقیان خواپەرستانەو دوور لەشیرکو بیدعەتو قەسوەت بێ، هەم لەبواری کۆمەڵایەتی‌یاندا هەرچی خووخدەو دابو نەریتی نەفامانەیە وەلای بنێنو مل کەچی شەرع بن. هەم لەبواری ئابووری‌دا کۆمەڵگایەک بن دووربن لەنەخۆشی‌یەکانی هەردوو کۆمەڵگای نەفامی سەرمایەداریو سۆشیالیزمو حورمەتو ڕێزو کەسایەتی‌ی تاکو بەرژەوەندی‌ی گشتی تێدا پارێزراوبێ، وەهەم لەڕووی سیاسی‌یەوە سەربەخۆو ئازاد بنو وابەستەو دابەستەی هیچ هێزو لایەنێک نەبنو... هتد.

کەواتە: بالەهەموو ئەو بوارو مەیدانانەدا شێلگیرانەو لێبڕاوانەو لێزانانە ئەسپی خۆمان تاوبدەینو خۆمانو خەڵکو جەماوەرەکەمان هەرچی زیاتر چاک بکەینو بەرەو خوا ببەین، بەڵام لەو هێزو دەسەڵاتو قەڵاو پەرژینەش بێ خەبەر نەبین کەهەم ڕێگای بانگەوازمان بۆ ئاچووغو تەختو هەموار دەکاتو. هەم پاشانیش دەبێتە سێبەرو پارێزەری ئەو کیانو قەوارە ئیسلامی‌یەی کەلەئیرادەی کۆمەڵگاو خەڵکی موسڵمانان هەڵدەقوڵێ.

( تەواو بوو )

لە ٢٣ ی ڕەمەزانی ١٤١٩ک ، ١٢ ی شوباتی ١٩٩٩ ، مەریوان.

- - -

بەشی حەوتەم

# شێوازەکانی کاری ئیسلامی

(أساليب العمل الإسلامي)

# ڕێ خۆشکردن

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی حەوتەمەش‌داشێوازو چۆنیەتی‌یەکانی ئەنجام‌دانی کارو خەباتی ئیسلامی دەخەینەڕوو، پاش ئەوەی لەبەشی پێشوودا (٢٣) بنچینەمان لەبنچینەو بنەما گرنگ‌ەو سەرەکی‌یەکانیمان زۆر بەگوشراوی خستەڕوو، دیارە ناسینی شێوازەکانی کاری ئیسلامیش گرنگی‌یەکەی لەوەدایە کەکۆمەڵو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بەهۆی تێکەڵکردنی شێوازەکانی قۆناغێك‌و قۆناغێکی ترەوە دووچاری هەڵەو هەڵەبوون نەبن.

ئنجا ـ بەڕای بەندە ـ شتێکی ئاشکراشە کەجیاوازی (اختلاف) و جۆراوجۆر (تنوع) ی شێوازەکانی کاری ئیسلامی‌و، ئامرازو پێداویستی‌یەکان (الوسائل والمستلزمات) ی هەرکام لەشێوازەکان دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی نێوان سرووشتی قۆناغەکانی ئەو کارە مەزن‌و بەرزە! کەوابێ ئێمە بەهۆی ناسینی قۆناغەکانی کاری ئیسلامی‌یەوە دەزانین کەدەبێ چ‌شێوازێکیش بگرینەبەر، هەروەك چۆن بەهۆی ناسینی جۆرو چۆنیەتی شێوازەکانیشەوە تێ‌دەگەین کەئامرازو پێداویستی‌یەکانی هەرکام لەشێوازەکان چین‌و چۆنن؟!

جابەندە پێی وایە کەئەگەر زۆر بەوردی سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین زۆرباش دڵنیا دەبین‌و تێ‌دەگەین کەقۆناغەکانی کاری ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی لەهەرکات‌و شوێنێك‌دا ئەم سێ قۆناغەن:

١ـ بانگەوازو تێگەیاندن‌و پێگەیاندن (الدعوة والتفهيم والتكميل) .
٢ـ بەرەنگاری‌و جیهاد (المراجهة والجهاد).
٣ـ بالأدەست‌بوون‌و پێکهێنانی کیانی ئیسلامی (السلطة وتكوين الكيان الإسلامي) .

کەواتە: باباسی هەرکام لەم سێ قۆناغەی کارو خەباتی ئیسلامی‌وشێوازەکانیان بکەین‌و جاروباریش ئاماژە بۆ ئامرازو پێداویستی‌یەکانی هەرکام لەشێوازەکان بکەین بەگوێرەی بۆلوان:

## قۆناغی یەکەم:
## بانگەوازو تێگەیاندن:

ئەم قۆناغە یەکەمین قۆناغی کاری ئیسلامی‌یەو شێوازەکانی کاری ئیسلامیش لەم قۆناغەدا ئەمانەن:

### ١. بانگەوازو بێدارکردن :

دیارە مەبەست لە (بانگەواز) بانگ‌کردنی خەڵکە بۆ وەرگرتنی هیدایەتی خواو پاشان پابەندبوون بە (بەرنامە) کەیەوە، کەلەم دووانەش ـ واتە وەرگرتنی هیدایەت‌و

پابەندی بەشەریعەت ـ بەندایەتی بۆخواکردن (العبودیة لله) دێتە دی، کەئەمیش تەنها حیکمەت و هۆی خوڵقێنرانی ئینسان و جندە: ﴿ وما خلقت الجن والإنس إلا لیعبدون ﴾ الذاریات (٥٦)، هەربۆیەش خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وما ارسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لاإله إلا انا فاعبدون ﴾ الأنبياء (٢٥)، کەدیارە (بەس پەرستنی خوا) ش تەنها لە (شوێنکەوتنی هیدایەتی و پابەندبوونی شەریعەتی) دا تەجەللا دەکات و بوونی خۆی ئیسپات دەکات، وەك خ ای مەزن فەرموویەتی: ﴿ هوالذی أرسل رسوله بالهدی ودین الحق لیظهره علی الدین کله وكفی بالله شهیدا ﴾ الفتح (٢٨ .

مەبەستیش لە (بێدارکردن) وەخەبەرهێنانی تاك و کۆمەڵە لەخەوی شوومی بێئاگایی و شەرمەزەنگی ژیانی دوور لەخوایی و، دەست گرتنیان و بردنیان بەرەو هۆشیاری خواپەرستانەو ژیانێکی ئیسلامییانە، وەك خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿ آلر، کتاب انزلناه إلیك لتخرج الناس من الظلمات إلی النور بإذن ربهم إلی صراط العزیز الحمید. الله الذی له مافی السموات ومافی الأرض والكافرون لهم عذاب شدید. الذین یستحبون الحیاة الدنیا علی الأخرة ویصدون عن سبیل الله ویبغونها عوجا اولئك في ضلال بعید ﴾ إبراهیم (٣-١)، واتە: ئەلیف لام ڕا، ئەم قورئانە کتێبێکە بۆ ئێمەمان ناردۆتە خوارەوە تاکو خەڵکی بەفەرمانی پەروەردگاریان لەتاریکییەکان دەربێنی بەرەو ڕووناکی و بەرەو ڕێبازی ـ خوای ـ زاڵی سوپاس کراو، ئەو خوایەی کەهەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دایە ئیی ویییە، وەبێبڕوایان ئازارێکی بەئێشیان هەیە ـ لەدوارۆژدا ـ، ئەوانەی کەژیانی دنیا بەسەر دوارۆژدا هەڵدەبژێرن و ـ خەڵکی ـ لەڕێبازی خوا دەگێڕنەوەو هەوڵدەدەن ـ لەبەر چاوی خەڵکی ـ خوارو خێچی بکەن! ئەوانە لەونبوونێکی دووردان.

ئەو ئامرازانەش کەبۆ ئەم شێوازە پێویستن ئەمانە گرنگترینیانن:

بانگەوازی تاکی (الدعوةالفردیة)، بانگەوازی پەنهان (الدعوة السریة)، بانگەوازی ئاشکرا، بانگەوازی بەکۆمەڵ، هاوڕێیەتی و سەرەدشتی بوون (الصداقة والأخرة). وتاردان. کۆڕو سیمینار، قسەکردن لەبۆنە (مناسبة) جیاجیاکانی وەك: شین و شایی و بۆنە کۆمەڵایەتی و ئیسلامییەکاندا، نوسینی کتێب و نامیلکەو گۆڤارو ڕۆژنامە... دیارە هەموو ئەوانە بەسوود وەرگرتن لەنوێترین بەرهەم و ئامێرەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم لەهەرسێك بەشەکانی ڕاگەیاندن: خوێنراوەو بیستراوو بینراو (المقروئة والمسموعة والمرئیة).

م

## ٢ـ فێرکردن و تێگەیاندن :

دوای ئەوەی کەسانێکی زۆر یان کەم بانگ دەکرێن و بێدار دەکرێنەوەو بەرەو خوار هیدایەت و بەرنامەکەی دەگێڕرێنەوە، ئەوجار شێوازی فێرکردن و تێگەیاندن پێویست

دەبێ و، پێویستە مشوور خۆراتی کارو جەموجۆڵی ئیسلامی ئەو خەڵکە گەڕاوەو بێدارکراوە لەنیوەی ڕێگادا بەجێ نەهێڵن و هەروا درێژە بەهەوڵی خۆیان بدەن و هەنگاوی دوورەمیشیان لەگەڵ هەڵێننەوەو شێوازی فێرکردن و تێگەیاندنیان لەگەڵ بەکار بهێنن و کەبە (بانگەوازو بێدارکردن) لەخەوی بێئاگاییان هەستاندوون ئەمجار بەفێرکردن و تێگەیاندنیان لەتاریکیی نەزانی و نەفامی ڕزگاریان بکەن و بەرەو ڕۆشنایی زانیاری و حاڵیبوونیان بێنن، چونکە ئەو کەسەی کەتروسکەی هیدایەت عەقڵ و دڵی ڕووناک و ئاوەدان دەکاتەوە، ئەگەر بێت و کاری تری لەسەر نەکرێ و هەنگاوەکانی تری پێ نەنرێ وەک نەمامی بێخزمەت و خەم لێنەخوراو هەم شێمانە (إحتمال) ی ئیشکبوون و هەم شێمانەی هەڵپڕوچکێنرانی هەیە، ئنجا ئەگەر گریمان لەم دوو بەڵایەش ڕزگار بێت ئەوە هەر لەحاڵەتێکی ساوار سادەو عاتیفیدا دەمێنێتەوە، وەک گەرمەیەکی خاوی خەم لێنەخوراوو هیچ لێ دروست نەکراو بەکرچ و کاڵی سەردەنێتەوە!!

مەبەستیشمان لەفێرکردن و تێگەیاندن ئەوەیە کەپێ بەپێ و بەئەندازەی ئامادەیی و وەرگرتنی ئەوانە کەدەوێستری فێری ئیسلامەتی بکرێن و تێبگەیەنرێن. سەرەتا مەسەلەو بابەتەکانی بیروباوەڕ هەتا تەواو تەواو عەقڵ و دڵیان پاراو دەبێ و ئیمانیان تێدا سەقامگیر دەبێ و، پاشان هەر مەسەلەو بابەتێکی تر کەپێویستییان پێی هەبێ و یەکیان لەسەری کەوتبێ فێر بکرێن و جوان جوان حاڵی بکرێن. وەهاوکات لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بەپێویست زانرا بەقەدەر پێویست بیردۆزەو ڕێچکەکانیشیان بۆ لەبەریەک هەڵبوەشێنرێن و بدرێنە بەر نەشتەری ڕەخنەو لەبەر چاویان بخرێن. بەڵام بەشێوەیەکی عیلمییانەو بابەتییانەو دادگەرانە، نەک بەشێوەیەکی سەرکێڵ و عاتیفییانەو دوور لەئینساف. خوای کاربەجێش لەم بارەوە سەبارەت بەئەرکی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ هو الذي بعث في الأميين رسولا منهم يتلوا عليهم آياته ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة وإن كانوا من قبل في ضلال مبين ﴾ الجمعة (٢).

ئامرازەکانی ئەم شێوازەش لەکاری ئیسلامی سەرەڕای هەندێک لەئامرازەکانی شێوازی (بانگەوازو بێدارکردن) ئەمانەشن:

دەرس گوتنەوەی تایبەتی و گشتی لەماڵ و شوێنی کارو بنکەی تایبەت و قوتابخانە... هتد وەکردنەوەی خول (دورة) ە تایبەتی و گشتییەکان و بەکارهێنانی هۆیەکانی ڕاگەیاندنیش بەهەرسێک بەشەکانیەوە.

## ٢. پەروەردەو پێگەیاندن:

ئینسان دوای هۆشیاربوونەوەو تێگەیشتن ئەمجار پێویستی بەپەروەرد بوون و پێگەیشتن دەبێ، جیاوازیی نێوان (فێربوون) و (پەروەردەبوون) یان (تێگەیشتن) و (پێگەیشتن) بەش یەک شتی سەرەکییە. ئەویش ئەوەیە کەفێربوون و تێگەیشتن زیاتر کارێکی فیکری و تیۆرییە، بەڵام پەروەردەبوون و پێگەیشتن وێڕای چالاکی فیکری

تیشکمان خستەسەر هەریەکێکیان لەخاڵەکانی (١٩) و (١٨) و (١٠) دا.

دووەم:

مەبەست لەپەروەردەبوون و پێگەیشتن نیییە نەك بەمەرتلەقی. واتە بەنیسبەت ئەو قۆناغەوە پەروەردە بوون و پێگەیوە، ئەگەرنا - بەقەناعەتی بەندە - ئینسانی موسڵمان و کۆمەڵی موسڵمان لەکوورەی خەبات و خەم و خوێن و خۆبەخت کردندا نەبێ قاڵ نابێتەوە و پێ ناگات، بەڵام مەبەستمان لەو پەروەردەبوون و پێگەیشتنە ئەوەیە کەئەندامی کۆمەڵی موسڵمان پاش بڕینی ئەو قۆناغە بەهەریەکێك شێوازەکانییەوە هێندە پەروەردە دەبن و پێدەگەن کەشایستەی ئەوەبن بچنە نێو قۆناغی جیهادو بەرەنگارییەوە.

سێیەم:

پێویستە هەر لەیەکەمین هەنگاوی قۆناغی (بانگەوازو...) ەوە یەك یەکی ئەندامانی کۆمەڵی موسڵمان لەو ڕاستییە حاڵیبکرێن و لەسەری پاربهێنرێن کەئیسلام بۆ گۆڕینی واقیع و بەرەنگاربوونەوەی کوفرو ستەم و خراپە هاتووەو، هەر لەسەرەتاوە عەقڵ و دەروونیان بۆئەوە ئامادە بکرێ کەئیسلام دەیەوێ باڵادەست و فەرمانڕەوا بێت و سێبەرو قەڵاو پەنای پەرژینی نەك هەر موسڵمانان بەڵکو تێکڕای ئینسانەکان بێ و نەهێڵێ هیچ کەس بچێتە ژێر نیری ستەم و بێدادی و چەوساندنەوەی ماددی و مەعنەوی طاغوتەکان و، هیچکەس و هیچ گەل و کۆمەڵێك خاوەنی هەر جۆرە فیکرو ئایینێك بێ و هەر نەژادو ڕەنگ و ڕەگەزێکی هەبێ لەهیچ ڕوێکەوە نەچەوسێندرێتەوە. هیچ کام لەو هەق و مافانەی کەخوای میهرەبان و دادگەر بەتاك تاکی مرۆڤەکان و هەموو گەل و نەتەوەکانی بەخشیون زەوت نەکرێن و پێشێل نەکرێن بۆئەوەی هەر لەڕۆژی بەری و، کۆمەڵی موسڵمان لەسەر خەبات و تێکۆشان پاربێ و بەجیهادو مەردایەتی و فیداکاری فێرچك بدرێ، وەهەر لە (بسم الله) وە هەست بەئەرکی مەزنی سەرشانی بکات و خۆی بۆ ئامادەو تەییار بکات، چونکە بەدەردی پێشینان دەڵێن: (خووی شیری هەتا پیری) و دیارە (کەسیش لەپڕ نابێتە کوڕ)!

ئنجا بێگومان کەسانێك کەبۆ مامۆستایەتی و پێشڕەوایەتی کردن بانگ دەکرێن و بەمەستی سەروەریتی و چاودێرایەتی کردنی مرۆڤایەتی ﴿ لتكونوا شهداء على الناس ﴾ پەروەردە دەکرێن زۆر جیاواز دەبن لەکەسانێك کەپەیتا پەیتا ئەوەیان بەگوێدا دەدرێ و لەعەقڵ و دڵدا دەڕوێندرێ کە:

ئێمە هەقمان بەسەر کەسەوە نییەو بەتەمانین لەگەڵ هیچ کەس تێك بگیرێین و بەشەڕ بێین، چونکە کاری ئێمە بەس ئیصلاحەو دژی هیچ کەس نینەو هیچ کەسیش بەدژی خۆمان نازانین و... هتد!!

بەڵێ... ئاواتی گەورە پیاوی گەورە درووست دەکات و، دیارە پێچەوانەش هەروایەو، بێگومان بەرنامەیەکی گەورەو مەزنی وەك ئیسلامیش بەپیاوانی لەقەدەر خۆی نەبێ وەك

تێشکمان خستەسەر هەرسێکیان لەخاڵەکانی (١٩) و (١٨) و (١٠) دا.

**دووەم:**

مەبەست لەپەروەردەبوون و پێگەیشتن نیییە نەك بەمەرتلەقی. واتە بەنیسبەت ئەو قۆناغەوە پەروەردە بووەو پێگەیوە، ئەگەرنا - بەقەناعەتی بەندە - ئینسانی موسڵمان و کۆمەڵی موسڵمان لەکوورەی خەبات و خەم و خوێن و خۆبەختکردندا نەبێ قاڵ نابێتەوەو پێناگات، بەڵام مەبەستمان لەو پەروەردەبوون و پێگەیشتنە ئەوەیە کەئەندامی کۆمەڵی موسڵمان پاش بڕینی ئەو قۆناغە بەهەرسێك شێوازەکانیەوە هێندە پەروەردە دەبن و پێدەگەن کەشایستەی ئەوەبن بچنە نێو قۆناغی جیهادو بەرەنگاریەوە.

**سێیەم:**

پێویستە هەر لەیەکەمین هەنگاوی قۆناغی (بانگەوازو...) هەوە یەك یەکی ئەندامانی کۆمەڵی موسڵمان لەو ڕاستییە حاڵیبکرێن و لەسەری باربهێنرێن کەئیسلام بۆ گۆڕینی واقیع و بەرەنگاربوونەوەی کوفرو ستەم و خراپە هاتووەو، هەر لەسەرەتاوە عەقڵ و دەروونیان بۆئەوە ئامادە بکرێ کەئیسلام دەیەوێ بالادەست و فەرمانڕەوا بێت و سێبەرو لەلار پەنار پەرژینی نەك هەر موسڵمانان بەڵکو تێکرای ئینسانەکان بێ و نەهێڵێ هیچ کەس بچێتە ژێر نیری ستەم و بێدادی و چەوساندنەوی ماددی و مەعنەوی‌ی طاغووتەکان و، هیچکەس و هیچ گەل و کۆمەڵێك خاوەنی هەر جۆرە فیکرو ئاینێك بێ و هەر نەژادو ڕەنگ و ڕەگەزێکی هەبێ لەهیچ ڕوێکەوە نەچەوسێندرێتەوەو. هیچ کام لەو هەق و مافانەی کەخوای میهرەبان و دادگەر بەتاك تاکی مرۆڤەکان و هەموو گەل و نەتەوەکانی بەخشیون زەوت نەکرێن و پێشێل نەکرێن بۆئەوەی هەر لەڕۆژی یەکەوە، کۆمەڵی موسڵمان لەسەر خەبات و تێکۆشان باربێ و بەجیهادو مەردایەتی و فیداکاری ڕاچڵەك بدرێ، وەهەر لە (بسم الله) وە هەست بەئەرکی مەزنی سەرشانی بکات و خۆی بۆ ئامادەو تەیار بکات، چونکە بەدەردی پێشینان دەڵێن: (خووی شیری هەتا پیری) و دیارە (کەسیش لەپڕ نابێتە کوڕ)!

ئنجا بێگومان کەسانێك کەبۆ مامۆستایەتی و پێشڕەوایەتی کردن بانگ دەکرێن و بەمەستی سەروەرێتی و چاودێرایەتی کردنی مرۆڤایەتی ﴿ لتكونوا شهداء على الناس ﴾ پەروەردە دەکرێن زۆر جیاواز دەبن لەکەسانێك کەپەیتا پەیتا ئەوەیان بەگوێدا دەدرێ و لەعەقڵ و دڵدا دەڕوێندرێ کە:

ئێمە هەقمان بەسەر کەسەوە نییەو بەتەمانین لەگەڵ هیچ کەس تێك بگیرێین و بەشەڕ بێین، چونکە کاری ئێمە بەس ئیصلاحەو دژی هیچ کەس نینەو هیچ کەسیش بەدژی خۆمان نازانین و... هتد!!

بەڵێ... ئاواتی گەورە پیاوی گەورە درووست دەکات و، دیارە پێچەوانەش هەروایەو، بێگومان بەرنامەیەکی گەورەو مەزنی وەك ئیسلامیش بەپیاوانی لەقەدەر خۆی نەبێ وەك

پێویست بەرێوە ناچێ، هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ من المؤمنين رجال صدقوا ماعاهدوا الله عليه ﴾ الأحزاب (٢٣)، چونکە زانیویەتی کەهەموو موسڵمانان ئەو جۆرە پیاوانە دەرناچن، بۆیە (من) ی (تبعيض) ی خستۆتە سەر (المؤمنين)!!

## قۆناغی دووەم:

# بەرەنگاری و جیهاد

پاش ئەوەی کۆمەڵی موسڵمان بانگ کران و بێداربوونەوە، فێرکران و تێگەیشتن و، پەروەردەکران و پێگەیشتن، ئەو بێداری و تێگەیشتن و پێگەیشتنە واداریان بگرە ناچاریان دەکات، کەبۆگۆڕینی واقیع و چاککردنی دەوروبەریان بەپێی هیدایەتی خواو بەرنامەکەی بکەونە خۆو دەست بەکاربن، ئنجا وەك ئەنجامێکی حەتمی ئەو وەخۆکەوتن و دەست بەکاربوونەیان بۆ گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵگاو دەوروبەریان تووشی کێشەو دژایەتی و جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە دەبن لەگەڵ بەرەی کوفرو ستەم و خراپەدا، هەتا خوای کاربەجێ و خاوەن دەسەڵات بەحیکمەتی خۆی و لەقۆناغی خۆیدا سەرکەوتن (نصر) یان بۆ دەنێرێ و بەسەر بەرەی ناهەقدا سەریان دەخات و پێیان دەچەسپێنێ و دەستیان لەجڵەوی کاروبار هەڵسووڕاندن و مشوور خواردن گیر دەکات وەك فەرموویەتی: ﴿ وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الأرض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم من بعد خوفهم أمنا يعبدونني لايشركون بي شيئا ومن كفر بعد ذلك فاولئك هم الفاسقون ﴾ النور (٥٥) .

بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییەش بزاندرێ کەمەرج نییە کیان و دەوڵەتی ئیسلامی پاش جەنگ و کوشتارو ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە بێتەدی، بەڵکو دەگونجێ بەبێ ئەوەش لەبارو دۆخێکی هێمنانەو ئارامدا موسڵمانان بتوانن جارێ دامەزراندنی کیانی سیاسیی شەرعیی خۆیان بدەن، بەڵام دەبێ حەتمەن پێشتر ئەو پەڕی ئامادەیییان وەرگرتبێ و هەموو کارەسات و ڕووداوێکیان لەبەرچاو گرتبێ و پەیمان (بيعة) ی پتەوی فەرمانبەری و پابەندیشیان لەگەڵ قیادەی خۆیاندا بەستبێ کەهەرکەسێك و هەر لایەنێك ببەوێ ببێتە بەرچ و کۆسپی سەر ڕێگای درووستبوونی ئەو کیانە شەرعییەیان بەرەنگاریی ببنەوەو لایبەرن. ئەم مەسەلەیەش وەك ڕۆژی ڕوون لەسیرەی پێغەمبەردا ﷺ دەدرەوشێتەوە. چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی پاش سێزدە ساڵ بانگەوازو کردو کۆشش و ڕەنج و خەبات نەیتوانی لەشاری مەککەدا بارودۆخ و زەمینەیەکی وا بڕەخسێنێ کەبگونجێ کیان و دەوڵەتێکی ئیسلامی تێدا بەرپا بکات، هەستی کرد کەکارەکەی لەم شوێنەدا بەبن بەست گەیشتووە، بۆیە کەوتە هەوڵ و تەقەلا لەدەرەوەی مەککە بۆ پەیداکردنی کۆمەڵگاو زەمینەیەکی لەبار بۆ ئەو مەبەستە، ئەوەبوو سەرەتا چوو بۆ (طائف) بەڵام زۆر

بەشێوەیەکی ناشیرین بەرپەرچیان دایەوە، پاشان سەردانی چەندان تیرەو خێڵی تری کردو بەراشکاوی پێی دەگوتن کەبەدوای زەوی‌یەکو خەڵکێکدا کەهەم بڕوای پێ بهێنن. هەم کۆچ بکاتە نێوانیانو پشتیوانی لێبکەن بۆ جاڕدان بەپێکهێنانی کیانێکی ئیسلامی، هەتا سەرەنجام پاش چەند دیدار (لقاء) یێکی ڕۆخۆشکەر لەگەڵ چەند کەسێکی (یثرب) ی دا لەهەردووك تیرەی (أوس) و (خزرج) کەوەك لە سەرچاوەکانی سیرەدا هاتووە ئەو دیدارە ڕۆخۆشکەرانە بەسێ قۆناغدا تێپەڕیون. بەڵێ سەرەنجام لەدەوری ساڵی (١١) ی قۆناغی مەککەدا لەوەرزی حەج کردندا دوازدە (١٢) کەسی (یثرب) ی کە دە (١٠) یان لە (خزرج) بوونو دوویان (٢) یان لە (اوس) بوون لە (منى) بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتنو پەیمانی عەقەبەی یەکەم (بیعة العقبة الأولى) یان لەگەڵدا بەست، کەسەرچاوەکانی سیرە ئاوا بۆمان دەگێڕنەوە: ﴿ عن عبادة بن الصامت قال: «كنت فيمن حضر العقبة الأولى وكنا إثني عشر رجلا فبايعنا رسول الله على بيعة النساء. وذلك قبل أن تفترض الحرب: على أن لانشرك بالله شيئا ولانسرق ولانزني ولا نأتي ببهتان نفتريه بين أيدينا وأرجلنا ولانعصيه في معروف. فإن وفيتم فلكم الجنة، وإن غشيتم من ذلك شيئا فأمركم إلى الله عز وجل إن شاء عذب وإن شاء غفر». قال إبن إسحاق فلما انصرف القوم عنه بعث رسول الله ﷺ معه مصعب بن عمير، وامره أن يقرأهم القرآن، ويعلمهم الإسلام. ويفقههم في الدين فكان يسمى المقرئ بالمدينة. ﴾ [(١)].

پاشان لەساڵی داهاتوودا دیسان لەکاتی حەج کردندا وەفدێك لەمەدینەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کەژمارەیان حەفتاو سێ (٧٣) پیاوو دوو (٢) ئافرەت بوو لەدوای سێ یەکی شەوێ لەهەمان شوێنی پێشوو (عقبة) دا بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتنو دوای قسەو باسێکی زۆر لەلایەن پێغەمبەرو (عباس) ی مامی کەهەرچەندە تائەو کاتە هەر لەسەر شیرك بوو، بەڵام وەك خزمێك لەگەڵی بوو، وەلەلایەن چەند کەسێکی ئەو وەفدەوە لەسەر صیغەیەك ڕێك کەوتنو پەیمانی جەنگ (بيعة الحرب) یان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست کەبەپەیمانی پیاوان (بيعة الرجال) یش ناسراوەو بەم جۆرە دوایین پەیمانی خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەسترا کەلەکتێبەکانی سیرەدا بەپەیمانی دووەمی عەقەبە (بيعة العقبة الثانية) ناسراوە.

ئەو پەیمانەش کەپێغەمبەر ﷺ کردی بەبناغەی کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینەو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لەم بەندانە پێك هاتبوو:

(١) تەئکید کردن لەسەر فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو هەق گوتنو گوێ نەدان

(١) بڕوانە:(الروض الأنف) ی إبن هشام، ب٢، ل١٨٥، وە (فتح الباري)، ب١، ل٦٦، هەروەها بڕوانە: (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) ی دکتۆر (محمد خير هيكل)، ب١، ل١١٨.

بەلزمەی لزمەکاران.

(ب) کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ مەدینەو هاوکاریکردنی پشتیوانەکان (الأنصار) بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی کۆچکەر (المهاجرین) لەرووی ماڵو سامانەوە.

(ج) بەرگریکردن لەپێغەمبەرو هاوەڵانی پاش چوونیان بۆ مەدینە لەهەر شتێك کەرروویان تێدەکات هەروەك چۆن بەرگری لەخۆیانو ماڵو خێزانیان دەکەن.

(د) پێغەمبەر ﷺ جڵەوی حوکمو کاروبار بگرێ لەشاری مەدینەداو بکرێتە سەرۆکی ئەو کۆمەڵگایەو لەهەمرو حاڵێك فەرمانبەریی بکرێ.

(هـ) ئەو پەیوەندییەی کەمسوڵمانانی مەدینە بە (مهاجرین) و (انصار)ەوە بەیەکەوە دەبەستێ بەس پەیوەندیی برایەتی ئیسلامییەو هەر جۆرە پەیوەندییەکیتر کەلەگەڵی تێك بگیرێ دەپچڕێندرێ.

(و) خۆسازکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنایەتی تێکڕای عارەب پاش کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ مەدینەو بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی، وئامادەیی وەرگرتن بۆ جەنگو کوشتارو فیداکاری، بەهەر قیمەتێك تەواوبێ[1]!

لەم برە توێژینەوەو سەرنجدانەوە کەرابرد دەگەینە دوو ئەنجامی زۆر گەورەو گرنگ:

**یەکەم:**

مسوڵمانە مەدینەییەکان لەقۆناغی پێنجەمی گفتو گۆو وتووێژەکانیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئامادەبوون کەپەیمانی پیاوانەو پەیمانی جەنگ (بیعة الرجال وبیعة الحرب) لەگەڵ پێغەمبەردا ببەستن، هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئەو مسوڵمانە بەڕێزانە زۆر ژیرانەو واقیع بینانە هەنگاریان ناوەو هەتا هەستیان نەکردووە کەلەمەدینەدا بنچینەیەکی جەماوەریی پتەو بۆ لەباوەش گرتنی پێغەمبەرو کیانە ئیسلامییەکەی خەملیوەو سازبووە ئەو جۆرە پەیمانە گرنگەیان لەگەڵ پێغەمبەردا نەبەستووەو دەعوەتیشیان نەکردووە کەبچێتە نێویانو خۆیو هاوەڵەکانی کۆچ بکەن.

بەڵێ... دەبێ کۆمەڵی مسوڵمان زۆر ووردو وریاو واقیع بینانە تواناو ئامادەیی خۆیو هێزو توانای دوژمنو نەیارەکانی بناسێو هەڵسەنگێنێو لەبەر تیشکی ئەو ناسینو هەڵسەنگاندنەدا بڕیارو کاری خۆی دیاری بکات.

**دووەم:**

پێغەمبەری خواش ﷺ هەتا مسوڵمانانی مەدینە پەیمانی جەنگیان لەگەڵ نەبەست ئامادە نەبوو کۆچ بکاتە لایانو جاڕی بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی بدات، چونکە

---

(١) ئەم بەندانە کە پەیمانی دووەمی عەقەبەیان لێ پێك هاتووە لە سەرچاوەکانی سیرەدا لێرەو لەوێ هاتوون دەشێوانی سەرنجی (الجهاد والقتال في السیاسة الشرعیة) بدە، ب١، ل١٢٠.

کیانو دەوڵەت کاتێك دەگونجێ بەرپا بکرێو درێژە بەبوونو بەرقەراریی خۆی بدات کەبنچینەیەکی جەماوەریی وای هەبێت بتوانێ لەباوەشی بگرێو بیپارێزێو فیداکاریی لەپێناودا بکات، وەهێزو دەسەڵاتێکی وای گەڵاڵە کردبێ کەبتوانێ بۆ ئەو کیانە ببێتە قەڵاو پەرژینو سوپەرو سەنگەر!!

شایانی باسیشە کەئێمە بۆیە ئەم قۆناغی دووەممان ناوناوە (قۆناغی بەرەنگاریو جیهاد) نەك (بەرەنگاریو جەنگ) چونکە وەك باسمان کرد رێی تێدەچێ کۆمەڵی موسڵمان بەبێ شەڕو کوشتار کیانو دەوڵەتی شەرعیی خۆیان بەرقەرار بکەن. بەڵام هیچ کاتێك ئەو کیانو دەوڵەتە شەرعییە بەبێ (بەرەنگاریو جیهاد) نایەتە دی، کەدیارە ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەبەرەنگاریو جیهاد مەعنای فراوانیانە کەبەرەنگاریو جیهادی فیکریو عەقیدەییو کۆمەڵایەتیو سیاسی ڕێرای (جەنگ) دەگرێتەوە، نەك مەعنای تایبەتیو تەسکیان کەبەس جەنگو کوشتارو ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە دەگرێتەوە.

پوختەی قسان ئەوەیە کەهەرچەندە دەگونجێ قۆناغی (جەنگو کوشتار - الحرب والقتال) بکەوێتە دوای قۆناغی بەرپاکرانی کیانو دەوڵەتی ئیسلامی نەك پێشیەوە، بەڵام قەت ناگونجێ کیانو دەوڵەتی ئیسلامی پەیدا ببێ بەبێ هیچ جۆرە بەرهەڵستیو بەرەنگاربوونەوەیەکی تری غەیری جەنگو کوشتار. کەواتە هەرچۆنبێ بەشێوەی گشتی قۆناغی (بەرەنگاریو جیهاد) بەواتای فراوانو گشتیی ئەم دوو وشانە هەر دەکەوێتە پێش قۆناغی درووستبوونو بەرپابوونی کیانو دەسەڵاتی شەرعی (السلطةالشرعیة) ی ئیسلامەوە، ئنجا بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ ڕەخنەمان لێبگرێ بەوەی کەپێش کەوتنی جەنگو کوشتار لەسەقامگیربوونی کیانو دەوڵەتی ئیسلامی حەتمی نییە، بۆیە تادەرفەتی ئەو ڕەخنەیە نەبێ ناورنیشانی ئەم قۆناغەمان کردووە بە (بەرەنگاریو جیهاد) نەك (بەرەنگاریو جەنگ یان کوشتار) چونکە وەك پێشتریش گوتمان هەرکام لەبەرەنگاری (المواجهة) و جیهاد (الجهاد) واتای تایبەتیو گشتیشیان هەیە، بەڵام وشەی جەنگ (الحرب) یان کوشتار (القتال) بەس یان لانی کەم زیاتر ئەو واتا تایبەتییەیان هەیە کەیەکسەر لێیان وەردەگیرێ کەبریتییە لەڕووبەڕوو بوونەوەی بەهێزو چەکدارانە کەچڵەپۆپەو جۆری هەرە تایبەتی بەرەنگاریو جیهادن.

ئێستاش دوای ئەم برە لێکۆڵینەوەیە کەهەرچەندە لەقەدەر سرووشتی ئەم باسانە درێژبوو، بەڵام زۆر بەپێویستو گرنگم زانی کەبەر لەوەی بچینە سەرباسی شێوازەکانی ئەم قۆناغە بیخەینە ڕوو، لەبەرئەوەی پێم وایە گەلێك کەسی کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە لەو بارەوە بەرچاویان تەماویو لێڵە، بەڵێ ئێستاش بابزانین شێوازەکانی کاری ئیسلامی لەم قۆناغەدا چینو چۆنن؟!

## ١. خۆئامادەکردن :

مەبەستمان لە (خۆئامادەکردن) خۆسازکردنە بۆ جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەو کوشتن و کوژران لەرێی خواو بەرنامەکەی و بەرزکردنەوەی بەیداخەکەیدا لەم چوار لایەنانەوە:

### یەک : لایەنی فیکری :

کەدەبێ کۆمەڵی موسڵمانی جەنگاوەر کۆمەڵێك بێ لەسەر هەر چوار بنەمای گرنگی (بیرو باوەڕو بەرنامەی کارو فەرماندەیەتی و ئامانج) یەك دەنگ بێ، هەروەها دەبێ ئاڕاددەیەکی باش شارەزای هونەرەکانی جەنگ و جۆرەکانی (فنون الحرب وأنواعها) و فێڵ و تاکتیکەکانی بێ و لەوبارەشەوە تەواو چاوکراوە بێ.

### دوو : لایەنی ڕووحی :

دەبێ مەعنەویاتێکی زۆر بەرزی هەبێ و شەیدای شەهادەت و بەهەشت بێ و لەمردن و بریندار بوون سڵ نەکاتەوەو خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو ئیسلام و پاداشتی دوارۆژ هەموو شتێکی دیکەی لەلا گچکە بکاتەوە.

### سێ : لایەنی بەدەنی :

دەبێ ڕاهێنراوو مەشق دیتوو بێ و تەحەممولی سەرماو گەرماو برسیەتی و تینوێتی و هەڵ و مەرجە سەخت و دژوارەکانی جەنگ بکات.

### چوار : لایەنی چەکداری :

دەبێ زۆر کارامەو لێزان بێ لەبەکارهێنانی هەموو جۆرەکانی چەکی سووك و قورس داو، توانای نیشانەگرتن و ئامانج پێکانی زۆربێ و، لەکاتی پەککەوتنی چەکەکانیاندا دەستەوستان نەبن و توانای چاککردنەوەیانیان هەبێ.

## ٢. دابین کردنی پێداویستی یەکانی جەنگ :

بەڵێ... ئەمیش شێوازێکی تری گرنگی لۆژیکی (جیهادو بەرەنگاری) یە چونکە خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ﴾الأنفال(٦٠). پێغەمبەریش ﷺ لەتەفسیری (قوة) دا فەرموویەتی: ﴿ الا إن القوة الرمي، الا إن القوة الرمي، الا إن القوة الرمي ﴾رواه مسلم.

وەلەڕاستیدا هیچ کارێك ـ جەنگ و غەیری جەنگ ـ بەبێ دابین کردنی هۆو کەرەستەو پێداویستی یەکانی ئەنجام نادرێ، بۆیە خوای کاربەجێ لەبارەی (ذو القرنين) ەوە فەرموویەتی: ﴿ وآتيناه من كل شئ سببا فاتبع سببا ﴾الكهف (٨٤،٨٥)، هەروەها دەربارەی ئەوانەی کەبەبێ بەهانەی جۆراو جۆرەوە لەجەنگی (تەبوك) دواکەوتن

فەرموویەتی: ﴿ ولو أرادوا الخروج لأعدوا له العدة ولكن كره الله انبعاثهم فثبطهم وقيل اقعدوا مع القاعدين ﴾التوبة(٤٦).

شایانی باسە کەگرنگترین و سەرەکیترین پێداویستییەکانی جەنگیش چەك و چۆڵ و تفاقیەتی، بەڵام بەچەکی رووتیش شەڕ ناکرێت، ئازووخەو بەرگ و پزشاك و جێگاو رێگاو... هتدیش هیچی وایان لەچەك و کەرەسەکانیان کەمتر نییەو بەزاراوەی عەسکەری پشتی بەرەی جەنگیش چی وای لەپێشەوە کەمتر نییە!

## ٣. دانانی نەخشەی درێژخایەن ( الستراتيج ) و پلانە قۆناغییەکان ( التكتيكات المرحلية ) ی جەنگ:

دیارە هیچ کارێك بەبێ نەخشەی درێژخایەن و کاتی نەسەردەگرێ و نەبەر، ئاشکراشە کەفەرمانەدەیێتی کۆمەڵی موسڵمانی جەنگاوەر ئەگەر لەئاستێکی بەرزی زنست و شارەزاییدا نەبێ لەسیرەو ژیانی پێغەمبەرو خەلیفە راشیدەکانی بەتایبەت و مێژووی ئیسلام و جەنگەکانی بەگشتی و جەنگ و شەڕو شۆڕشەکانی مێژووی مرۆڤایەتی کۆن و نوێ و هاوچەرخ بەگشتیتر، هەروەها زۆر شارەزاو زۆر بەرچاورووون نەبێ لەبارودۆخی سیاسیی وڵات و ناوچەیی و جیهانی و، وەزعی جوگرافی و باری دەروونی و کۆمەڵایەتیی خەڵکی ئەو ناوچانە کەجەنگیان تێدا دەکرێ، ناتوانێ نەخشەو پلانی راست و درووست دابنێ و بریاری تەواوو پڕ بەپێست بدات، بەڵکو سەرەڕای ئەمانەش دەبێ ئەوانەی سەرپەرشتیی جەنگ و نەخشەو پلانەکانی دەکەن کەسانێك بن شارەزایی کردەییشیان لەو بارەوە هەبێ و خاوەن ئەزموونی خۆشیان بن، چونکە بێگومان هیچ کەس بە خوێندنەوەو موتالای کتێب و سەرچاوە عەسکەرییەکان نەبووەو نابێتە فەرماندە (قائد) هەروەك چۆن بەس بە خوێندنەوەی کتێب و دیوانەکانی شیعر کەس نەبۆتە شاعیر.

## ٤. فیداکاریی و بەخت کردنی سەروماڵ لە پێناوی خوادا:

ئەمیان (بیت القصید) ی جەنگ و جیهادەو کاکڵ و نێوەرۆکیەتی وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ إن الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة يقاتلون في سبيل الله فيقتلون ويقتلون ﴾التوبة (١١١)، بەڵام من بۆیە خستمە کۆتاییەوە چونکە ماڵبەخشین و بەکوردی (سەروماڵ خستنە سەر لەپی دەست) کاتێك جێگای خۆی دەگرێ کەئەو خاڵانەی پێشتر جێبەجێ کراون و ئەو شێوازانەی تر بەکارهێنراین.

دیارە لەکاتێکیشدا کەکۆمەڵی موسڵمان یان تەوژمی ئیسلامی هەرکام لەو چوار شێوازەی کاری ئیسلامی لەقۆناغی بەرەنگاریی و جیهاددا وەك پێویست و بەتێرو تەواوی بەگوێرەی توانا بەکاردێنێ، بێگومان ئەگەر خوای زانا و کاربەجێ ویستی لەسەربێ ئەم قۆناغەش دەبڕێ و دەچێتە قۆناغێکی دیکەوە کەبریتییە لەقۆناغی: (بالادەست و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی).

## چەند تێبینییەك :

لەکۆتایی ئەم باسەشدا ئەم چەند تێبینییە بەپێویست دەزانم:

**یەك :**

وەك پێشینان گوتوویانە (کەس لەبەر نابێتە کوڕ) کەواتە مسوڵمانان لەهەر کوێیەك بن و لەهەر حاڵێکدا بن، مادام خاوەنی قەوارەی سیاسی ی شەرعیی خۆیان نەبن لەوڵاتی خۆیاندا دەبێ دڵنیار مزگەر پێویستیان بەهێزو دەسەڵات هەر دەکات، جائەگەر بیانەوێ پاش (١٠-٢٠) ساڵی تریش لەپێناوی خواو بۆ بنیادنانی قەوارەی سیاسی ی خۆیان یان بۆپارێزگاری لێ کردنی بجەنگن هەر لەئێستارە خەریکی خۆئامادەکردنو دابین کردنی کەرەسەو پێداویستییەکانی بن، ئەگەرنا ئەرکاتیش بۆیان هەڵناسووڕێو هەرمشەی: ﴿ ولو أرادوا الخروج لأعدوا له عدة ﴾ یان بەسەردا دەچەسپێ.

**دوو :**

هەرکام لە دامو دەزگاکانی ڕاگەیاندن (الإعلام) بەهەموو بەشو جۆرەکانیەوە دامو دەزگای هەواڵگیری (الإستخبارات) و جاسووسی ڕۆڵێکی یەکجار گرنگو کاریگەر دەگێڕن لەبەهێزکردنو پتەوکردنی بەرەی جەنگو بردنەوەو سەرکەوتنیشدا بەتایبەتی لەکاتی فراوانبوونی جەنگو گۆڕانی لەجەنگی پارتیزانی (حرب العصابات)ەوە بۆ جەنگی بەرەیی (الحرب الجبهوية) دا، وە ئەگەر سەرنجی سیرەو ژیانی پێغەمبەرو خەلیفەکانیشی بدەین، دەبینین لەقەدەر ئەو سەردەمو ڕۆژگارە زۆر سوودیان لەهەرکام لەم دوو دامو دەزگایە وەرگرتووە لەحاڵەتی جەنگدا.

**سێ :**

بێجگە لەحاڵەتی جەنگی گشتی (النفير العام)، نابێ لەهیچ حاڵێکی تردا تێکڕای مسوڵمانان بچنە بەرەکانی جەنگەوەو دەست لەهەموو کاروبارو چالاکییەکی تریان هەڵبگرن، خوای کاربەجێ لەو بارەو فەرموویەتی: ﴿ وما كان المؤمنون لينفروا كافة فلولا نفر من كل فرقة منهم طائفة ليتفقهوا في الدين ولينذروا قومهم إذا رجعوا إليهم لعلهم يحذرون ﴾التوبة(١٢٢). دیارە جەنگ (قتال) یش لەئیسلامدا لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەڕزی کیفایەیە. مەگەر لەهەندێك حاڵەتی هەڵاوێرراو (الحالات الإستثنائية) کەتێیدا هەموو مسوڵمانان بەپیرو گەنجو نێرو مێو ووردو

درشتەوە فەرز دەبێ[1]، واتە دەبێتە فەرزی عەین.

## قۆناغی سێیەم:

# باڵادەستیو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی

بەسەرنجدانو وردبوونەوەی قورئانیش لەقورئانو سوننەتو سیرەی پێغەمبەر ﷺ و جێنشینو سەر راستە هیدایەت دراوەکانی خوا لێیان رازی بێ، ئەم پێنج شێوازەی کاری ئیسلامیش لەم قۆناغەدا دەبینرێن، وەك چەند شێوازێکی سەرەکیو بنەرەتی؛

### ١.جۆشدانەوەی زیاتری ڕیزەکانی مسوڵمانانو بەهێزترکردنی برایەتییان:

بەڵێ... یەکەمینو گرنگترین شێوازی کارو خەباتی ئیسلامی لەقۆناغی باڵادەستبوونو حوکمڕانێتیدا بریتییە لەزیاتر جۆشدانو توندو تۆڵکردنەوەی ڕیزەکانی مسوڵمانان، چونکە قۆناغی دوای سەرکەوتنو حوکمڕانێتی ئیسلامییەکانو ئەهلی ئیسلام بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆر کەسەوە زۆر قورسترو سەختو پڕ مەترسیترە لەقۆناغی بەرەنگاریو جیهاد . بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا . چونکە دوژمنو ناحەزانی ئیسلام بەسەرۆکایەتی ئیمپریالیزمو وابەستەو دابەستەکانی یەکجار بەوە قەڵسو کێچیان دەکەوێتە کەوڵ کەئیسلامو دەستورو یاسا خواییەکانی لەکیانو دەوڵەتێکی راستو دروستدا تەحەولا بکات، بۆیە بەهەموو توانایانەوە سەرگەرمی ئەوەن کەپەرچو لەمپەر بخەنە ڕێی ئەو کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییانەی کەئامانجیان گێڕانەوەی حوکمی ئیسلامو بەرپا (إقامة) کردنەوەی کیانو دەسەڵاتەکەیەتی. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵو بزووتنەوە جیهادییەکان لەقۆناغی خەباتو بەرەنگارییاندا هەموویان هەر بەدوژمنو شکاندنیو نیزیك کردنیەوە خەریکنو نایان پەرژێتە سەر شتیتر، بەڵام

---

(١) دەتوانی بۆ شارەزایی زیاترو چاکتر دەربارەی (جهاد) و (قتال) لەئیسلامدا سەرنجی ئەم سەرچاوانە بدەی کەیەکەمیان گرنگترینو بەهێزترینو فراوانترینیانە:

١. (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) ی د. محمد خير هيكل.

٢. (العمدة في إعداد العدة للجهاد في سبيل الله تعالى) ی عبدالقادر بن عبدالعزيز.

٣. (الجهاد في سبيل الله حقيقته وغايته) عبدالله بن أحمد القادري.

٤. (النشرات الجياد في فقه الجهاد) ی أبو إبراهيم المصري.

٥. (القتال في الإسلام) ی أحمد نادر.

٦. كتێبو بەرهەمەکانی د. عبدالله عزام.

خوای بێهاوتا لەسوورەتی (المائدة)دا لەئایەتی (٥١) ەوە هەتا ئایەتی (٥٦) باسی ئەم مەسەلەیەی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ یاءیها الذین آمنوا لاتتخذوا الیهود والنصاری أولیاء بعضهم أولیاء بعض ومن یتولهم منکم فإنه منهم إن الله لایهدي القوم الظالمین. فتری الذین في قلوبهم مرض یسارعون فیهم یقولون نخشی ان تصیبنا دائرة فعسی الله ان یاتي بالفتح أو امر من عنده فیصبحوا علی ماأسروا في انفسهم نادمین. ویقول الذین آمنوا أهؤلاء الذین أقسموا بالله جهد ایمانهم إنهم لمعکم حبطت اعمالهم فاصبحوا خاسرین. یاءیها الذین آمنوا من یرتد منکم عن دینه فسوف یات الله بقوم یحبهم ویحبونه أذلة علی المؤمنین اعزة علی الکافرین یجاهدون في سبیل الله ولایخافون لومة لائم ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء والله واسع علیم إنما ولیکم الله ورسوله والذین آمنوا الذین یقیمون الصلاة ویؤتون الزکاة وهم راکعون ومن یتول الله ورسوله والذین آمنوا فإن حزب الله هم الغالبون ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەکەو دیانەکان مەگرن بەدۆست هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن، وەهەرکەسێك لەئێوە دۆستایەتی‌یان بکات ئەوە ئەویش لەوانە، بێگومان خوا کۆمەڵی ستەمکاران ڕێنموونی ناکات، جائەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە دەیانبینی پەلەپەل دەکەن لەدۆستایەتی‌یاندا دەڵێن دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت‌و دەڵێن ئەگەر لەگەڵ ئەواندا دۆست بین پێیان دەگرێینەوە ـ جازۆر نزیکە خوا سەرکەوتن یان وەزعێك لەلایەن خۆیەوە بێنێتە پێش‌و ئەوانیش ـ واتە جوولەکەو دیانەکان ـ پەشیمان ببنەوە. وەبڕوادارانیش بڵێن: ئائەوانەبوون کەبەتەئکید سوێندیان دەخوارد کەلەگەڵ ئێوەدان ـ واتە لەگەڵ مسوڵمانان‌دان ـ کردەوەکانیان هەڵوەشانەوەو لەزیانبارانن.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەرکەسێکتان لەئاینەکەی خۆی پاشگەز بێتەوە ئەوە لەمەودوا خوا کۆمەڵێك دێنێ ـ بۆ بووژاندنەوەی ئاینەکەی ـ خۆشی دەوێن‌و خۆشیان دەوێ، لەسەر بڕواداران نەرم‌و نیانن‌و لەگەڵ کافراندا تووندو تیژن، لەڕێی خوادا تێ‌دەکۆشن لەلۆمەی لۆمەکاران بێ‌باکن. ئەوەش بەخششی خوایە دەیدات بەهەرکەسێك بیەوێ، وەخوا فراوان‌و زانایە.

بێگومان دۆست‌و پشتیوانی ئێوە بەس خواو پێغەمبەرەکەی‌و بڕواداران. ئەوانەن کە نوێژ دەکەن‌و زەکاتێ دەدەن‌و لەڕکووع‌دان. وەهەرکەسێکیش دۆستایەتی خواو پێغەمبەرەکەی‌و بڕواداران بکات ئەوە ـ کۆمەڵی خوایەو ـ بێگومان کۆمەڵی خواش زاڵ‌و سەرکەوتوون.

لەم شەش ئایەتە بەهێزو پیرۆزەی خوای بەرزو مەزن ئەم چەند ڕاستی‌یە سەبارەت بەمەسەلەی (دۆستایەتی) و کێ دۆستی بڕوادارانەو دەبێ کێ بەدۆست‌و پشتیوانی خۆیان بزانن دەبینرێن:

**یەکەم:**

درووست نیەو ڕەوا نیە هیچ کام لەمسوڵمانان جوولەکەو دیانەکان بەدۆست بگرێ‌و هەرکەسێك ئەوە بکات وەك ئەوان تەماشا دەکرێ. (دیارە ئەو وەك ئەوان لەقەڵەمدرانە

چەند پلەیەکی هەیە بەگوێرەی توندیو سووکیی دۆستایەتییەکە کەلەکوفری گەورەوە دەگرێتەوە هەتا هەموو جۆرەکانی گوناح)[١].

**دووەم:**

هەرکەسێك دۆستایەتی لەگەڵ جولەکەو دیانەکان. کەدوو نموونەی ئەهلی کوفرن. بگرێ بەبیانووی ترس‌و بەرژەوەندیو...هتد ئەوە ئەو برو بیانووانە شەفاعەتی بۆ ناکەنو بەدەغەڵو دڵنەخۆش دادەندرێ.

**سێیەم:**

ئەو دۆستایەتی گرتن‌و کەبینو بەین هەبوونە لەگەڵ ئەهلی کوفردا دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەو بەتاڵبوونەوەی کردەوە چاکەکانی ئەو جۆرە کەسانە کەئەو رەفتارو هەڵوێستە خائینانەیەیان لێ دەپشکوێتەوەو. زیانبارو دەستخەرۆ دەبن.

**چوارەم:**

بەنیشانەی ئەوەی کەدرا بەدوای باسکردنی ئەم مەسەلەیە خوای کاربەجێ مەسەلەی پاشگەزبوونەوە (ڕتداد)ی هێناوەتە پێش. ئەوە دەگەیەنێ کەدۆستایەتی کردن لەگەڵ ئەهلی کوفر مایەی هەڵگەڕانەوەی ئینسانە لەئیسلام. (وەك گوتمان ئەو دۆستایەتیە چەند جۆرو حاڵەتێکی هەیەو لەهەندێکیاندا هەڵگەڕانەوەو کافربوون دێتە دی).

**پێنجەم:**

ئەوکەسانەی کەخوا بەشایستەی ئەوەیان دەزانێ کەئایینو بەرنامەی خۆیایان پێ بەرزێنێتەوە دەبێ خاوەنی ئەم خەسڵەتانە بن:

أ ـ خوا خۆشی بوێن.

ب. خوایان خۆش بوێ.

ج. لەگەڵ برواداراندا نەرم‌و نیانو بەبەزەیی بن.

د. لەئاقار کافراندا توندو تیژو رەقن ـ لەحاڵەتی بەرەنگاریدا ـ .

هـ لەڕێی خوادا تێدەکۆشن ـ لێرەدا مەبەست جەنگ کردنە .

و. لەلۆمەو تانەی لۆمەکەران ناترسێن.

ز. بەس خواو پێغەمبەرەکەیو موسڵمانانی خاوەن نوێژو زەکاتو ڕکووع بەدۆستو پشتیوانی خۆیان دەزانن.

**شەشەم:**

(١) لەکۆتایی ئەم باسەدا لێکۆڵینەوەیەکی گوشراو لەچەند حاڵێکی کورتدا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەسەلەیە دەخەینەڕوو.

کۆمەڵی موسوڵمان بێجگە لەخواو پێغەمبەرەکەی و بڕوادارانی پابەند بەئاینەوە. ئەو پابەندی یە لەنوێژو زەکات و ڕکوعدا خۆی دەنوێنێ. بۆیان نیە دۆستایەتی لەگەڵ هیچ کەسی تردا بگرن (چونکە وشەی ﴿ إنما ﴾ لەزمانی عارەبی دا پێی دەگوترێ «أداة الحصر والإثبات» واتە ئامرازی کورت هەڵێنان و چەسپاندن چونکە هەرکاتێك بەکارهێنرا بۆ ئەوەیە کەئەو حوکمە بۆ شتێك بچەسپێنێ و تێیدا کورتی هەڵبێنێ).

**حەوتەم:**

بەس ئەوانە بەکۆمەڵی موسوڵمان و کۆمەڵی خوا (حزب الله) دادەندرێن کەئەو حەوت خەسڵەتەی باسکران تیایاندا و حەتمەن کۆمەڵی خواش زاڵ و سەرکەوتووە.

ئێستاش کەزانیمان کێ دۆستی کۆمەڵی موسوڵمانە بۆمان ڕوون بۆوە کەدەبێ کۆمەڵی موسوڵمان لەگەڵ کێدا دۆستایەتی بگرێ. بابزانین ئایا هیچ کاتێك دەگونجێ کۆمەڵی موسوڵمان بێجگە لەخواو پێغەمبەرو بڕواداران کەسی تر بەدۆست بگرێ، وەئایا دۆستایەتی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و بڕواداران هەمووی هەر یەك واتایە یان جیاوازی ی هەیە؟!

## ٢- ئایا دەگونجێ کۆمەڵی موسوڵمان جگە لەخواو پێغەمبەرو بڕواداران کەسی تر بەدۆست بگرێ، وەئایا دۆستایەتی کردنی خواو پێغەمبەرو بڕواداران هەر یەك واتای هەیە؟!

**یەکەم:**

لەوەڵامی بڕگەی یەکەمی ئەم پرسیارەی سەرەوەدا دەڵێین: نەخێر ناگونجێ و درووست نیە، چونکە:

ا- وەك لەخاڵی دووەمدا خستماندڕوو وشەی ﴿ إنما ﴾ ئامرازی (الحصر والإثبات)ە و کەچۆتە سەر ﴿ وليكم ﴾، مانای وایە دۆست و پشتیوانی کۆمەڵی موسوڵمان هەر ئەو سێیانەن و کەسی تر نیە.

ب- لەچەندان ئایەت و فەرموودەی تردا ئەو ڕاستی یە تەئکید کراوەتەوە، بۆ وێنە:

- ﴿ لايتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شئ إلا أن تتقوا منهم تقاة ويحذركم الله نفسه وإلى الله المصير ﴾ آل‌عمران (٢٨).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا لاتتخذوا بطانة من دونكم لايالونكم خبالا ودوا ماعنتم قد بدت البغضاء من أفواههم وما تخفي صدورهم أكبر قد بينا لكم الآيات إن كنتم تعقلون ﴾ آل‌عمران (١١٨).
- ﴿ ياءيها الذين آمنوا لاتتخذوا عدوي وعدوكم أولياء تلقون إليهم بالمودة وقد كفروا بما جاءكم من الحق- ﴾ الممتحنة (١).

**دووەم:**

لەوەڵامی برگەی دووەمیشدا دەڵێین: نەخێر دۆستایەتی کردنی خواو پێغەمبەرو بڕواداران هەر بەیەك مەعنا نیەو بەم شێوەیەیە:

أ. خوای پەروەردگار کەچەق (مرکز) ی دۆستایەتیەو دۆستایەتی پێغەمبەرو بڕواداران دوو لقن کەلەو چەقە پەیدا دەبن. بەڵێ خوای پەروەردگار لەهەموو کاتو شوێنێك بەهەموو چەمكو واتایەکانی دۆستایەتی (نزیکیو خۆشویستنو پشتپێبەستنو کارپێسپاردنیان..) دۆستو یاوەری کۆمەڵی موسڵمانە. بەڵام دیارە دۆستایەتی پێغەمبەرو بڕواداران بەچەمكو واتایەکی گچکەترو تەسكترەو ئاوا فراوانو هەمەلایەنە نیە.

پێغەمبەری بەرێزو پایەبەرزمان ﷺ لەڕووی خۆشویستنو شوێن پێ هەڵگرتنەوە بێگومان لەدوای گەورەترینو چاکترین دۆستانە. بەڵام لەڕووی یارمەتیدانو پشتپێبەستنو مشوورخواردنەوە، دیارە ئەو فەرماندانەی کەلەجێگای ئەو زاتەن لەنێو موسڵمانانەدا ئەو رۆڵە دەگێڕن، دوای کۆچی ئەو!

ج. بڕوادارانیش دیارە هەرکەسەو هەر کۆمەڵەیان بەئەندازەی ئیمانو تەقوایەکیان دەبێ بکرێنە دۆستو پشتیان پێبەسترێو دڵیان پێخۆش بکرێ. نەك بەموتڵەقیو بەیەك چاو سەیر بکرێن!

بۆ وێنە: دۆستایەتیمان لەگەڵ موسڵمانێکی صالحو پارێزکارو دامەزراودا پلەیەکی هەیەو، لەگەڵ یەکێکی خوارو گوناحباریشدا پلەیەکی تری هەیەو لەیەك تەرازوودا نین.

دیسان موسڵمانێك کەلەبازنەی کارو کۆمەڵێکی ئیسلامیداو لەسەر ئەو بنەمایانەی کەپێشتر باسمان کرد لەگەڵمان یەك دەگرنەوە دۆستایەتیەکەیان پلەیەکی هەیەو، لەگەڵ موسڵمانانی تریشدا جا لەبازنەی کۆمەڵێکی ئیسلامیدا بن یان نەبن پلەیەکی تر یان چاکتر بڵێین: چەند پلەیەکی تری هەیە.

بەڵێ...دەبێ لەم ڕووەوە زۆر وردو وریا بینو لەحیساباتی خۆماندا بەهەڵەدا نەچین، هەروەك ناشبێ ئەو حیسابو کیتاب کردنە واشمان لێبکات کەلەنێو بازنەی تەسکی کۆمەڵو بزووتنەوەکەی خۆماندا خۆمان ڕێك بخەینو لەجەماوەری موسڵمانانو ئیسلامیەکانیتر دابڕێینو، وابزانین جگە لەخۆمان کەسیتر لەدنیادا نیە!

**تێبینی یەك:**

لەکۆتایی ئەم خاڵەشدا ئەم تێبینیە بەپێویست دەزانم بیخەمەڕوو:

ئەگەر دۆستایەتی گرتن (خۆشویستنو پشتپێبەستنو شوێن کەوتنو رازو نیازو نهێنی لەلا درکاندنو... هتد) لەگەڵ کافراندا قەدەغەیە، چاکە لەگەڵ کردنو دادگەریو بەزەیی نواندنو خێرخوازیو دەستبەسەرداهێنانیان نەك هەر قەدەغە نیە. بگرە خوا فەرمانیشی پێکردووەو مەدحیشی کردووە، مادام ئەو کافرانە لەحاڵەتی بەرەنگاریو دژایەتی کردنماندا نەبن: ﴿ لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا إليهم إن الله يحب المقسطين ﴾ الممتحنة (٨).

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر باسی خاڵی چوارەمی ئەم باسەو بزانین داخوا،

## ٤. لەواقیعی ئەمڕۆماندا . دوای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کێ دۆستمانە؟

وەك پێشتر باسمانکرد دۆست و پشت و پەنای ڕاستەقینەو مرتلەق و هەمیشەیی بۆ کۆمەڵی موسڵمان بەس خوای میهرەبانو دەسەڵاتدارەو. هەر ئەویش (سبحانە وتعالی) چەقی دۆستایەتی (مرکز الموالاة) یە هەروەك چۆن شەیتانیش بەپێچەوانەوە چەقی دوژمنایەتی (مرکز المعاداة) یە. موسڵمانانیش بەئەندازەی نێزیکی یان لەپێغەمبەرەوەو پابەندی یان بەقورئانو سوننەتەوە لەهەر شوێنێك بن و بەهەر ناونیشانێکەوە بێ دۆست و یارەرو پشتیوانمانن، جالەسەر ئەم بنچینەیە دەتوانین بڵێین:

ا. کۆمەڵ و بزووتنەوەو ئەوژمە ئیسلامی یەکان لەنێو کوردستانو عێراق و وڵاتانی دەرو دراوسێ و سەرانسەری جیهانی ئیسلامی و نائیسلامیشدا نێزیکترین کەس و باشترین دۆست و پشتیوانمانن، لەپێش هەموویشیانەوە ئەوانەیان کەبڕوایان بەسیاسەتی جیهادو بەرەنگاربوونەوەو جەنگ هەیەو ئەگەر ئێستاش بەکردەوە ئەو سیاسەتە پیادە نەکەن[1] سەرگەرمی ئامادەیی و دابین کردنی پێداویستی یەکانی بن. تاکو بەیارمەتی ی خواو پاشان هەوڵ و هیممەتی موسڵمانانی دڵسۆزو فیداکار دووبارە ئایین و بەرنامەی خوا بەرپا بکرێتەوەو. وڵاتمان لەکوفرو ستەمو فەساد پاك بێتەوە.

ب. هەروەها کەسایەتی یە ئیسلامی یەکان بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە چ نێزیك بن چ دوور، بەهەمان شێوە نێزیکترین دۆست و پشتیوانانن پاش کۆمەڵ و بزوتنەوە ئیسلامی یەکان، کەپێمان وایە ئەگەر کارێکی گەورەو گرنگ لەم ڕۆژگارەدا بۆ ئیسلام بکرێ هەر بەوان دەکرێ.

ج. دیسان ئەو دامو دەزگا ئیسلامی خزمەتگوزاری و کۆمەڵایەتی یانەی کەسەرگەرمی خزمەتی خەڵك و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتن بەهەمان شێوە. بەڵام بەم ڕیزکردن (ترتیب) ە.

د. ئەو موسڵمانانەش . چ نزیك چ دوور . جالەشێوەی دەوڵەت و کۆمەڵ و ئەوژم دابن یان بەهەر شێوەیەکی تر کەئێمە وەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت . بەگوناحبارو خاوەن بیدعەت و لاڕێ (منحرف) یان دەزانین، بەڵام پێمان وایە کەلەبازنەی ئیسلام نەچوونەتە دەرێ و لەئەهلی قیبلە تەشۆراون، ئەوانیش بەهەمان شێوە بەئەندازەی موسڵمانەتی دینداری و پابەندی یان بەشەریعەتەوە، بەدۆستیان دەزانین و چاکەکانیانمان خۆش دەوێ و. ڕقیشمان لەگوناح و خراپەکانیانە. ئەمەش (واتە کەسانێك چاکەو خراپە یان شەرعی و

---

(١) بۆیە گوتوومانە (بڕوایان بەسیاسەتی جیهادو بەرەنگاربوونەوەو جەنگ هەیە) و نەمانگوتووە (بڕوایان بەجەنگ و جیهاد هەیە) چونکە هیچ موسڵمانێك نیە بڕوای بەفەرزبوونی جیهادو جەنگ نەبێت، بەڵام کێشە لەسەر ئەوەیە کەئایا بەحوکمە ئەخشەو بەرنامەی کارو سیاسەتی گۆڕینی واقیع بەرەو ئیسلام یان نا؟!

ناشەرعییان تێدابێ و لەبەر چاکەو شەرعییەکەیان خۆشیان بوێ و لەبەر خراپەو ناشەرعییەکەشیان بیانبوغزێنێ) مەسەلەیەکە هەموو زانایانی ڕەسەنی ئیسلام لەسەری یەکدەنگ (متفق) ن، بەپێچەوانەی (خوارج) و (معتزلة) و (روافض) دوە کەلەم مەسەلەیەو چەند مەسەلەیەکی تردا لەڕێبازی ڕاستی (أهل السنة والجماعة) لایان داوە. بەڵام بەگشتی لادانەکەیان هێندە نیە کەپێی لەبازنەی ئیسلام بچنە دەرێ و لەئەهلی قیبلە بترازێن.

ئێستاش لەکۆتایی ئەم باسەدا ـ وەك پێشتر گفتمان دا ـ (لێدوانێکی گوشراو) دەربارەی جۆرو چۆنیەتی و پلەو حاڵەتەکانی دۆستایەتی کردنی کافران لەچەند خاڵێکی زۆر کورتدا دەکەینە (مسك الختام)ی ئەم باسە گرنگ و حەساسە:

## لێدوانێکی گوشراو دەربارەی پلەو حاڵەتەکانی دۆستایەتی کردنی کافران:

دەتوانین ئەو پلەو حاڵەتانە بۆ چوار پلەو جۆر دابەش بکەین کەئەمانەن:

ا. کەدەبێتە هۆی کافربوون و لەدین دەرچوون و هەڵگەڕانەوە.

ب. کەگوناحی گەورەیە مەگەر بەحەڵاڵی بزانێ ئەگەرنا پێی کافر نابێ.

ج. کە یان گوناحی گچکەیە یان ناپەسند (مکروه)ە.

د. کەهیچ جۆرە گوناحبارییەکی تێدا نیەو هەر لەخانەی موباح دایە.

جائێستا بابزانین هەر کام لەم چوار پلەو حاڵەتە چەند نموونەیەك بێنینەوە:

### ا.پلەو حاڵەتی یەکەمی دۆستایەتی کردنی کافران کەموسڵمان پێی دووچاری کوفرو هەڵگەڕانەوە دەبێ:

وەك:

- دۆستایەتی کردنی موتڵەق و هەمە لایەنە (التولي المطلق).
- خۆشویستنیان لەبەر ئاینەکەیان (دوای گۆڕان و دەستکاری کردنیان).
- بەخۆزگەخواستنی سەرکەوتنیان بەسەر موسڵماناندا.
- فەرمانبەری کردنیان ـ بەدڵ و قەناعەتەوە ـ لەمەسەلەی یاسادانان (تشریع) دا.
- قەناعەت هەبوون بەوەی کەوەك موسڵمانانن و یەکسانن و موسڵمانان ئیمتیازیان بەسەریاندا نیە.
- خۆلێبردنە پێشیان و ماستاو بۆکردنیان بۆ ڕازی کردنیان لەڕووی خۆشەویستییەوە.
- متمانە پێکردنیان و بەئەمیندار دانانیان لەجیاتی موسڵمانان.
- هاوکاری و پشتیوانی کردنیان بۆ سەرخستنیان بەسەر موسڵماناندا ـ بەبێ فشارو ناچاری ـ.
- چاولێکردن و لاساکردنەوەو خۆ ڕێچواندنیان (التشبه بهم) بەموتڵەقی یان لەمەسەلەکانی عەقیدەو عیبادەتدا بەتایبەت ـ بەبێ فشارو زۆرو ناچارکران ـ.

ب- پلەو حاڵەتی دووەم کەبەگوناحی گەورە لەقەڵەم دەدری بەمەرجیك ئەو شتانە بەحەڵاڵ نەزانێ:

وەك:

- نەرمی بۆ نواندنو گەردن بۆ کەچ کردنیان (المداهنة والتذلل لهم).
- کردنیان بەجێگای رازو نیاز (إتخاذهم بطانة).
- زیادەرۆیی کردن لەگەورەگرتنو پایەبەرزکردنەوەیاندا.
- چوونە ژێر رکێفو دەسەڵاتو حوکمرانی‌یانەوە بەبێ پێویستیو بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی.
- بەشداری کردنیان لەکاروباری ئایینیو موناسەباتیاندا لەرووی (مجاملة) وە نەك قەناعەتو بروا، وەداوای لێبووردن کردن بۆ مردووەکانیان.
- لاساکردنەوەو خۆوێچواندنیان (التشبه بهم) لەهەڵسوکەوتو درووشمەکانیاندا وەك جەژنو موناسەباتی مردنو لەدایك بوون.
- نیشتەجێ بوون لەنێوانیاندا بۆ کەسێك کەنەتوانێ دینداری‌ی خۆی ئاشکرا بکاتو توانای کۆچکردن (هجرة) یشی هەبێت.
- پیرۆزبایی لێ کردنیان بەبۆنەی ئەو درووشمانەیانەوە کەتایبەتن پێیانەوەو درووشمی نیشانەی کوفریشن.

ج- پلەی سێ‌یەمی دۆستایەتی کردنی کافران کە یان گوناحی گچکە یان ناپەسند (مكروه) ە:

وەك:

- مەدح کردنو ستایش کردنیان بەبێ پاساوەو (مبرر) ێکی شەرعی. بەڵام نەك لەبەر ئایینەکەیان.
- هاوەڵایەتی کردنو لەگەڵ ژیانیان (بەبێ بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی).
- متمانەی موتڵەق پێ کردنیان.
- کار لەلاکردنیان لەگەڵ بەسوك سەیرکرانو بێ‌ڕێزی‌دا.
- خۆ وێچواندنیان لەبەرگو پۆشاکو نەریتیاندا (کەتایبەتن بەکوفرەوە).
- دووعا بۆکردنیان بەتەندرووستیو سەلامەتیو تەمەن درێژیو بەرقەراری.
- پیرۆزبایی لێ کردنیان لەموناسەباتی ئاسایی‌دا وەك ژنو ژنخوازیو رزگاربوون لەبەڵایەك.

د- حاڵەتی چوارەم کەبەدۆستایەتی (الموالاة) دانانرێو لەخانەی موباح بەولاوە نیە:

وەك:

- چاکەو دادگەری لەگەڵ کردنیانو خۆشرەفتاری لەگەڵیان. کەئەمە سەردەرای موباح بوون

خێرو چاکەشەو خوایش فەرمانی پێ کردووە وەك پێشتریش باسمان کرد.

- خێر کردن بەنداره‌کانیانو پارمەتی‌دانیان.
- سەرخۆشی لێ کردنیان بەشێوەیەکی شەرعی.
- دیاری بۆ ناردنو دیاری لێ‌قبوولّ کردنیان.
- وەلامدانەوەی سەلامیان ئەگەر بەشێوەیەکی درووست نەك بەموخەنەتی سەلامیان کرد.
- مامەڵەو بازرگانی لەگەڵ کردنیان لەشتی موباحدا.
- خانوو پێدانیان بەکرێ، بەمەرجێك بۆ خراپەی موسڵمانان بەکاری نەهێنن وەك بنکەی جاسووسی.
- کارپێ‌سپاردنیان بۆ مەبەستی موباحو شەرعی. لەگەڵ هەبوونی توانای دەرخستنی موسڵمانەتی‌دا.
- سەفەر بۆ نێر کردنیان بۆ مەبەستی موباحو شەرعی لەگەڵ هەبوونی توانای دەرخستنی موسڵمانەتی‌دا.
- لەنێوانیاندا مانەوەو نیشتەجێ‌بوون بۆ مەبەستی شەرعی. لەگەڵ توانای دینداری کردندا بەئاشکرا.
- سەردانو هامو شۆیان بۆ مەبەستێکی شەرعی.
- کەڵك لێ‌وەرگرتنیان لەبواری پیشەسازیو کاروباری دنیاییو ئەوەی ئەوان تێیدا شارەزاترن.
- خواردنی خواردەمەنی‌یانو ژن لێ‌هێنانیان٭ . ئەگەر ئەهلی کیتاب بن لەجوولەکەو دیانەکان ـ لەکاتی پێویستدا.
- هەبوونی خۆشەویستیو مەیلی سرووشتی لەگەڵ هاوسەری کیتابیو کوڕو باب و براو خوشكو کچو خزمدا، یان هەرکەسێك کەچاکەیەکیان لەگەڵ دەکات ، یان ئەدەبو رەوشتێکی جوانی هەیە، هەرچەندە هەندێك لەزانایان ئەمە بەگوناحی گچکە یان ناپەسند (مکروه) دەزانن(١).

سبحان ربك رب العزة عما یصفون. وسلام علی المرسلین.

والحمد لله رب العالمین.

٢٩/رەمەزان/١٤١٦، ١٨/شوبات/١٩٩٦، مەریوان

■ ■ ■

---

(١) بۆ ئەم لێدوانە گوشراوە سەرچاوەکەم کتێبی (الولاء والعداء) ی ذکتۆر (عبدالله بن إبراهیم الطریقي) بوو لەگەڵ هەندێك وردە دەستکاری خۆمدا، کەئەویش ئاماژەی کردووە بۆ کتێبو سەرچاوە شەرعی‌یەکانی باسەکەی.

# ڕێخۆشکردن

لەئیسلامدا مەسەلەی دوژمنایەتی (المعاداة) یش لەگرنگی و بایەخدا هاوتای دۆستایەتی (الموالاة) یەو هیچیان بەبێ ئەویتر بەکەڵك نایەن. جائێمە خوا پشتیوان بێ لەچەند خاڵێکدا تیشك دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیەو، ڕوونی دەکەینەوە داخوا:

١. دوژمن و دوژمنایەتی لەڕوانگەی ئیسلامەوە یانی چی؟!

٢. چەقی دوژمنایەتی (مرکز المعاداة) کێیەو سەرکردەی بەرەی (باطل) کێیە؟

٣. ئاوو نیشانی عەقیدەیی دوژمنانی خواو چوارچێوەی سیاسییان چییە؟

٤. لەواقیعی ئەمڕۆماندا دوژمنانمان کێن؟!

٥. هەڵوێستمان لەئاستیاندا دەبێ چۆن بێ؟!

بۆئەوەی ئەگەر لەبەشی نۆیەم (دۆستانی پشتیوان) دا زانیمان بەرەی هەق (جبهة الحق) چییەو چۆنە، لەم بەشەشدا بەرەی ناهەق (جبهة الباطل) بناسین.

دیارە لەسۆنگەی ئەوەوە کەدۆستایەتی و دوژمنایەتی (الولاء والبراء) وەك دوو ڕووی بەراوەژوو وپێچەوانەی یەکتر لەهەموو شتێکدا بەرانبەری یەکن بەڵام بەباری پێچەوانەدا تاڕادەیەکی باش بەشی نۆیەم لەم بەشەشدا یارمەتیمان دەدات و ڕێگامان بۆ کورت دەکاتەوەو گەلێك ڕوونکردنەوەو لەسەر ڕۆیشتنمان لەکۆڵ دەکاتەوە. پەندی عارەبیشە کە (الأشياء بأضدادها تعرف)!

ئیدی (لەئێمە هەرەکەت و لەخوا بەرەکەت) وەك پێشینان گوتوویانەو منیش دەڵێم: (هەرەکەت و بەرەکەت هەردووکیان لەخوا). چونکە بەبێ ئەو نەبڵێند هەیە نەنەوی. نەئاسمان و نەزەوی! بەڵام وریابە لێرەدا لەچاڵی پەستو بەتاڵی یەکبوونی بوون (وحدة الوجود) نەکەوی!!چونکە بوونی حەقیقی هەر خۆیەتی. بەڵام تەنیا بۆخۆیەتی. تۆش تۆی و ئەونی بەڵام لەوی!!

## ١. دوژمن[1] (عدو) و دوژمنایەتی (المعادات) لەڕوانگەی ئیسلامەوە یانی چی؟

وشەی (عدو) کەوشەیەکی عارەبییە لەفەرهەنگەکانی زماندا دەڵێن: (عاداه معاداة وعداء، أي كان له عدوا) کەلەزمانی کوردیدا (دوژمن) واتایەتی. چونکە فەرهەنگەکان

---

(١) سەرنجی فەرهەنگی (لسان العرب) بدە، ب١٥، ل٣٦، هەروەها (المعجم الوسيط)، ب٢، ل٥٩٥، وە (تفسير مفردات الفاظ القرآن الكريم) ی سميح عاطف الزين.

دەڵێن (العدو ضد الولي وضد الصديق) واتە: وشەی (عدو) دژی وشەی (ولي ، دۆست) و وشەی (صديق ـ هاوەڵ) ە. وە دەڵێن: (تعادى القوم: عادى بعضهم بعضا) واتە: (تعادى القوم) یاسی: هەندێکیان دوژمنایەتی هەندێکیان کرد.

جا مادام (موالاة)و (معاداة) دژی یەکتر بن، وەك فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن، کەواتە ئەگەر دۆست (ولي) بە (نزیك و برادەرو خۆشەویست و پشتیوان و یارمەتیدەرو سەرپەرشتیار) بگوترێ دیارە دوژمن (عدو) یش بریتییە لەکەسێك کە: (لێت دوورەو ناحەزتەو خۆشی ناوێ و دژتەو بەرهەڵستیت دەکات و پیلانت لێدەگێڕێ) دیارە هەرکەسێکیش ئەمانەی لەگەڵ کردی مانای وایە دوژمنایەتی کردووی.

جا شایانی باسە واتای (عدو) و (معاداة) لەزاراوەی شەرعیشدا لەگەڵ واتا زمانەوانییەکەی پێکەڵپێك و جووتەو هیچ جیاوازییان نیە، بەڵام لێرەدا دەبێ ئاگاداری چەند مەسەلەیەك بین:

**یەکەم:**

دژایەتی و دوژمنایەتی کردنی کافران لەلایەن موسڵمانەوە بەس لەرق لێ بوونەوە (بغض) یاندا کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو هەروەك چۆن خۆشەویستی (المحبة) پێشەکی و بناغەو یەکەمین قۆناغی دۆستایەتی (الموالاة) یە، رق لێ بوونەوەش بۆ (دوژمنایەتی) هەمان پلەی هەیەو هەمان دەوری تێدا دەبینێ.

(راغب الأصفهاني) یش لە (مفردات ألفاظ القرآن) پێناسەی رق لێ بوونەوە (بغض)ی کردووە: (هو نفار النفس عن الشئ الذي ترغب عنه، وهو ضد الحب، فإن الحب إنجذاب النفس إلى الشئ الذي ترغب فيه)[1]. واتە: بریتییە لەبێزاری و دوورکەوتنەوەی نەفس لەو شتەی کە حەزی لێ نیە، وە ئەوەش دژی خۆشویستنە، چونکە خۆشویستن بریتییە لەپەلکێش بوونی نەفس بەرەولای ئەو شتەی کەکەیفی لێ دێت.

**دووەم:**

دوژمنایەتی و دژایەتی کردنی ئەو کەس و کۆمەڵ و خەڵکانەی کەشەرع دوژمنایەتی کردنیانی فەرزکردووە، مانای ئەوە نیە کەموسڵمان لەو دژایەتی کردنەدا هیچ سنوورو لەمپەرێکی لەپێش نەبێ جەمووو رێگایەکی لەبەردەمدا توخت و ئاچووغە! بەڵکو موسڵمان هەرووەك چۆن بەفەرمانی شەرع و لەو سنوورەدا کەشەرع بۆی دیاری کردووە دۆستایەتی دەکات، بۆ دوژمنایەتیش بەهەمان شێوە، پێویستە چ لەکاتی ئاشتی و صوڵح و چ لەدەمی جەنگ و کوشتاریشدا ئاگای لەسنوورەکانی شەرع بێت. هەربۆیەش قورئانی خوای کاربەجێ لەگەرمەی جەنگ و هەراو لەجەنگەی رق و بوغزدا

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ل٥٥.

فەرمان بە موسڵمانان دەکات کە پارێزکار (متقي) و دادگەر (عادل) بن و نەشەرپێی لێترازێن و دەستدرێژی کافران و. نەرق و بوغزیان بەرانبەریان وایان لێنەکەن کە بەدەر بن لە شەرع دەربچن و پێچەوانەی پارێزکاری (تقوى) و دادگەری بجوولێنەوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ ..فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل مااعتدى عليكم واتقوا الله واعلموا إن الله مع المتقين ﴾ البقرة (١٩٤)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ياأيها الذين آمنوا كونوا قوامين لله شهداء بالقسط ولايجرمنكم شنآن قوم على ألاتعدلوا اعدلوا هو أقرب للتقوى واتقوا الله إن الله خبير بما تعملون ﴾ المائدة (٨).

**سێیەم:**

دادگەری و چاکەکاری و بەزەیی نواندن و دەستگرۆیی و خۆشڕەفتاری و هاوکاری ـ لە سنووری شەرعدا ـ لەگەڵ کافراندا. لەگەڵ بە دوژمن زانین و دژایەتی کردن و بوغزاندنیاندا پێکەوە دژنین و تێك ناگیرێن، چونکە:

أ- **وەك بەڵگەی شەرعی:** خوای دادگەر و میهرەبان هەم فەرمانی پێکردووین کە لەو ڕووەوە بەندایەتی بۆ خوا ناکەن و دان بە خوایەتی (ألوهية) ی خۆی و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەی (محمد ﷺ) دانانێن، بە دوژمنی خۆمانیان بزانین و بیانبوغزێنین و دژایەتیشیان بکەین، وەلەکاتی خۆیدا ـ کە شەرع دیاری کردووە ـ لەگەڵیشیان بجەنگین، وەك فەرموویەتی: ﴿ قاتلوا الذين لايؤمنون بالله ولاباليوم الآخر ولايحرمون ماحرم الله ورسوله ولايدينون دين الحق من الذين أوتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون ﴾ التوبة (٢٩)، وەهەم فەرمانیشی پێکردووین کە لەبواری هەڵس و کەوت و ڕەفتاردا مادام خراپەکاری و دژایەتیمان نەکەن لەگەڵیان دادگەر و چاکەکار و خۆشڕەفتار بین، وەك فەرموویەتی: ﴿ لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا إليهم إن الله يحب المقسطين ﴾ الممتحنة (٨). جامادام خوای کاربەجێ هەرکام لەم دووانەی پێفەرمووین و یەکەمیانی بەپێویست و دووەمیشیانی بەلای کەمەوە بە سوننەت یان موباح بۆ دیاری کردووین، دیارە حەتمەن هەردووکیان ڕاست و بەجێن و هیچ جۆرە ناکۆکییەکیان لەنێواندا نیە، چونکە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ أفلايتدبرون القرآن ولو كان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا ﴾ النساء (٨٢). کەواتە: قورئان و ئیسلام مادام لە خوای زانا و کاربەجێوەیە نابێ و مەحاڵە هیچ جۆرە ناڕێکی و ناکۆکییەك لەنێوان یاسا و حوکمەکانیدا هەبێ.

ب- **وەك بەڵگەی عەقڵیش دەڵێین:** ڕق هەڵسان لە کافران و دوژمنایەتی کردنیان لە ڕووی کوفر و خراپەی لەدوژمنایەتییانەوەیە، چاکە و دادگەری و بەزەیی پێداهاتنەوە و دەستگرۆییشیان بەو ئیعتیبارەیە لەو ڕووەوەیە کە هەرچۆنبێ هەر ئینسانن و بەندەی خوان و بەرنامەی خواش ڕێگای ژیان و مانی پێداون و مادام ئەوانیش خراپە و دژایەتی

ئیسلام و موسڵمانان نەکەن. بێگومان هەروەك چۆن ئەسڵ لەهەموو شتێکدا پاکی و
موباح بوون و حەڵاڵی یە، دیارە ئەسڵیش لەئینساندا رێزلێگرتن و پاراستنی کەسایەتی یەتی:
﴿ولقد كرمنا بني آدم﴾ الإسراء (٧٠)، دیارە ئەمەش بەبێ دادگەری و چاکەکاری و
بەزەیی و هاوکاری و خۆشرەفتاری سەرگەر نابێ، کەواتە بەلای کەمەوە دەبێ هەموو ئەمانە
رەوا (جائز) بن، ئەگەر سوننەت یان فەرزیش نەبن، کەحەتمەن جاری وا هەیە سوننەت و
بگرە فەرزیش دەبن.

بەڵام ئەو رایەی کەهەندێك لەزانایانی ئیسلامیش هەیانە کەدەڵێن: بوغزاندن و
دژایەتی کردنی کافران تایبەتە بەوانەیانەوە کەلەحاڵەتی جەنگ و دژایەتی کردنماندان و،
ئەوانەی دژایەتیمان نەکەن درووستە - جگە لەکوفرو خراپەکانیان - خۆشمان بوێن و
دۆستایەتیشیان بکەین!

بەڵێ.. ئەم رایە بەهەڵە دەزانین و هیچ پێویستیشمان پێ ی نیە بۆ ئەوەی ئەو دوو
حاڵەتەی کەباسمان کردن تێك بگیرێن. چونکە وەك روونمان کردەوە هەر کامێیان
بەئیعتیبارێکی جیا لەوەی تردن. هەرچۆن بێ هەرکەسێك بڕوای بەخواو پێغەمبەرو
بەرنامەکەی نەبێ، یان بڕوای بەیەکێکیان نەبێ بەئیعتیباری بڕواپێنەبوون و کوفرەکەی
هەر دوژمنی خوایەو، خواش (جل جلاله) فەرموویەتی: ﴿يا أيها الذين آمنوا لاتتخذوا
عدوي وعدوكم أولياء﴾ الممتحنة (١).

ئێستاش کەزانیمان دوژمن و دوژمنایەتی چین و چۆنن، بابچینە سۆراغی وەڵامی
پرسیاری دووەم و بزانین داخوا:

## ٢- چەقی دوژمنایەتی کێیەو بەرەی (باطل) کێیە؟

ئەگەر سەرنجێکی دەقەکانی قورئان بدەین زۆر بەروونی دەبینین کەهەروەك چۆن
خوای بێوێنەو پەروەردگار - تبارك وتعالى - چەقی دۆستایەتی (مركز الموالاة) ە،
شەیتانیش لەعنەتی خوای لێبێ و لێشی بووە، چەقی دوژمنایەتی (مركز المعاداة)ە بۆ
ئایین و بەرنامەی خواو پەیڕەوانی. ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

■ ﴿يا أيها الناس إن وعد الله حق فلاتغرنكم الحياة الدنيا ولايغرنكم بالله الغرور.
إن الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدوا إنما يدعوا حزبه ليكونوا من أصحاب
السعير﴾ فاطر (٥-٦). واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان بەڵێنی خوا راستە، جا با ژیانی
دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ و با - شەیتانی - فریودەر فریوتان نەدات سەبارەت بەخوا.
بێگومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە ئێوەش بەدوژمنی دابنێن. بەراستی کۆمەڵەکەی خۆی
بەس بۆیە بانگ دەکات تاکو ببنە خاوەن - وهاوەڵی - ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ.

■ ﴿وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس كان من الجن ففسق عن
أمر ربه أفتتخذونه وذريته أولياء من دوني وهم لكم عدو بئس للظالمين

بدلا ﴾ الكهف (٥٠)، واتە: کاتێکیش بە فریشتانمان گوت کڕنووش ـ ی ڕێزگرتن ـ بۆ ئادەم ببەن ـ هەموو ـ کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس ئەو لە ـ ڕەگەزی ـ جنۆکە بوو، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، جائایا خۆی و وەچەکەی بە دۆست دەگرن لەجیاتی من، لە حاڵێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن؟! ـ ئەوان ـ خراپترین بەدیل ـ ی خوا ـ ن بۆ ستەمکاران.

- ﴿ ..إستحوذ عليهم الشيطان فأنساهم ذكر الله أولئك حزب الشيطان ألا إن حزب الشيطان هم الخاسرون ﴾ المجادلة (١٩). واتە: ـ ئەوانە کە مەبەست لە مونافیقەکانە ـ شەیتان خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە، ئەوانە پێڕەوی شەیتانن، ئاگاداربن! بێگومان هەر پێڕەوی شەیتانن زیانباران.
- ﴿ وقال الشيطان لما قضي الأمر إن الله وعدكم وعد الحق ووعدتكم فأخلفتكم وماكان لي عليكم من سلطان إلا أن دعوتكم فاستجبتم لي فلاتلوموني ولوموا أنفسكم ﴾ إبراهيم (٢٢). واتە: وە ـ ڕۆژی دوایی ـ کاتێک هەموو شتێک تەواو بوو شەیتان ـ بەپێڕەوی خۆی گوت: بێگومان خوا بەڵێنی ڕاستی پێدانو منیش گفتی ناڕاستم دانێ! وەمن هیچ دەسەڵاتێکم بەسەرتاندا نەبوو مەگەر ئەوە کە بانگم کردنو ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن، جا سەرکۆنەی من مەکەنو سەرکۆنەی خۆتان بکەن...

لەم دەقانەوە دەردەکەوێ کە شەیتانی لەعنەتیو ئیبلیسی نەگریسی سەرکردەی بەرەی ناهەقو چەڵی دوژمنایەتی کردنی خواو پێغەمبەرو ئیسلامو موسڵمانانە، وەك پێشینان گوتوویانە (خەتی خوار لەبن سەری گای پیر دایە)!

بەڵام هەروەك چۆن خوای پەروەردگار ـ ولە المثل الأعلى ـ لەرێی پێغەمبەرانەوە (عليهم الصلاة والسلام) پەیامو بەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤایەتی ناردووە. شەیتانیش طاغووتەکانی کردوونە نوێنەری خۆیو لەرێگای ئەوانەوە ڕێچکەو بیردۆزەکانی خۆی ڕەواج پێداوە. هەربۆیەش خوای پەروەردگار فەرمانبەری پێغەمبەری خۆی ﷺ کردۆتە نیشانەی خواپەرستیو بەندایەتی بۆکردنیو موسڵمانەتی ئیمانەکان. وەك فەرموویەتی: ﴿ فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لايجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما﴾ النساء (٦٥).

ـ ڕەبەپێچەوانەشەوە فەرمانبەری کردنی طاغووتی کردۆتە بەڵگەو نیشانەی لارێبوونو شوێنکەوتنی شەیتانو ڕەگەڵ پێڕەوی شەیتان کەوتن وەك دەفەرموێ: ﴿ ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما انزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا ﴾ النساء (٦٠).

کەواتە: خوای پەروەردگار لەبەرەی هەقداو شەیتانی بەدڕەفتار لەبەرەی (باطل) دا لەئاقار بەڵاو. پێغەمبەری پایەبەرزو ڕێنیشاندەر، طاغووتی گەندەڵو بێجەوهەریش

لەبەرانبەر یەکدان. هەربۆیەش خوای زاناو کاربەجێ هەمیشە بەشوێنکەوتووانی ئاینەکەی و کۆمەڵە پاکو سەربەرزەکەی خۆی فەرمووە (حزب الله) و، بەپێچەوانەوە لەگرێ و پەیڕەو تاقمە زۆرو بێخێرو بێبێرەکانی لاڕێ لەراستە شەقامەکەیشی فەرمووە (حزب الشیطان) وەتەنانەت جارێکیش وشەی (حزب الرسول) یان (حزب محمد) لەلایەکو (حزب الطاغوت) لەولاوە لەقورئانی قسەبەجێدا نەهاتوون! چونکە نە (پێغەمبەر ﷺ) لەبەرەی هەق دا و نە (طاغوت) لەبەرەی ناهەقدا هیچ کامیان سەربەخۆیەتییان نیەو هەردووکیان نوێنەرن، ئەویان ئی خوای بەرزو مەزنو، ئەمیشیان ئی شەیتانی بەدو ڕەووژن!

ئێستاش دەتوانین بچینە سەر خاڵی سێیەمی ئەم باسە بزانین:

## ٣. ناوونیشانی عەقیدەیی و چوارچێوەی سیاسی دوژمنایەتی خوا چییە؟

هەرودك چۆن ناوونیشانی عەقیدەیی دۆستانی خواو کۆمەڵەکەی وشەی (بڕواداران ـ المؤمنون) ەو چوارچێوەی سیاسیشیان وشەی (حزب الله) دیاری دەکات، دوژمن و ناحەزانی خواش بناغەی فیکری و عەقیدەیی کۆبوونەوەیان (کوفر)ەو، چوارچێوەو قەوارەی سیاسیشیان لەگەڵ شەیتان بوونە. کەواتە: دوژمن و ناحەزانی خوا لەڕووی فیکرییەوە بەبێبڕوایان (کافرون) دەناسرێن و کیانی سیاسییان لەپشت تابلۆی: کۆمەڵی شەیتان (حزب الشیطان) ەوە خۆی حەشار داوە. ئەمە بەشێوەی گشتی، بەلام ئەگەر بمانەوێ چاکترو بەوردی ئەو دوژمن و ناحەزانە بناسین، دەبێ سەرنجێکی خێرا لەهەموو جۆرو شێوەو دەستەو تاقمەکانیان بدەین، چونکە ئەمانە وەك ئەهلی هەق نین لەیەك جۆرو شێوەدا کۆببنەوە کەئەمە بەس بەرهەمی هەقە. بەڵکو ئەمانە بەژمارەی ئەو فیکرەو بۆچوونە ناهەقانەی شوێنیان کەوتوونو بەئەندازەی ئەو طاغووتانەی خۆیان پێ فرۆشتوونو بەقەدەر ڕووو ڕەنگەکانی (باطل) زۆرو بۆرو جۆراوجۆرن. ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکی کورت لەو بارەوە:

دوژمن و ناحەزانی کۆمەڵی خوا بەشێوەیەکی سەرەکی دوو بەشن:

یەکەم: کافران. دووەم: مونافیقان.

دەشتوانین بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم دابەش کردنە ئەم بەڵگانە بێنینەوە:

أ. هەروەك چۆن بەناوی بڕواداران (مؤمنون) ەوە سوورەتێکی قورئان هەیە، بەناوی هەر کام لەکافرانو مونافیقانیشەوە بەهەمان شێوە کەسوورەتی (کافرون) و (منافقون) ن! بەلام بەناوی دەستەو پێڕەکانی تری کوفرەوە سوورەتی تر نین.

ب. خوای کاربەجێ لەسوورەتی (التوبة) و (التحریم) دا بەپێغەمبەری فەرمووە: ﴿ یاأیها النبي جاهد الكفار والمنافقین واغلظ علیهم ومأواهم جهنم وبئس المصیر ﴾ التوبة (٧٣)، وە التحریم (٩). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەبەشێوەی

سەرەکی دوژمن و ناحەزانی خواو ڕێبازو کۆمەڵەکەی ئەم دوو پێڕەن.
ج. هەرکام لە (أهل الکتاب) و (مشرکون) بەدەقی قورئان هەر لەجوغزی کافران دان.
وەك دەفەرموێ: ﴿ إن الذين كفروا من أهل الكتاب والمشركين في نار جهنم خالدين فيها أولئك هم شر البرية ﴾ البينة (٦).
جائێستا بالەبەر تیشکی چەند ئایەتێکی قورئاندا سەرنجی هەرکام لەم دوو پێڕە بۆخێرە بدەین:

## یەکەم: بێبڕوایان ( الکافرون ):

ئەوانەن کەبەڕاشکاوی و بەئاشکرا بێبڕوایی خۆیان بەرانبەر بەئیسلام دەردەبڕن. جاخوای زانا بێبڕوایانی بەخراپترین گیاندارو جانەوەر لەقەڵەم داوە وەك فەرموویەتی: ﴿ إن شر الدواب عند الله الذين كفروا فهم لايؤمنون ﴾ الأنفال (٥٥).
ئنجا کافرانیش لەنێو خۆیاندا چەند جۆرێکن:

### أ. خاوەن کتێبەکان (أهل الکتاب):

ئەوانەی کەلەئیسلامدا بەخاوەن کتێب ئیعتیبار کراین بەس جوولەکە (یهود) و دیان (نصراني) ن، کەخوای دادگەر لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ قاتلوا الذين لايؤمنون بالله ولاباليوم الأخر ولايحرمون ماحرم الله ورسوله ولايدينون دين الحق من الذين أوتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون ﴾ التوبة (٢٩). هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وقالت اليهود عزيز ابن الله وقالت النصارى المسيح ابن الله ذلك قولهم بأفواههم يضاهئون قول الذين كفروا من قبل قاتلهم الله أنى يؤفكون ﴾ التوبة (٣٠).
وەك دەبینین خوای زانا جوولەکەو دیانەکان بەبێدین و بێبڕواو لارێ و لاساکەرەوەی کافرانی پێش خۆیانیان لەقەڵەم دەدات! چونکە عەقیدەی ئێستەی بەکوڕی خوا لەقەڵەمدان لەئایینە ئەفسانەیی‌یەکانی بتپەرستی هیندو چینەوە سەری هەڵداوەو جوولەکەو دیانەکانیش لێیان وەرگرتووەو تێکەڵ بەئایینەکانی خۆیانیان کردووە.

### ب. هاوبەشپەیداکەران (المشرکون):

کەخوای دادگەر لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ ياأيها الذين آمنوا إنما المشركون نجس ﴾ التوبة (٢٨)، هەروەها دەربارەی ئەوان و کتێب پێدراوەکان فەرموویەتی: ﴿ إن الذين كفروا من أهل الكتاب والمشركين في نار جهنم خالدين فيها أولئك هم شر البرية ﴾ البينة (٦).
دیارە هەموو جۆرە بتپەرست (وثني) ەکانی ئەم ڕۆژگارەو پێشووش لەنێو هاوبەشپەیداکەراندا کۆدەبنەوە.

### ج. ئاگرپەرست و ئەستێرەپەرستەکان (المجوس، الصابئون):

کەخوای بەرزو مەزن لەچەند شوێنێکدا باسی (صابئة) ی کردووە، بەڵام تەنها لەیەك شوێن باسی (مجوس) ی کردووە، وەك دەفەرمویێ: ﴿ إن الذين آمنوا والذين هادوا والصابئين والنصارى والمجوس والذين أشركوا إن الله يفصل بينهم يوم القيامة إن الله على كل شئ شهيد ﴾ الحج (١٧).

شایانی باسە هەندێك لەزانایانیش فەرموویانە (الصابئون) فریشتەپەرستن نەك ئەستێرەو خۆرکەپەرست.

### د. خوانەناسەکان (الملاحدة، الزنادقة):

ئەمانەش ئەوانەن کەهەر ئەسڵەن بڕوایان بەهیچ شتێك نیەو خواش ناناسن و بێدینن کەفیرعەون و نەمروود لەم جۆرە بوو ون. خوای بێوێنە لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ أفرأيت من اتخذ إلهه هواه وأضله الله على علم وختم على سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله أفلا تذكرون. وقالوا ماهي إلا حياتنا الدنيا نموت ونحيا ومايهلكنا إلا الدهر ومالهم بذلك من علم إن هم إلا يظنون ﴾ الجاثية (٢٣ـ٢٤).

### هـ. هەڵگەڕاوەکان (المرتدون):

ئەمانەش کەسانێکن کەسەردەمێك موسڵمان بوو ون، یان خۆیان وابیشان داوە کەموسڵمانن بەڵام دوایی پاشگەز بوونەوەو بەهۆی وتەو دەربڕینێك یان کردەوەو ڕەفتارێکی کافرانەوە لەئاییین دەرچوون. خوای دادگەر لەبارەی ئەم جۆرەی کافران فەرموویەتی: ﴿ إن الذين ارتدوا على أدبارهم من بعد ماتبين لهم الهدى الشيطان سول لهم وأملى لهم ذلك بأنهم قالوا للذين كرهوا مانزل الله سنطيعكم في بعض الأمر والله يعلم إسرارهم فكيف إذا توفتهم الملائكة يضربون وجوههم وأدبارهم ذلك بأنهم اتبعوا ماأسخط الله وكرهوا رضوانه فأحبط أعمالهم ﴾ محمد (٢٥ـ٢٩).

بەڵێ ئەم پێنج پێرە کۆمەڵی بێبڕوایان (کافران) پێکدێنن بەدرێژایی مێژوو و ئێستاشی لەگەڵ بێ. لەڕاستیشدا ئەگەر سەرنج بدەین ناگونجێ لەم پێنج جۆرە کافرانە زیاتر هەبێ چونکە: ئینسان کەلەڕێبازی خوا لایدا یان هەر خواش ناناسێ و بڕوای بەهیچ شتێك نابێ، کەئەوە حاڵەتی بێدینی و زەندیقیەو لەڕۆژگاری ئێستادا (ئیلحادو ماددەگەری) پێدەڵێن، یان خوا دەناسێ بەڵام هاوبەشی بۆ بڕیار دەدات، جاچ لەپەرستراویتی (الوهية) یدا کەئەم بەشەیان زیاترە، وەچ لەپەروەردگاریتی (ربوبية)ەیدا، وەچ لەناوو سیفەتەکانیدا. ئینجا ئەم هاوبەشپەیداکەرانەش یان شتێکی زەمینی لەگەڵ خوا دەپەرستن یان بەهەرحاڵ دەیکەنە هاوبەشی خوا، وەك بت و صەنەم و

ئاگر و ئینسان و... هتد، یان شتێکی ئاسمانی دەکەنە هاوبەشی خوا جا فریشتەبن یان ئەستێرە یان خرۆکە، کەئەمەش هەم هەموو جۆرە هاوبەش پەیداکەرەکان و هەم مەجووس و هەم صابیئەکان دەگرێتەوە، وەهەم جوولەکەو دیانەکانیش چونکە ئەوانیش بەدەقی قورئان عوزەیرو مەسیح بەکوڕی خوا و هاوبەش لەخوایەتی دەزانن.

دیسان لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانین بڵێین: کافرەکان یان هەر بڕوایان بەئاینی خوا نیە، وەك زەندیق و مەجووسی و هاوبەش پەیداکەرو صابیئەکان. یان بڕوایان بەئاینێك هەیە کەبۆکات و قۆناغێکی تری مرۆڤایەتی هاتووەو بۆ ئێستا ناشێ - بەگشتی - سەربارەش دەستکاریش کراوەو گۆڕاوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يحرفون الكلم من بعد مواضعه ﴾ المائدة (٤١) کەئەمانەش جوولەکەو دیانەکانن. یان ئاینێکی ڕاست (صحیح) یان هەبووە کەئیسلامە بەڵام لێی پاشگەز بوونەتەوە کەئەمانەش هەڵگەڕاوە (مرتد) ەکانن.

ئینجا باسەرنجێکی بەشی دووەمی دوژمن و ناحەزانی خواو کۆمەڵەکەی بدەین کەدەغەڵ و دووڕووەکانن:

## دووەم: مونافیقان:

مونافیقەکان پیسترین جۆری دوژمن و ناحەزانی خوان. بەم بەڵگانەی خوارەوەش ئەم دەعوایە ئیسپات دەکەین:

یەك:

خوای زاناو پەنهانبین دەفەرموێت: ﴿ إن المنافقين في الدرك الأسفل من النار ولن تجد لهم نصيرا ﴾ النساء (١٤٥). واتە: بێگومان مونافیقەکان لەپلەی بنەوەی ئاگر - ی دۆزەخ - دان و هیچ یارمەتیدەریشیان بۆ شك نابەی. دیارە هەروەك چۆن بەهەشت خاوەنی پلان (ذات درجات) ە دۆزەخیش خاوەنی پلەی بەرەو خوار (ذات درکات) ە. جا مونافیقەکان چونکە پیسترین جۆرە کافرو بەزەبرترین دوژمن و ناحەزی خواو ئایین و کۆمەڵەکەیین دیارە شایستەی نزمترین پلەی دۆزەخیشن!

دوو:

لەهەموو قورئانی دوو جاران وشەی (حزب الشیطان) هاتووە ئەویش هەردووك جاران دەربارەی مونافیقەکانە، کەخوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ ألم تر إلى الذين تولوا قوما غضب الله عليهم ما هم منكم ولا منهم ويحلفون على الكذب وهم يعلمون. استحوذ عليهم الشيطان فأنساهم ذكر الله أولئك حزب الشيطان ألا إن حزب الشيطان هم الخاسرون ﴾ المجادلة (١٤.١٩).

ئەمەش ئەگەر شتێك بگەیەنێ ئەوەیە کەئەو دەغەڵ و گەندەڵ و دووڕوو و چەپەڵانە

لەهەمور جۆرە کافرەکانی‌تر پتر خەسڵەت و پێکهێنەرەکانی پێری شەیتانیان تێدا هاتۆتەدی و، پێری تەواو عەیاری ئیبلیسن. خوا بیانبڕێ چەندە پیس و نەگریسن!!

سێ:

خوای کاربەجێ هەرکاتێك باسی کافرانی کردبێ لەقورئانی‌دا بەچەند ئایەتێکی کورت پێناسەی کردوون و کۆتایی بەباس و خواسیان هێناوە، بەڵام کەهاتۆتە سەر باسی ئەو دەغەڵ و خائینانە زۆر بەدرێژی باسی‌کردوون و تەواو تەواو تێشکی خستۆتە سەر هەموو هەڵس و کەوت و ئاکارو بگرە قسەو تەعبیری ناو مەجلیسیشیان و تەنانەت زۆر جار لەدەر قیافەو رەنگ و دیمەن و سەروسیماشیان، بەڵکو هەندێك جار لەمەش بەولاوەتر چووە و هەست و نەستی نێردڵ و نیازو مەبەستی گڵاوی نێو دەروونی لەکوفرو خیانەتدا کولاوو هەڵقولاویشیان دەخاتەروو!! دیارە ئەمەش دەلالەت لەسەر بەکجار پیسی و زیانبەخشی‌یان و مەترسی‌یان دەکات بۆ ئیسلام و ئەهلی ئیسلام.

بەڵێ...کافران بێ‌پەردەو بەراشکاوی و بێ‌دەمامك و چاوپێچك دێنە پێش و هەر لەدوورەوە دەیانناسی، بەڵام ئەو ساختەچی و فێڵبازانە لەبەر بێ‌غیرەتی و ناجوامێری و ئەوبڕی‌یان خۆیان لەپشت پەردەی ئیسلام و موسڵمانەتی حەشار داوە و دێوجامەی[1] کەڵەکچێتی‌یان لەبەرکردووە و کڵاوی فێڵبازی‌یان لەسەر ناوە، بەدرووستی شتی رواڵەتی و بۆشیان کەبەناوی موسڵمانەتی ئەنجامی دەدەن، دەمامکی خۆیانیان کردووە و لەسەنگەری خیانەتی طابووری پێنجەم‌دا خۆیان لەبۆسە ناوە، وەك سپیە ماری سەرو سەگی نهێن‌گر و چەقەڵی چەم بۆ هەل و دەرفەتێکی ترسنۆکانەی پەلامار خۆیان مەڵاس داوە! بۆیە خوای کاربەجێ و میهرەبان لەقورئانی بەعیزو پیرۆز خاوەن حورمەت و رێزی خۆی‌دا هێندە گرنگی و بایەخی بەناساندن و پەردەو لێف لەسەر هەڵدانەوە و دەمامك لەسەر رووڵادانیان داوە. ئەمەش تاکو موسڵمانانی دڵساف و بێ‌غەرەزو پاك و چاك بەقسەو چاوو زارو دیمەن و رواڵەتی بێ‌جەوهەرو دیکۆری بۆش و بێ‌مەناریان فریو نەخۆن و لەخشتە نەچن و. بەتەپکەو تەڵەو داویانەوە نەبن.

بڕوانە: لەسوورەتی (البقرة) دا لە (٢٠) ئایەتی سەرەتای‌دا خوای زانا باسی هەرکام لەبڕواداران و بێ‌بڕوایان و مونافیقانی کردووە. لەو (٢٠) ئایەتە (٥) یان بۆ پێناسەی بڕواداران و (٢) یان بۆ کافران تەرخان‌کراون. بەڵام (١٣) ئایەت بۆ پێناسەو پەردە لەسەر هەڵماڵینی ئەو دەغەڵ و سیندپیس و دڵنەخۆشانە تەرخان‌کراون. هەروەها سوورەتی (المنافقون) لە (١١) ئایەتی درێژ کە (٢١) دێریان گرتووە پێك‌هاتووە . بەڵام سوورەتی (الکافرون) لەشەش ئایەتی کورت کە (٣) دێریان گرتووە!!

---

(١) دێوجامە جۆرە بەرگێکی تایبەتی‌یە وێنەی باڵندەو گیاندارانی تێدایەو یاوچی بۆ راوی لەبەری دەکەن.

وەمەگەر چۆن دەنا هیچ سوورەتێکی مەدەنی نیە کەخوا باسی مونافیقەکانی تێدانەکردبێ، بۆ وێنە: (البقرة، آل‌عمران، النساء، المائدة، الأنفال، التوبة، النور، الأحزاب، محمد، الفتح، الحدید، المجادلة، الحشر، المنافقون).

چوار:

هەرکاتێك لەقورئانی‌دا باسی بەرکێك لەجەنگەکانی ئیسلام کرابێ لەرۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دا حەتمەن باسی ئەو خائین و ناپاکانەش هەر کراوە. چونکە وەك پێشینان گوتوویانە (لەبواری لاقی رەش و سپی دەردەکەون) یان وەك عارەب گوتوویانە (الشدائد صقیل الرجال). واتە: تەنگانەکان دەرخەری جەوهەری پیاوانن. بەڵێ چونکە لەکاتی جەنگ و جیهاددا مەسەلەی بەخشینی ماڵ و سامان و فیداکاری و سەرماو گەرماو برسێتی و تینوێتی و ماڵ و حاڵ بەجێهێشتن و...هتد دێتە پێش دیارە ئەو مەیدان و بوارە چاکترین مەحەك و تەرازووی دەرخستن و هەڵسەنگاندنی ئەو نامەردانەیە! شاعیریش بەخۆزایی نەیگوتووە:

سوف تری إذا انجلی الغبار
أفرس تحتك أم حمار!

لێرەش کۆتایی بەم خاڵە دێنین و دەچینە سەر خاڵی چوارەم تاکو بزانین داخوا:

## ٤. لەواقیعی ئەمرۆماندا دوژمن و ناحەزانمان کێن؟!

دیارە لەسۆنگەی ئەوەوە کەلەخاڵی پێشوودا لەبەر تیشکی قورئاندا سەرنجی دوژمن و ناحەزانمان‌داو چاك لێیان وردبووینەوە. لێرەدا زۆر پێویستیمان بەشیکردنەوە ناکات. چونکە قورئان فەرمایشتی ئەزەلی و ئەبەدی‌ی خوایەو خوای زاناو پەنهانبین هەموو چاخ و سەردەم و رۆژگارەکانی تێدا رەچاوکردوون. مادام بەپانایی زەمین و درێژایی زەمان بۆ هەموو مرۆڤایەتی ناردووە، وەلەراستی‌دا دوژمن و ناحەزانی خواو ئیسلام و موسڵمانان لەماهیەت و جەوهەردا لەهەموو چاخ و قۆناغەکانی مێژوودا هەریەکن و ئەوەی گۆڕانی بەسەردا دێ تەنها دیکۆرو رواڵەتیان و ئەو تابلۆو دروشمانەیانن کەخۆیانیان پێ‌دەناسێنن، بۆیە هەر بەکورتی دەڵێین:

لەواقیع و رۆژگاری ئەمرۆمان‌دا دوژمن و ناحەزانی خواو خۆمان هەموو ئەوانەن کەدژی: ١. خوا (سبحانە وتعالی)، ٢. پێغەمبەر ﷺ، ٣. ئیسلام، ٤. موسڵمانان. بن یان دژی هەرکامێکیان. واتە هەرکام لەم چوارانە. کەواتە:

أ. مونافیقەکان.

ب- جوولەکەکان.

ج- دیانەکان.

د- هاوبەش پەیداکەرەکان، کەهەموو جۆرەکانی بتپەرستەکانن وەك هیندۆکی و بوو‌ذی و کۆنفشیۆسی و... هتد.

هـ- زەندیق و بێدین و خوانەناس و ماددە پەرستەکان.

و- مەجووسییەکان.

ز- صائیبەکان.

ح- هەڵگەڕاوەکان. کەلەوڵاتی ئێمەو سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیشدا، هەرکام لە کۆمۆنیستەکان و مارکسیەکان و سۆشیالیستەکان و ناسیۆنالیستەکان و دیمۆکراسییەکان. کەبەزاراوەی ئەمڕۆ سەرجەم (لائیك) یان (سیکۆلاریست) یان (عەلمانی)[1] یان پێدەگوترێ ، کەم و زۆر دەچنە خانەی هەڵگەڕاوەکان (المرتدون) چونکە خاڵی هاوبەش (القاسم المشترك) ی هەموو ئەو پێڕو تاقمانە بریتییە لەڕازینەبوونیان بەوە کەئیسلام بەرنامەی هەمەلایەنی ژیانی تاك و کۆمەڵ بێ، جابێگومان ئەمەش ڕاستەوخۆ ڕەتکردنی فەرمانڕەوایەتی خوا (حاکمیة الله) یە، بەهۆی ڕەتکردنەوەی سەروەری و باڵادەستی ئایین و بەرنامەکەی!

بۆیەش دەڵێین (کەم و زۆر) و نەمانگوتوە (ئێکرایان). چونکە زۆر لەوانە هەرچەندە هەڵوێستەکەشیان (کوفر)ە. بەڵام لەبەر عوزرێکی وەك نەفامی و بێئاگایی. یان ناچاری و ترس...هتد ناتوانرێ حوکمی کوفریان بەسەردا بدرێ. چونکە ئاشکرایە کە بۆچەسپاندنی حوکمی کوفر بەسەر یەکێکدا دەبێ هەم پێویستکەرەکان (موجبات) ی هەبن و هەم پەرچەکان (موانع) یشی لاچووبن، بۆیە زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعی لەو بارەوە فەرموویانە: (قد یکون قول الرجل أو فعله کفرا ولیس الکافر لعدم وجود شروطه، أو لعدم إنتفاء موانعه) واتە: (جاری وا هەیە قسەی ئینسان یان کردەوەی کوفرە، بەڵام بەکافر دانانرێ لەبەر نەهاتنەدی مەرجەکانی یان لانەچوونی پەرچەکانی)[2].

ئێستاش بابچینە سۆراغی وەڵامی پرسیاری پێنجەم و کۆتایی و بزانین داخوا:

(١) ئەم وشەیە کەزۆر کەس بە (عیلمانی) گۆزی دەکەن، مەعنای (لائیك) و (سیکۆلاریست) ە، واتە: دنیایی و بێدینی.

(٢) بڕوانە: (الإیمان) ی د. محمد نعیم یاسین. ل١٦٩-١٧٠؛ (صحیح مسلم بشرح النووي) ب١٧، ل٧٢؛ (شرح العقیدة الطحاویة) ل٣٥٧-٣٥٨؛ (الزواجر عن إقتراف الکبائر) ی إبن حجر الهیتمي. ب١، ل٢٨، وسەرنجی بەشی سێیەم (بیروباوەڕ) ی ئەم کتێبە بدە.

## ٥. هەڵوێستمان لەئاستیاندا دەبێ چۆن بێ؟!

لەوەڵامی ئەم پرسیارەشدا هەر بەکورتی و پوختی دەڵێین:

هەڵوێست و هەڵس و کەوتمان لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی خوا و خۆماندا دوو هۆکار (عامل) ی سەرەکی دیاری دەکەن و، لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێک و لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر دەیگۆڕن. یەکەمیان: ئەو قۆناغەی کەخۆمان و کار و خەباتی ئیسلامیەمانی تێدایە، کەتارادەیەکی باش لەبەشی حەوتەم (شێوازەکانی کاری ئیسلامی) دا تیشکمان خستۆتە سەری و ڕوونمان کردۆتەوە کەلەهەر قۆناغێکدا شێوازی کاری ئیسلامی و شێوەی هەڵوێست و ڕەفتاری لەگەڵ دەوروبەردا دەبێ چۆن بێ.

دووەم لەو دوو هۆکارە: بریتییە لەجۆر و شێوەی هەڵوێست و ڕەفتاری دوژمن و ناحەزانمان لەگەڵ ئێمەدا، چونکە هەرچەندە دوژمن و ناحەزیش بن و وەك بیروباوەڕ و مەبدەئیان بەئەهلی کوفریان بزانین و، لەڕووی بەرنامەو فیکر و عەقیدەمانەوە بەیەك چاو سەیریان بکەین، بەڵام لەڕووی هەڵوێست و هەڵس و کەوتمانەوە لەگەڵیاندا، دیارە جیاوازییان لەنێودا هەیەو جۆراوجۆرن و، ئەوانەیان کەلەگەڵمان تەبار لەبارن و دژایەتی و خراپەمان ناکەن، دیارە کێشانەو پێوانەیەکی تریان لەگەڵ دەکرێ، خوای کاربەجێش لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ لاینهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا إليهم إن الله يحب المقسطين، إنما ينهاكم الله عن الذين قاتلوكم في الدين واخرجوكم من دياركم وظاهروا على إخراجكم ان تولوهم ومن يتولهم فاولئك هم الظالمون ﴾ الممتحنة (٨-٩).

هەروەها دەربارەی جیاوازیی نێوان جوولەکەو دیانەکان . یان هەندێك لەدیانەکان لەسەر ڕای زۆر لەتوێژەرەوانی قورئان کەدەڵێن ئەم ئایەتانە تایبەتن بەوانەو گشتی نین بۆ هەموو دیانەکان وە واپێدەچێ ئەم ڕایەش بەهێزتر بێ و واقیعیش پشتگیریی دەکات . بەهۆی جیاوازیی هەڵوێستیانەوە لەئاقار ئیسلامدا فەرموویەتی: ﴿ لتجدن أشد الناس عداوة للذين آمنوا اليهود والذين أشركوا ولتجدنهم أقربهم مودة للذين آمنوا الذين قالوا إنا نصارى ذلك بان منهم قسيسين ورهبانا وانهم لايستكبرون وإذا سمعوا ماأنزل إلى الرسول ترى أعينهم تفيض من الدمع ﴾ المائدة (٨٢-٨٥).

کۆتایی ئەم باسەش بەم تێبینییە دێنین:

کەلەم خاڵی پێنجەمەدا گوتمان: (هەڵوێست و هەڵس و کەوتمان لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی خوا و خۆماندا دوو هۆکاری سەرەکی دیاری دەکەن و لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێک و لەجۆرێکەوە بۆجۆرێکی تر دەیگۆڕن) مەبەستمان پێ: هەڵوێستی کردەیی (عملي) یە، نەك هەڵوێستی مەبدەئی و عەقیدەیی و فیکری، کەوەك زۆرجار ئاشکرامان کردۆتەوە، ئەمە گۆڕانی بەسەردا نایەت و ئەهلی کوفر و نیفاق هەتا دەست لەکوفر و نیفاقی خۆیان هەڵنەگرن، هەرچۆنێ بن لەڕووی عەقیدەیی و مەبدەئییەوە هەر بەدوژمن و ناحەزی خوا و خۆمانیان دەزانین.

٣٠/ڕەمەزان/١٤١٦، ١٩/شوبات/١٩٩٦. مەریوان

# ڕێخۆشکردن

مەبەستمان لەئامانجی کاری ئیسلامی ئەو ئەرک و کارو چالاکیانەیە کەکۆمەڵی موسڵمان لەژیانی دنیایدا وەک ئەرک (وظیفة) ی سەرشانی پێی هەڵدەستێ و جێبەجێی دەکات، جادەتوانین بڵێین هەرکام لە:

١. بەندایەتی بۆخواکردن (العبودیة لله تعالی).
٢. جێنشینایەتی کردنی خوا لەسەر زەوی (خلافة الله علی الأرض).
٣. هەڵگرتنی سپاردەی خوا (حمل أمانة الله).
٤. دەرچوون لەتاقی کردنەوەی ژیانی دنیا.
٥. ئاوەدانکردنەوەی زەمین (عمارة الأرض).
٦. چەسپاندنی دادگەری (تحقیق العدالة) لەنێو مرۆڤایەتیدا لەسەر زەوی.
٧. بەرپاکردنی بەرنامەی خوا (إقامة دین الله).

چەند ئەرک و کارێکن - کەلەڕاستیدا هەموویشیان هەر دەبنە یەک شت، و هەموویان چەند ڕوێکی یەک حەقیقەتن - کەخوای کاربەجێ و دادگەر بەمرۆڤایەتی سپاردوون. بەڵام ئاشکرایە کەتەنها کۆمەڵی موسڵمان توانای شایستەیی ئەنجامدان و جێبەجێ کردنیانی هەیە.

کەواتە باهەرکام لەم حەوت خاڵە بەکورتی بتوێژینەوە. تاکو ئەرک و ئامانجی کۆمەڵی موسڵمانانمان لەسەر زەمین بۆ ڕوون بێتەوە:

## ١- بەندایەتی بۆخوا کردن (العبودیة لله):

دیارە خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو ناو و سیفەتێکی بەرز و پەسندە و یەکێک لەناوە جوان و چاکەکانی و لەسیفەتە بەرزە پەسندەکانیشی بریتییە لەکاربەجێ بی (حکیم)، بەپێی ئەم سیفەتە بەرزەش نابێ هیچ کام لەدروستکراوانی خوا - هەروەک قسەو کردەوەکانیشی - لەحیکمەت و ئامانج خاڵی بێ. ئینسانیش کەهەڵبژاردەی دروستکراوەکانی و شاگوڵی باغی کائینات بەهەمان شێوە چاکتریش. جائەو ئامانج و حیکمەتەی کەخوای کاربەجێ، زاتا ئینسانی بۆ دروست کردووە کەبۆخۆی لەخۆیدا و بۆخۆی بیهێنێتەوە بریتییە لەبەندایەتی (العبودیة) وەک لەچەندان دەقی قورئان و سوننەتدا باس کراوە، بۆ وێنە:

- ﴿ وماخلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾ الذاريات (٥٦).

- ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لاإله إلا أنا فاعبدون ﴾ الأنبياء (٢٥).
- ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾ النحل (٣٦).
- لەسوورەتی (الأعراف) یشدا کەبەسەرهاتی کۆمەڵێك لەپێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دەگێڕێتەوە کە (نوح) و (هود) و (صالح) و (شعیب) ن. هەموویان وەك (کۆرس) یەك ئەم ڕستەیە دووبارە دەکەنەوە: ﴿ یاقوم اعبدوا الله مالکم من إله غیره ﴾!!
- هەروەها لەسوورەتی (الشعراء) یش بەهەمان شێوە هەرکام لە (نوح) و (هود) و (صالح) و (لوط) و (شعیب) چاکترین صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ وەك کۆرسێك ڕستەی : ﴿ إني لكم رسول أمين، فاتقوا الله وأطيعون ﴾ دووبارە دەکەنەوە.

ئنجا شتێکی ئاشکرایە کەبەندایەتیی (العبودیة) و پەرستن (العبادة) یش دەروونی و دەر (باطن وظاهر) ی ئینسان و هەموو لایەنەکانی ژیان و گوزەرانی دادەگرێ و هیچ کەلێن و بۆشاییەك لەگوزەرانی ژیانی و هیچ وردەورشتێك لەجموجۆڵ و چالاکی و هەڵس و کەوتەکانی ناهێڵێتەوە کەسەری پێنەدات و بەنزری خۆی مۆری نەکات، بۆ ئەوەی هەچ کەس هیچ بەربیانوویەکی نەبێ کەخۆی گیرۆدەی داوی هاوبەشپەیداکردن (الشرك) بکات و سەری خۆی بەزەلکاوی بتپەرستی بکات.

دەشتوانین بۆ کورت کردنەوەی مەبەست بڵێین:

بەندایەتی بۆخواکردن و پەرستنی هەردووك بازنەی دووروشمەکان (شعائر) و بەرنامەکان (شرائع) دەگرێتەوە، دەبێ ئینسان ئەگەر بەوێ ببێتە بەندەو پەرستارێکی راستەقینەی خوا هەم دروشمەکان ـ وەك نوێژ و رۆژوو و حەج و زیکر و دوعا و نەزر و قوربانی و...هتد و هەم بەرنامەو یاساو دەستوورەکانی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی ـ وەك سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و جەنگ و ئاشتی و...هتد ـ بەس لەخوای پەروەردگارەوە وەربگرێ و تەنها بۆویش ئەنجامیان بدات.

شایانی باسیشە دروشمەکان (شعائر) زیاتر بەلایەنی شەخسی و مەعنەوی ئینسانەوە پەیوەستن و یاساو دەستوورەکان (شرائع) یش زیاتر پەیوەندەی بەلایەنی کۆمەڵایەتی و ماددەی ئینسانەوە هەیە، پێکەوەو بەهەردووکیشیانەوە نەبێ ئەو بەندایەتی و خواپەرستییە نایەتەدی کە (خوا) فەرمانی بەبەندەکانی کردووە بۆی ئەنجام بدەن. هەربۆیەش لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ إتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله ﴾ التوبة (٣١) (عدي بن حاتم الطائي) هاتە خزمەتی و خاچێکی زیوینی لەملدابوو گوتی: ﴿ إنهم لم يعبدوهم ﴾ ئەوان ـ واتە جوولەکەو دیانەکان ـ حیبرو راهیبەکانیان نەدەپەرست! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ بلى إنهم حرموا

عليهم الحلال وأحلوا لهم الحرام فاتبعوهم فذلك عبادتهم إياهم ﴾ واتە: با! ئەوان . واتە پێشەوا ئاینییەكانی جولەكەو دیانەكان . حەڵاڵیان لێحەرام دەكردنو حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەكردنو ئەوانیش شوێنیان دەكەوتن. جائەوە پەرستنی ئەوان . واتە خەڵكەكە . بوو بۆیان. رواه أحمد والترمذي[1].

واباشە كۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودە مەزنەی پێغەمبەر ﷺ بێنین كە موعاذی كوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ لێی دەگێڕێتەوە: ﴿ كنت ردف النبي ﷺ على حمار فقال: يامعاذ هل تدري ماحق الله على عباده وماحق العباد على الله؟ قلت: الله ورسوله أعلم قال: فإن حق الله على العباد أن يعبدوه ولايشركوا به شيئا، وحق العباد على الله أن لايعذب من لايشرك به شيئا. فقلت: يارسول الله أفلا أبشر الناس؟ قال: لاتبشرهم فيتكلوا ﴾ متفق عليه. واتە: لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ سواری گوێدرێژێك بووبووم فەرمووی: ئەی موعاذ! دەزانی هەقو مافی خوا لەسەر بەندەكانیو هەقو مافی بەندەكان لەسەر خوا چییە؟ گوتم: خواو پێغەمبەرەكەی زاناترن. فەرمووی: بێگومان هەقی خوا بەسەر بەندەكانەوە ئەوەیە كەبیپەرستنو هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا نەكەن. وەهەقی بەندەكان لەسەر خوا ئەوەیە كەهەركەسێك هیچ هاوبەشی بۆ پەیدانەكات سزای نەدات. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا مژدە بەخەڵكی نەدەم؟ فەرمووی: مژدەیان مەدەیە. چونكە پشتیەندی لێدەكەنەوە . وبەس پشت بەلایەنی فیكریو عەقیدەیی خوابەیەكگرتن (توحید) ەكەیان دەبەستنو لایەنە كردەییەكەی لێفەرامۆش دەكەن ..

## ٢- جێنشینایەتیكردنی خوا لەسەر زەوی (خلافة الله على الأرض):

ئەمیش یەكێ ترە لەو ئەركە گرنگانەی كەخوای كاربەجێ بەتێكڕای ئینسانەكانی سپاردووە بەڵام بێگومان جگە لەمسوڵمان هیچ كەس شایستەی جێبەجێكردنی نیە. ئەمەش چەند دەقێك لەم بارەوە:

- ﴿ وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة ﴾ البقرة (٣٠).
- ﴿ هو الذي جعلكم خلائف في الأرض ﴾ فاطر (٣٩).
- ﴿ ثم جعلناكم خلائف في الأرض من بعدهم لننظر كيف تعملون ﴾ يونس (١٤).
- ﴿ إن الدنيا حلوة خضرة وان الله تعالى مستخلفكم فيها فينظر كيف

(١) بڕوانە: تەفسیری ئیبنو كەثیر، ب٢، ل٣٤٩، صفوة البيان لمعاني القرآن، ل١٩١-١٩٢.

تعملون﴾ رواه مسلم.

دیارە مەبەستیش لەجێنشینایەتی کردنی کەسێك ئەوەیە کەبەگوێرەی ئەمرو نەهی و ئەرجیهاتی وی بەرێوەبچێ. کەواتە: بەندایەتی بۆ خواکردنو جێنشینایەتی خواکردن لەسەر زەوی هەردووکیان یەکن، چونکە هیچ کامێکیان بەبێ پەیڕەوی کردن لەئایینو بەرنامەی خوا لەبوارەکانی تاکیو کۆمەڵیو مەعنەویو ماددیو شەخسیو سیاسیو... هتد دا نایەتەدی. هەربۆیەش خوای کاربەجێ لەنێو هەموو بوونەوەرو کائیناتدا پەیامو بەرنامەی تایبەتیی لەڕێگای پێغەمبەرانی پایەبەرزییەوە بەس بۆ ئینسانەکان ناردووە، چونکە ئەو ئەرکو کارە تایبەتیو گرنگەی کەبەئینسان سپێرراوە لەسەر زەوی پێویستیی بەبەرنامەو پەیامو ئەرجیهاتی تایبەتیش دەکات. خوای کاربەجێش دەربارەی حیکمەتی ناردنی پێغەمبەران فەرموویەتی: ﴿رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل﴾ النساء، (١٦٥).

## ٣- هەڵگرتنی سپاردەی خوا (حمل أمانة الله):

ئەمەیش یەکێ دیکەیە لەو ئەرکانەی کەخوای بەرزو مەزن بەئینسانەکانی سپاردووە لەسەر زەوی. یان ڕاستتر بڵێین: ڕوێنکی ترو دیوێکی ترە لەو ئەرکو ئامانجانەی کەئینسان بۆ هێنانەدیی خوڵقێنراوە. بەڵام بێگومان جگە لەمسوڵمانان کەسی دیکە شایستەیی جێبەجێ کردنی نیە. خوای زانا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿إنا عرضنا الأمانة على السموات والأرض والجبال فأبين أن يحملنها وأشفقن منها وحملها الإنسان إنه كان ظلوما جهولا. ليعذب الله المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات، ويتوب الله على المؤمنين والمؤمنات وكان الله غفورا رحيما﴾ الأحزاب (٧٣.٧٢). واتە: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکانو زەویو شاخەکان. بەڵام ئامادە نەبوون هەڵی بگرنو لێی ترسان! وئینسان هەڵی گرت بێگومان ئەویش ستەمکارو نەفامە. بۆ ئەوەی خوا مونافیقانی پیاوو ئافرەتو هاوبەشپەیداکەرانی پیاوو ئافرەت جەزرەبە بدات، وەبۆئەوەی خوا تۆبە لەبڕواداران پیاوو ئافرەت قبووڵ بکات. وەخوا لێبووردەو میهرەبانە.

زانایو توێژەرەوانی قورئان دەربارەی تەفسیری وشەی (أمانة) کەلەئایەتی (٧٢) ی سوورەتی (الأحزاب) دا هاتووە قسەی زۆریان کردووە. بەڵام هەموو قسەو بیرو ڕایەکانی ئەوان (ڕا) یاندا کۆ دەبنەوە:

### ڕای یەکەم:

مەبەست لە (أمانة) ئەو ئایینو بەرنامەیەیە کەخوای کاربەجێ بۆ ئینسانی ناردووە

تاکو لەسەر زەمین پیادەی بکات. جاهەندێك لەتوێژەرەوان بەرشەی (تکالیف) تەعبیر لەو بەرنامەیە دەدەنەوەو هەندێکیشیان بە (فروض) و هەندێکیان بە (طاعة) و هەندێکیان بە (صلاة وصوم...الخ)...

**رای دووەم:**

مەبەست لە (امانة) ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندییانە (خصائص) ن کەئیمتیازی ئینسانن بەسەر باڵی کائیناتی تێر بوونەوەردا یان لانی کەم بەسەر زۆربەیاندا، وەك (عەقڵ) یان (ویستی ئازاد)...

بەڵام بەرای بەندە رای یەکەمو دووەم سەرەنجام یەك دەگرنەوە. چونکە ئەوەی کەئاسمانەکانو زەویو شاخەکان نەیانتوانیوە هەڵی بگرن کە (بەرنامە)ی خوایە، هۆی بەرچەکەی ئەوەیە کەئاسمانەکانو زەویو شاخەکان ئەو تایبەتمەندییانەیان تێدانییە کەوایان لێ بکەن شایستەیی ئەو کارەیان هەبێ. وەلەڕاستیدا وشەی ﴿ فأبين ﴾ش هەر شێوەیەکە لەتەعبیر لێدانەوەی ئەو ڕاستییە ئەگەرنا هیچ درووستکراوێکی خوا لادەر جێی لەئاست فەرمانەکانیدا نیە! دیسان ئینسانیش بۆیە ئەو ئیمتیازو تایبەتمەندییانەی پێدراون کەشایستەیی هەڵگرتنی ئەو کۆڵەو جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە گرنگەو مەزنەی هەبێت، کەواتە:

دەگونجێ بڵێین: ئەو ئەمانەتە کەسەرلەبەری بوونەوەر بەئاسمانە زەبەلاحەکانیو زەمینی پڕ وردەکاریو شاخو چیای سەختییەوە لەبەرانبەریدا بەچۆك داهاتو ترسیو لەرزیو نەیتوانی هەڵی بگرێ . چونکە خوا بۆئەوەی درووست نەکردوون . هەر بریتییە لەهەمان ئەو حەقیقەتەی کەلەخاڵی دووەمدا باسمان کرد، واتە بەندایەتی کردنی خواو جێنشینایەتی کردنیو بەڕێوەبردنی ئاینو بەرنامەکەی! وەئینسانیش بەهۆی ئەو سیفەتو ئیمتیازو تایبەتمەندییانەیەوەیە کەشایستەیی بەڕێوەبردنی ئەرکێکی هێندە گرنگو مەزنی هەیە، مادام وابێ دیارە ئەو ئیمتیازو تایبەتمەندییانەش کەئەو پلەوپایە کەسایەتییە بەرزو واڵایانەیان بۆ ئینسان مەیسەرکردووە، دیسان سپاردەو ئەمانەتێکی قورسو گەورەنو، بەڵەجێی خۆیاندا بەکارنەهێنانیاندو سرپاس لەسەر نەکرانیان ئینسان مۆری ستەمو نەفامی (الظلم والجهل) ی بەنێوچاوانەوە دەنێ کەدیارە (ستەم) تەعبیر لەتێکچوونی هێزی کردەیی (القوة العملية) ی ئینسان دەداتەوەو، نەفامی) ش لەتێکچوونی هێزی فیکری (القوة الفكرية) ی، بەڵێ ژیانی ئینسانو دنیا بە (ظلم وجهل) تێك دەچێو، بەزانیاریو داد (العلم والعدل) یش ئاوەدان دەبێتەوە!

وەبەندە رای بۆدەچێ کەماسکرانی مونافیقەکانو موشریکەکانیش دوابەدوای ئایەتی (ئەمانەت) ئاماژە بۆ ئەوانە کەبەهۆی تێکچوونی هێزی کردەییان . کەمونافیقەکانن . وەهێزی فیکرییان . کەهاوبەشپەیداکەرەکانن . دووچاری خەشمو توورەییو ئەشکەنجەی خوای دادگەر دێن. چونکە مونافیقەکان گیرۆگرفتیان نەزانی (جهل) نیە بەڵکو

نەتوانینەوە. هاوبەش پەیداکەرەکانیش دەردیان لەعەقڵ و عیلم و تێگەیشتنیان داوە. دیسان دەشگونجێ بڵێین: مونافیقەکان نموونەی زەقی ئەوانەن کەبەهۆی خیانەت لەئەمانەتی (هیدایەت)ی خواوە ڕیسوا دەبن. چونکە دەزانن ئایین چییەو پشت گوێی دەخەن.
هاوبەش پەیداکەرەکانیش نموونەی زەقی ئەوانەن کەبەهۆی خیانەت و ناپاکی لەناپیەتمەندییەکانی ئینسان و بەزایەدان و بەکارنەهێنانیان لەشوێنی خۆیاندا زەبوون و سەرشۆڕ دەبن. چونکە ئەگەر عەقڵ و هۆش خۆیانیان بەکارهێنابا و بەلاساکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە وازیان نەهێنابا تووشی بتپەرستی نەدەبوون!
وەبرواداراتیش کەخوا لێیان دەبوورێ و بەزەیی یان لەگەڵ دەنوێنێ نموونەی ئەو جۆرە ئینسانانەن . بەڵکو هەر ئەوان ئەو جۆرە ئینسانانەن . کەهەردووک ئەمانەتی شەریعەت و فیطرەتیان پاراستووە. هەردووک هێزی فیکری و کردەیی خۆیانیان لەشوێنی خۆیاندا بەکارهێناوە و بەئەرکی کاری بەندایەتی و جێنشینایەتی و ئەمینداریێتی خوای بەرز و مەزن هەستاون!!
خوایە بەلوتفی خۆت لەریزی ئەوانەو بەڵکو لەریزی پێشەوەی ئەوانەمان حیساب بکە کەبەراستی بەندەو جێنشین و ئەمینداری تۆن لەسەر زەمین و هێندەی نووکی دەرزیش خیانەت لەهیچ ئەمانەتێك ناکەن! ئامین.

## ٤- دەرچوون لەتاقیکردنەوەی ژیانی دنیا:

خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ تبارك الذي بيده الملك وهو على كل شيء قدير الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا وهو العزيز الغفور ﴾ الملك (١-٢). واتە: بەرزی و پیرۆزی بێ بۆ ئەو زاتەی کەموڵك هەر بەدەست ویەو لەسەر هەموو شتێکیش بەتوانایە، ئەوەی کەژیان و مردنی ڕەخساندووە تاکو تاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەی باشترە، وەئەو زاڵ و لێبووردەیە.
بەڵێ...ڕوویەکی تری ئەو ئەرك و ئامانجەی کەئینسانی لەسەر زەمین بۆ خوڵقێنراوە، بەس ئیماندارانیش توانا و لێوەشاوەیی وەدیهێنانیان هەیە. بریتییە لەدەرچوون لەتاقیکردنەوەی ژیانی سەرزەمین. چونکە ژیانی ئینسان لەسەر زەمین دەرفەتێکە تێیدا تاقی دەکرێتەوە، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەبابەت (موضوع)ی تاقیکردنەوەکە کردەوەی چاکتر (أحسن عملا) ە. ئەویش وەك زانا و توێژەرەوانی قورئان فەرموویانە: بریتییە لەڕاستتر و پاکتر (أصوبه وأخلصه). وەلەبەر ئەوەی کەڕاستبوون (صواب)ی کردەوان و پاك (خالص) بوونیشیان تەنها و تەنها لەڕێگەی: خوای مەبەستبوون (الإخلاص) و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (اتباع النبي ﷺ) ەوە مسۆگەر دەبێ. لەبەر ئەم هۆیانە کەباس کران جگە لەکۆمەڵی مسوڵمانان و شوێنکەوتووانی سەروەری پێغەمبەران (موحەممەد ﷺ) هیچ گەل و کۆمەڵێکیتر شایستەیی دەرچوونیان لەو تاقیکردنەوە

سە. چونکە، وەك گوتمان خوای کاربەجێ بابەتی تاقی کردنەوەی ئینسانی بەکردەوەی ـــت و پاك داناوە، ئەم دوو مەرجەی کردەوانیش بەس لەگەروی (إصابة) و (إخلاص) دانەر ئەمانیش تەنهاو تەنها لەدوو سەرچاوەی ڕوونی خوایەکگرتن (التوحید) و پەیڕەوی لەپێغەمبەرکردن (إتباع النبي ﷺ) هەڵدەقوڵێن، دیارە ئەم دووانەش بەس لەئیسلامدا چنگ دەکەون!!

## هـ- ئاوەدانکردنەوەی زەمین (عمارة الأرض):

خوای زانا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ قال یاقوم اعبدوا الله مالکم من إله غیره هو أنشأکم من الأرض واستعمرکم فیها ﴾ هود (٦١)، واتە: ...گوتی ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن چ خوای ترتان نیی جگە لەوی، هەر ئەو لەزەمین پەی‌گەیاندوون و بۆ ئاوەدانکردنەوەیشی لەوێ داناون..

دیارە مەبەست لەئاوەدانکردنەوەی زەمین بەهرەمەندبوونی ئینسانەکانە لەخێر و بێر و سازو نیعمەتەکانی و سوود لێ وەرگرتنیانە بەچاکترین شێوە بۆ گەشەپێدانی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر زەمین لەهەردووك بواری ماددی و مەعنەویدا، چونکە بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی ڕێچکەی بیردۆزە مرۆڤزادەکان ئیسلام دەڵێ ئینسان لەگڵی زەوی و گیان (ڕوح) یکی خوایی پێکهاتووە: ﴿ إني خالق بشرا من طین فإذا سویته ونفخت فیه من روحي ﴾ ص (٧١-٧٢). کەوابێ پێویستە زیاد و گوزەران و شارستانێتی (حضارة) یەکیشی لەسەر هەرکام لەم دوو شادەمارە بنیاد بنرێن، هەردووك لایەنی ڕووحی و ماددی تێدا ڕەچاوبکرێن، ئەگینا لاتەنگ و لاسەنگ و خوار و خێچ دەردەچێ!

ئنجا بەتەئکید بەتەئکیە ئاوەدانکردنەوەی زەمینیش بەو شێوەیەو بەو هاوسەنگی (توازن) ەی نێوان ڕووح و ماددە و وەحی و عەقڵ و دنیاو قیامەت تەنهاو تەنها بەهۆی پیادەکردنی بەرنامەی کۆتایییەوە مەیسەر دەبێ، ئەو بەرنامە کۆتایییەی خوا کەبەدوایی پێغەمبەری خۆیدا ناردوویەتی. کەئەمیش بەس لەوەزەی کۆمەڵی مسوڵمان دایە، چونکە بەس ئەوان پەیڕەوی قورئان و شوێن کەوتووی سەروەری پێغەمبەرانن (صلی الله علیهم وسلم)، کەواتە: ئاوەدانکردنەوەی زەمینیش بەمەعنای ڕاست و دروستی ئەرزو ئەمانجێکە بەس بەکۆمەڵی مسوڵمان دێتەدی.

# ٦- چەسپاندنی دادگەری لەنێو مرۆڤایەتیدا لەسەر زەمین:

خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ لقد أرسلنا رسلنا بالبينات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط وأنزلنا الحديد فيه بأس شديد ومنافع للناس وليعلم الله من ينصره ورسله بالغيب إن الله قوي عزيز ﴾ الحديد (٢٥).
واتە: بەڕاستی پێغەمبەرانی خۆمانمان بەبەڵگە ـ معجزة ـ ئەوە ڕەوانەکردووە و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونەخوار تاکو خەڵکی بەدادگەری بەڕێوە بچن، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوار هێزێکی زۆری تێدایە، وەسوودی کەڵکی زۆر بۆ خەڵکی، وەبۆئەوەی خوا بزانێ داخوا کێ خۆی و پێغەمبەرەکانی بەنادیاری ـ واتە لەحاڵەتێکدا کەخوا بەنهێنیشە ـ سەردەخات، بێگومان خوا بەهێز و زاڵە.

لەم ئایەتە بەهێز و پیرۆزە دەردەکەوێ کەچەسپاندنی دادگەری لەنێو مرۆڤایەتیدا ئەرك و ئامانجی تێکرای پێغەمبەرانی خوا بووە (عليهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسليمات) چونکە دادگەری یەکێکە لەناو سیفەتە بەرز و پیرۆزەکانی خوای دادگەر، هەربۆیەش ئەم دادگەری و هاوسەنگی و ڕێك و پێکییە لەهەموو بوونەوەردا دەدرەوشێتەوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ الرحمن علم القرآن خلق الإنسان علمه البيان الشمس والقمر بحسبان والنجم والشجر يسجدان والسماء رفعها ووضع الميزان ألا تطغوا في الميزان وأقيموا الوزن بالقسط ولا تخسروا الميزان ﴾ الرحمن (١-٩). ئەوە مرۆڤیش کەشاگوڵی باخی بوونەوەر و سەرتۆپی کائیناتە و هەڵبژاردەی نێو هەموو دروستکراوەکانی خوایە و هەڵگری سپاردەیەکی بەڕێوەبەری ئەرکێکە کەهەموو بوونەوەر توانای هەڵگرتنی و شایستەیی بەڕێوەبردنیان نەبووە! وە (ئینسان) یش کەجێنشینی خوایە لەچاکترین پێکهاتن دروستی کردووە، بۆ دەرخستنی زیندە ڕێز و حورمەت و قەدری بەفریشتەکانی فەرموو کەکڕنووشی ـ ڕێز و حورمەت و قەدرگرتنی ـ بۆ بەرن! ئینسانێکی ئاوا نابێ لەسیستەمی گشتیی بوونەوەر ڕیزپەڕ (شاذ) بێت و دەبێ ئەو دادگەرییە لەژیان و گوزەرانی ئەویشدا بدرەوشێتەوە، بگرە چەسپاندنی دادگەری لەژیانی ئینساندا لەچاو هەموو دروستکراوەکانی تر گرنگتر و پێویستترە، چونکە ئینسان جێنشینی خوایە و جێی خۆیەتی لەقەدەر ویش بێت! ئەوە ئەگەر لەبارانیشدا نەبووایە لەقەدەر وی بێت، خوا ئەو ناوەی لێنەدەنا و ئەو ئەرکەیشی پێنەدەسپارد، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەئینسان وەك باقی دروستکراوەکان نیە کەملی پێکەچ کرابێ بۆ چەند یاسایەکی فیزیایی و کیمیایی و بایۆلۆجی و...هتد کەتوانای سەرپێچیی نەبێت، بەڵکو بەمەبەستی ئەوە کەبەکەڵکی تاقیکردنەوە و جێبەجێکردنی ئەو ئەرك و کارە کەپێی سپێرراوە، خوای کاربەجێ کردوویەتی بەدروستکراوێکی ئازاد و تاقە لەنێو هەموو کائیناتدا ویستی ئازاد (الإرادة الحرة) ی پێداوە، لێی گەڕاوە بۆخۆی بەڕێوە

بچێ و زیان و گوزەران و عەقڵ و کەونەکانی دیاری بکات. ئینجا بۆئەوەش کەناچار (مجبور) بێت ـ ئەگەر پەیوەی لەتاقی کردنەوەی خوا دەربچێ و ئەرك و کاری سەرانی خۆی بۆ بەرێوە بچێ ـ هەر بەندەی خوا بێت و لێی دوورنەکەوێتەوە. چونکە سەختەوەری دنیاو قیامەتی لەو بەندایەتییە داید بابۆخۆشی هەندێك جار لەو راستییە بێ ئاگابێت.

بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە دیارە بەبێ هاوکاری و یارمەتیی خوای میهرەبان و دادگەر ئینسان توانای بەرێوەچوونی دادگەرانەی نیە لەسەر زەمین. بۆیە خوای کاربەجێ ئەو تەرازووی دادگەرییەی بەپێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆیدا بۆ ئینسان رەوانەکردووە. کەواتە دیارە تەنها پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) و پەیڕەو شوێنکەوتووانیان توانای ئەوەیان هەیە کەژیانی ئینسانەکان لەسەر زەوی لەهەموو رووێکەوە هاوسەنگ و تەرازوو بکەن و دادگەری (عدالة) ی تێدا سەقامگیر بکەن. وای لێبکەن لەهیچ رووێکەوە بەهیچ لایەکدا خوار نەبێ و دانەلەنگێ.

دیارە هەربۆیەشە کەهەر لەدوای باسکردنی بەرپاکردنی دادگەری. خوای زانا باسی دروستکردنی ئاسن (حدید) ی کردووە و ئاماژەیشی بەوە کردووە کەوێرای سوودو کەڵکی زۆر هێزو توانایەکی باشیشی تێدایە، چونکە بێگومان بەبێ هێزو دەسەڵات. کەبەزۆری بەهۆی ئەو چەك و چۆلەوە پەیدا دەبێ کەلەئاسن دروست دەکرێ. ئاگرانجی دادگەری بچەسپێنرێ و ستەم و بێداری بەهەموو جۆرەکانییەوە بنەبر بکرێ و ژیانی مرۆڤایەتیی لێ پاك بکرێتەوە. شایانی باسیشە کەمەبەست لە (دادگەری چەسپاندن) چەسپاندنیەتی لەهەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و نیزەمی... هتد.

# ٧ـ بەرپاکردنی بەرنامەی خوا لەسەر زەمین (إقامة دين الله على الأرض):

خوای بەرزو مەزن لەو بارەشەوە فەرموویەتی: ﴿ شرع لكم من الدين ماوصى به نوحا والذي أوحينا إليك وماوصينا به إبراهيم وموسى وعيسى أن أقيموا الدين ولاتتفرقوا فيه كبر على المشركين ماتدعوهم اليه الله يجتبي إليه من يشاء ويهدي إليه من ينيب ﴾ الشورى (١٣). واتە: ئەوەی بۆ ئێوە کردۆتە رێباز لەبەرنامەی خۆی کەنوحی بێ راسپاردبوو وئەوەی بۆتۆمان ناردووە و ئەوەی ئیبراهیم و موساو عیسامان پێ راسپاردبوو، کەئاینی ـ ی خوا ـ بەرپا بکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن. هاوبەشبڕیارداکەران ئەوەی تۆ بۆیانی بانگ دەکەی زۆر لەسەریان گەورە ـ وگرانە .. خوا هەرکەسێکی بوێ بەرەو لای خۆی هەڵی دەبژێرێ و هەرکەسێکیشی بوێ بگەرێتەوە لای ئەوە بەرەو لای خۆی رێبروونیی دەکات.

ئەو پێنج پێغەمبەرە پایەبەرزەی کەلەم ئایەتە پیرۆزەو ئایەتی ژمارە (٧) ی سوورەتی

(الأحزاب) یشدا ناویان هاتووە کە (نووحو ئیبراهیمو مووساو عیساو موحەممەد) ن گەورەترین صەڵاتو چاکترین سەلامی خوایان لێبێ بە (أولوا العزم) ناسراون کەگەورەو سەروەری هەموو پێغەمبەرانی خوان (علیهم الصلاة والسلام) جا بەپێی ئەم ئایەتە بەرنامەی تێکڕای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەکاکڵ و نێوەرۆکدا یەکە. جیاوازییەکیان کەهەبێ پەیوەندیی بەباروودۆخو تایبەتمەندییەکانی کاتو شوێنو کۆمەڵگاکانەوە هەیە.

دیارە مەبەستیش لەبەرپاکردنی ئایین (إقامة الدین) ئەوەیە کەدوایین بەرنامەی خوا کەلەقورئانو سوننەتدا خۆی دەنوێنێ لەژیانی تاکو کۆمەڵدا بکرێتە فەرمانڕەواو بەیەکدەستیو یەکدەنگیو یەکڕەنگی کار بۆ ئەم ئامانجو ئەرکە گەورەو گرنگە بکرێ.

هەڵبەتە تەنها کۆمەڵێکیش کەتوانای جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەو شایستەی هێنانەدیی ئەو ئامانجە بەرزەیان هەبێ شوێنکەوتووانی پێغەمبەری کۆتایین ﷺ. چونکە هەر ئەوان بەرنامەیەکی تێرو تەواوو دەستکاری نەکراوی خۆیان لەبەردەستەو بەسی ئەوانیش بڕوایان بەگشت پێغەمبەرانی خوا هەیەو جیاوازییان ناخەنە نێوانەوە. وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ آمن الرسول بما أنزل إليه من ربه والمؤمنون كل آمن بالله وملائكته وكتبه ورسله لانفرق بين أحد من رسله ﴾ البقرة (٢٨٥).

شایانی گوتنیشە کەبەرپاکردنو پیادەکردنی بەرنامەی خوا لەسەر زەمین هەموو ئەو ئەرکو ئامانجە بەرزو گرنگانەی کەلەخاڵەکانی پێشوودا باس کران دەگرێتە خۆی. چونکە:

لەکاتێکدا بەرنامەی خوا لەسەر زەوی - بەشێکی زۆری یان هەمووی - دەچەسپێو دەبێتە سێبەری بەشەریەتو لەژێریدا کۆدەبێتەوە. ئینسانەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێ کەبەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا ئەنجام بدەن.

دیسان بەس لەکاتی حوکمو فەرمانڕەوایەتی ئایینی خوادا مرۆڤایەتی دەتوانێ ئەرکی جێگرایەتیی خوا لەسەر زەمین بەجێ بگەیەنێ. بەمەش شایستەی ئەوەبێ کەسپاردەی گەورەو گرانی خوا هەڵگرێو بێتە ئەمینداری!

وەلەژێر سایەی حوکمی خوادا نەبێ ئینسان توانای ڕووسووربوونەو دەرچوونی نابێ لەتاقیکردنەوەی ژیانی سەر زەویدا.

وەتەنها بەهۆی سەقامگیربوونی حوکمو بەرنامەی خواوە ئینسان دەتوانێ بەمەعنای ڕاستەقینەی وشە سەرزەمین ئاوەدان بکاتەوەو لەخێرو بێرەکانی بەهرەمەند بێتو ژیانێکی نەوتزی لەسەر بنیاد بنێ کەلەسەری قەرزار نەبێتەوەو نەبێتە مایەی شۆڕبوونەوەو خلۆربوونی بەرەو قووڵاییەکانی چاڵی بێئامانجی دۆزەخی بڵێسەدار.

## وەلەکۆتاییدا:

لەسەنگەی حوکمڕانێتی بەرنامەی خواوە نەبێ قەت قەت ناگرتنجێ دادگەریی

راستەقینەو هەمەلایەنە لەژیانی مرۆڤایەتیدا بچەسپێ و بەرقەراربێ. چونکە ئینسان هەرچۆن بێ هەر ئینسانەو بەبێ پابەندی بەهیدایەت و بەرنامەی خواوە لەستەم و نەفامی (الظلم والجهل) لوتاری نابێ و، مێژووی کۆن و نوێ و واقیعی هاوچەرخیش باشترین بەڵگەو شایەدە بۆ ئیسپاتی ئەوە کەئینسان دوور لەهیدایەتی خواو پابەندی بەرنامەکەیەوە، لەبەر ستەم و نەفامی، تەت چاوی بەرۆژی رووناکی دادگەری نەکەوتووەو ناکەوێ. وەمێژووی دەوڵەتی ئیسلامیش بەگشتی و بەتایبەت چاخ و سەردەمە زێرینەکانی. چاکترین بەڵگەو شایەدە بۆ سەلماندنی ئەو راستییەی کەدا دادگەریی موتڵەق و هەمەلایەنەو بێ (قەیدو شەرت) تەنهاو تەنها لەژێر سایەی ئیسلامدا بۆ مرۆڤایەتی دەرەخسێ. کەبەبێ ئەوەی گوێ بداتە جیاوازییەکانی رەنگ و رەگەز و زمان و، مەسەلەی کوفرو ئیمان و ئایین و مەزهەبەکان بەیەك چاو سەیری ئینسانەکانی کردووە لەمەسەلەی هەق و ناهەقدا بەیەك تەرازوو هەموویان کێشاوەو هەڵسەنگاندووەو نرخاندوویەو هەقی بەخاوەن هەق داوەو ناهەقی و ستەمیشی لەهیچ کەس قبووڵ نەکردووە. ئەگەرچی گەورەترین و بالاترین دەستەڵاتی دەوڵەتیش بووبێ کەخەلیفەیە[1].

(تەواو بوو)

٢/شەووال/١٤١٦، ٢١/شوبات/١٩٩٦

مەریوان

■ ■ ■

---

(١) لەمێژووی ئیسلامدا بەسەرهاتی لەم بابەتە زۆرە کەخەلیفەو سەفەرێکی ئاسایی بەجووتە لەبەردەم دادگا وەستاون و خەلیفەش (مەحکووم) کراوە.

# ڕێ خۆشکردن

مەبەستمان لەوشەی مەبەست (الغاية) ئەو هیواو ئاواتەو ئومێدەیە کەئینسان دەیەوێ لەدواڕۆژدا پێی بگات. جادیارە ئەو هیواو ئومێدە هەرە بەرزو پیرۆزەش کەئینسانی موسڵمانو کۆمەڵی خوا هەموو کڕنووشو ڕەنجو تەقەلالای پەنهانو ئاشکراو فیکریو ڕۆحیو کردەییو تاکیو کۆمەڵی خۆیانی لەپێناودا دەدەن ئەوەیە کەخوای پەروەردگارو خاوەن هەموو چاکەو لوتفو کەرەمو بەخشینێک، بەبەندەی پەسندی خۆی حیسابیان بکاتو، بەڕەزامەندیی خۆیو بەهەشتی بەرین شادیان بکاتو، لەئاگرو مەشخەڵی بەتینی دۆزەخ ڕزگاریان بکاتو چەپاڵدیان بدات.

جائێمە خوا یاربێ لەم بەشی دوازدەهەمەدا لەبەر تیشکی قورئانو سوننەتدا لەم حاڵەندا مەسەلەی (مەبەست) دەتوێژینەوەو قسەی لێدەکەین:

١. جیاوازیی نێوان ئامانج (الهدف) ومەبەست (الغاية).
٢. گرنگیو بنەڕەتیبوونی نیاز (النية) لەئیسلامدا.
٣. مەبەستی تاکو کۆمەڵی موسڵمانان گەورەترینو بەرزترینو پاکترین مەبەستە.
٤. کاریگەریی مەبەست لەژیانی تاکو کۆمەڵی موسڵماندا.
٥. ئایا ڕەزامەندیی خواو داواکردنی بەهەشت پێکەوە ناکۆکن؟!

بەڵام وەک هەموو باسەکانی تری ئەم بەرنامە فکرییە زیاتر لای کورتیو پوختیو مەعنای زۆرو وشەی کەم هەڵدەبژێرینو، بەهیوای ئەوەی سەلیقەو زیرەکیی خوێنەری بەڕێزیش کەلێنو بۆشاییی زۆر ڕوونەکردنەوەو کەم لەسەر ڕۆیشتن پڕبکاتەوە، عوزرو پاساوەکانیش کەلێرەدا بیهێنینەوە ئەوەیە کەئێمە ئەم نووسراوەمان بۆ کەسانی سەرەتایی نەنووسیوە، دیارە شتیش زیاتر بۆ چجۆرە کەسانێک بنووسرێ دەبێ زیاتر ئاستو شێوازی گونجاو بۆئەوانی تێدا ڕەچاوبکرێ.

## ١: جیاوازیی نێوان ئامانجو مەبەست (الفرق بين الهدف والغاية):

لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئامانج (الهدف) ئەو شتەیە کەئینسانی موسڵمانو کۆمەڵی موسڵمان پێی (مكلف) کراونو، فەرمانیان پێکراوە وەک ئەرکێکی گەورەو گرنگی خۆیان لەبەرامبەری ژیانی دنیایاندا پێی هەڵسنو جێبەجێی بکەن، بۆ وێنە:

(بەندایەتی کردن بۆ خوا) ئەرکو ئامانجێکە کەلەئینسانی موسڵمانو کۆمەڵی

موسڵمان داواکراوەو فەرمایشتیان پێ کراوە کەلەژیانی دنیایاندا بیهێننەدی. وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ فاعبد الله مخلصا له الدين ﴾ الزمر (٢)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة وذلك دين القيمة ﴾ البينة (٥).

دیسان (بەرپاکردنی ئایین) ئەرك و ئامانجێکە کەوەك تەکلیفێکی دنیایی خراوەتە سەر شانی کۆمەڵی موسڵمانان و لەسەری پێویست کراوە کەلەژیانی دنیایدا هەوڵی هێنانەدی (تحقيق) ی بدات. وەك دەفەرموێ: ﴿ أن أقيموا الدين ﴾ الشورى (١٣) . بەڵام مەبەست (غاية) ئەو لوتکە هەرەبەرزو دوورەیە کەئینسان و کۆمەڵی موسڵمان بەرەو رووی دەچن و. دەیانەوێ لەدوارۆژدا کەدوا قۆناغ و مەنزڵگای سەفەری ژیانی ئینسانە پێی بگەن. کەلەڕوانگەی ئیسلامەوە بریتییە لەڕەزامەندیی خواو پاداشت و چاکەو بەخششی ئەو کەلە (بەهەشت)دا حەزی دەنوێنێ، وەك خوای خاوەن ئەوپەڕی چاکەو بەخشش فەرموویەتی: ﴿ محمد رسول الله والذين آمنوا معه أشداء على الكفار رحماء بينهم تراهم ركعا سجدا يبتغون فضلا من الله ورضوانا ﴾ الفتح (٢٩).

ئنجا شایانی باسە کەگەیشتن بەمەبەست لەڕوانگەی ئیسلامەوە هەر لەمیانە (خلال) ی جێبەجێ کردن و هێنانەدیی ئامانجەوە مەیسەر دەبێ و. بەئەندازەی ئەوە کەئینسانی موسڵمان سەرکەوتوو دەبێ لەجێبەجێ کردنی ئەو ئەرك و تەکلیفەی کەلەژیانی سەرزەویدا پێی سپێرراوەو هێنانەدیی ئەو ئامانجەی کەداوای لێ کراوە. سەرکەوتووش دەبێ لەگەیشتن بەو لوتکە بەرزو بڵێندەی هیواو مەبەستەی کەلەدوارۆژدا بۆی دیاری کراوە. بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە نابێ لێی بێ ئاگابین. ئەویش ئەوەیە کەهەرچەندە گەیشتن بەم ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی بەرین لەمیانەی هێنانەدیی (ئامانج) ی دنیاییەوە مسۆگەر دەبێ. بەڵام مادام ئینسانی موسڵمان توانای خۆی بەکارهێناو هەوڵ و کۆششی خۆی خستەگەڕ هەموو دەمێ بەتایبەت لەبواری چالاکییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا هێنانەدیی ئامانج و جێبەجێ کردنی ئەرکی دنیایی بەحەتمی نەکراوەتە مەرجی گەیشتن بەمەبەست. بەکورتی ئینسان بۆ گەیشتنی بە (مەبەست) بەس هەوڵ و تەقەلاداو دریغی نەکردن لەلایەك و خواپێ مەبەست بوون و ئیخلاصی لەلایەکی ترەوە لەسەر کراوە بەمەرج. ئیدی هەموو ئینسانێکی موسڵمان مادام دریغی نەکرد لەهەوڵ و کۆشش و خەبات بۆ جێبەجێ کردنی ئەرك و ئامانج و ئیخلاصیشی هەبوو. بەس مەبەستی خوا بوو. ئەوە بێگومان بەئاوات و هیوای دوارۆژ گەیشتن و بەدیداری خوا شادبوونی مسۆگەرە. خوای دادگەریش لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ إن الله لا يضيع أجر المحسنين ﴾ التوبة (١٢٠).

دیارە هەر لێرەشەوە دەتوانین ئەو مەتەڵە حەل بکەین و هەڵبێنین کەپێغەمبەرێکی گەورەو پایە بەرزی وەك نووح (عليه الصلاة والسلام) جۆن لەڕیزی پێنج پێغەمبەرە (أولو العزم) دەکەیە لەگەڵ ئەوەشدا کەژمارەیەکی کەم نەبێ بڕوایان پێ نەهێنا. هەرچەندە

نزیکەی پەنجا (٩٥٠) سـاڵیش لەگەڵیان خەریک بوو! وەک خوای پەروەردگار فەرمووێەتی: ﴿ ولقد أرسلنا نوحا إلى قومه فلبث فيهم ألف سنة إلا خمسين عاما ﴾ العنكبوت (١٤)، وەفەرموویەتی: ﴿ وما آمن معه إلا قليل ﴾ هود (٤٠).

بەڵێ... گرنگ ئەوەیە ئینسان ڕێبازی خوا بگرێ و چی لەدەستدێ درێغی نەکات بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرک و کارانەی کەلەژیانی دنیایدا پێی سپێرراون، وەک باوای جوتیار زەوییەکەی چاک بکێڵێ و هەڵیبوێژێرێ و تۆوی باشی تێدا بوەشێنێ و هەرچی دەکەوێتەوە سەر ئەو ئەنجامی بدات. باقییەکەیشی سەوز دەبێ یان نا؟ باران دەبارێ یان نا؟ سن و کوللە لێی دەدات یان سەلامەت دەبێ؟ ئەوە عایدی ئەو نییە بەدەست خوایە. مادام ئەو لەدابین کردنی ئەو هۆو پێداویستییانەدا کەپێویستن بۆ سەرگرتنی کارەکە کەمتەرخەمیی نەکرد، جێی لۆمەو ڕەخنە نابێت و، هەوڵ و کۆشش و کاروخەباتی جێی ڕێزو حورمەت و تەقدیرە!

# ٢- گرنگیو بنەڕەتیبوونی نیاز (النية) لەئیسلامدا:

(نیاز) ی ئینسان بریتییە لەو هاندەرو پاڵنەرە دەروونییەی کەوای لێدەکات کارو چالاکییەکانی خۆی چ دەروونی بێ، چ زمانی، چ کرداری ئەنجام بدات، جالەئیسلامدا نیەتی ئینسان بەئەسڵ و بنەڕەتی هەموو جۆرە کارو چالاکییەکان دادەنرێ چ تاکی بێ چ کۆمەڵی. وەلەزۆر دەقی قورئان و سوننەتدا باسی گرنگی و کاریگەریی نیەت کراوە هەم بۆ سەرگرتن و بەرهەمداربوونی جموجۆڵ و چالاکییەکان و، هەم بۆ قبووڵبوون و پاداشت لەسەر وەرگرتنەوەشیان لەلایەن خوای گەورەوە. بۆ وێنە خوای گەورە فەرموویەتی:

- ﴿ إنما يتقبل الله من المتقين ﴾ المائدة (٢٧).
- ﴿ إنا أنزلنا إليك الكتاب بالحق فاعبد الله مخلصا له الدين ﴾ الزمر (٢).
- ﴿ وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء ﴾ البينة (٥).
- ﴿ لن ينال الله لحومها ولا دماؤها ولكن يناله التقوى منكم ﴾ الحج (٣٧).

پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرموویەتی:

- ﴿ إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل امرئ مانوى ﴾ متفق عليه.
- ﴿ يخسف بأولهم وآخرهم ثم يبعثون على نياتهم ﴾ رواه البخاري ومسلم.
- ﴿ إن أقواما خلفنا بالمدينة ماسلكنا شعبا ولا واديا إلا وهم معنا حبسهم العذر ﴾ رواه البخاري.
- ﴿ إن الله لاينظر إلى أجسامكم ولا إلى صوركم ولكن ينظر إلى قلوبكم ﴾ رواه مسلم.

لەم دەقانە دەفامرێتەوە كەدەبێ هەبوونی نیازو ئیخلاصی پاك و بێخەڵتە ئینسان نەبەرهەم و پاداشتی دوارۆژو نەبەرەكەتی دنیایی چنگ ناكەوێ، ئەمە لەسەرێكەوە لەسەرێكی دیكەشەوە ئینسان كەنیەتی چاك و پاك بوو زۆر جار ئەو نیازە پاك و چاكە شەفاعەتی بۆكردەوەیی بۆ دەكات و بۆی قەرەبوو دەكاتەوە. بەڵام بەمەرجێك درێغی نەكردبێ و خەتای خۆی نەبووبێ و پەرچێك هاتبێتە پێش كەلەسەرووی ئیرادەی خۆیەوە بووبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەراشكاوی لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ من سأل الله تعالى الشهادة بصدق بلغه الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه ﴾ رواه مسلم. واتە: هەر كەسێك بەراستی داوای شەهیدی لەخوای بەرز بكات، خوا دەیگەیەنێتە پلەو پایەی شەهیدان تەنانەت ئەگەر لەسەر جێگاو نوێنی خۆشی بمرێ.

بەڵام لێرەدا دەبێ زۆر لەخۆی وریا بێت و خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ و تەنها بەوەی كەخۆزگەو گومانێكی لەدڵدا هەیە پێی وابێ كەڵێنی كردەوانی بۆ پردەكاتەوە بەڵكو دەبێ ئەوەی عەزم و بڕیار (تصمیم) ی جەزم و دامەزراوی لەدڵدا پەیدابووبێ! هەربۆیەش پێغەمبەرمان ﷺ لەفەرموودەیەكیدا فەرموویەتی: ﴿ ..وكذبوا لو أحسنوا الظن لأحسنوا العمل ﴾[1].

## ٢- مەبەستی مسولمانان بەتاك و كۆمەڵەوە گەورەترین و بەرزترین و پاكترین مەبەستە:

بەڵێ... مەبەست و ئاواتی ئینسان و كۆمەڵی مسوڵمان لەنێو هەموو كەس - ئەگەر هەموو كەسیش بگونجێ مەبەستی هەبێ - گەورەترو بەرزترو پاكترە، چونكە جگە لەمسوڵمان هیچ كەس مەبەستی لەچوارچێوەی دنیا ناچێتە دەرەوە. دیارە هەر شتێكیش پەیوەندی بەدنیاو ژیانی دنیاوە هەبێ هەر لەقەدەر دنیا دەبێ. چونكە (گۆزە چی تێدابێت هەر ئەوەشی لێدەڕژێ) و (كاریتەش لەكەفری هەڵناكەوێ). بەڵام مسوڵمان چونكە مەبەست و ئاواتەكەی پەیوەستە بەخواوە كەبریتییە لە (ڕەزامەندی) و (بەخشش) ەكەی كەلەبەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەدا تەجەللا دەكەن لەدوارۆژدا، بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە دیارە خاوەن (مەبەست) ێكە كەزۆر ڕاست و بەجێیە پێی بگوترێ: گەورەترین و بەرزترین و پاكترین (مەبەست)، ئاخر مەگەر خوا نەیفەرمووە: ﴿ وعد الله المؤمنين والمؤمنات جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ومساكن طيبة في جنات عدن ورضوان من الله أكبر ذلك هو الفوز العظيم ﴾ التوبة (٧٢). جائایا چشتێك لەڕەزامەندی خواو چاكەو بەخشش و نیعمەتی وی كەبەهەشتە گەورەترو بەرزترو

[1] بڕوانە: مفردات القرآن، ل١٢.

پاکترە؟!

ئنجا جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ ڕاستی‌یەکی تریش بکەین کەئەنجامی سرووشتی‌و ئاسایی ئەو ڕاستی‌یەی پێشوویە، ئەویش ئەوەیە کە:

گوتراوە (ئاواتی گەورە پیاوی گەورە درووست دەکات) کەواتە جێی خۆیەتی‌و پێویستیشە کەئێمەی ئاو کۆمەڵی مسوڵمان لەغەیری خۆیان گەورەترو بەرزترو پاکتربن‌و لەقەدەر ئەو ئاوات‌و مەبەستەی خۆیان بن کەکردوویانەتە لوتکەی ئومێدو ئاواتیان‌و لەپێناوی‌دا دەژین‌و دەمرن!

کۆتایی ئەم خاڵەش بەم سێ ئایەتە بەهێزو پیرۆزە دێنین کەزۆر پەیوەندی‌دارن بەم باسەمانەوە: ﴿ قل إنني هداني ربي إلى صراط مستقيم دينا قيما ملة إبراهيم حنيفا وما أنا من المشركين قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين ﴾ الأنعام (٦١-٦٣). واتە: بڵێ بێگومان من پەروەردگارم بەرەو ڕێبازێکی ڕاست ڕێنمایی کردووم، بەرنامەیەکی ڕێک‌و ڕاستە ڕێ‌و شوێنی ئیبراهیمە کەپاک‌و بێ‌گەردە - لەهەڵەو پەڵە - وەمن لەهاوبەش‌پەیداکەران نیم. بڵێ بێگومان نوێژو خواپەرستی‌و ژیان‌و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە. هیچ هاوبەشی نین بەوە فەرمانم پێ‌کراوە وەمن یەکەمی مسوڵمانانم.

# ٤- کاریگەری‌و دەوری (مەبەست) لەژیانی تاک‌و کۆمەڵی مسولماندا:

دیارە ئەم خاڵە هەر تەواوکەری خاڵی پێش خۆیەتی‌و خوا یاربێ لەچەند برگەیەکدا دەورو کاریگەری‌ی ئەو مەبەستە گەورەو بەرزو پیرۆزو چاک‌و پاکە کەئیسلام کردوویەتی‌یە لوتکەی هیوای شوێن‌کەوتووانی ڕوون دەکەینەوە:

## أ - بیرکردنەوەو خولیاو ڕەفتارو ئاکاری بەرزو پاک:

بەڵێ...بابایەك مەبەستی بەدیداری خوا شادبوون‌و خوا لەخۆ ڕازی‌کردن‌و گەیشتنە بەهەشتی بەرین‌و قوتاربوون لەدۆزەخی ئاگر بەتین بێ، بێگومان دڵ‌و مێشکی دەبنە کانگای بیرو خولیای بەرزو پاك‌و، ژیان‌و گوزەرانیشی دەبێتە کێڵگەی تێدا چاندنی داندوێڵەی هەموو هەڵس‌و کەوتێکی شەرعی‌یانە‌و، زەوی‌ی تێدا ناشتنی نەمامی درەختی هەموو کردارو هەڵوێست‌و ئاکارێکی ڕەببانی‌یانەی جوان‌و چاك! خوای زاناش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ والبلد الطيب يخرج نباته بإذن ربه والذي خبث لايخرج إلا نكدا كذلك نصرف الأيات لقوم يشكرون ﴾ الأعراف (٥٨)، واتە: خاکی بەپیت‌و پیرۆزیش بەفەرمانی پەروەردگاری ڕووەك - ڕەبەروبووم - وەکەی دێتە دەرێ، بەڵام خاکی پیس - بێ بەرەکەت - کەمێکی بێ‌خێر نەبێ دەرنانێ، ئاوەها ئایەت - ونیشان - ەکان جۆراوجۆر

دەکەین بۆ کۆمەڵێك کەسوپاسگوزاری بکەن.

## ب - ڕۆشن بوونی ڕێبازو پارێزران لەلادان (الانحراف):

خوای میهرەبان لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا وإن الله لمع المحسنین ﴾ العنكبوت (٦٩)، واتە: ئەوانەش کەوا لەپێناوی ئێمەدا تێ دەکۆشن بەتەئکید ڕێگاکانمانیان پێشان دەدەین، وەبێ شك خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە.

دەتوانین لەم ئایەتە بەپیتەو پیرۆزە ئەم پەندە بەهادارە دەربهێنین و بڵێین: (ئەوەی دەزانێ بۆ کوێ دەچێ، دەشزانێ بەکوێدا دەچێ!). بابۆ ڕوونبوونەوەی مەبەستیش ئەم قۆڵە نەزیلەیە بگێڕمەوە:

دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان قەیسی عامیری کەبە (مجنون) ناسراوە، ئیشتیاقی دیداری (لەیلا) ی خۆشەویستی زۆری بۆدێنێ و سواری حوشترێکی بەچکەدار دەبێ و بەرەو هەوارو مەنزڵی خێڵی (لەیلا) دەکەوێتە ڕێ، بەڵام پاش ماوەیەکی زۆر ڕێگابڕین سەیر دەکات بەر دەشت و بیابانی کاکی بەکاکی‌یەدا هاتۆتەوە شوێنی خۆی!! دووسێ جار ئەم هەوڵە دووبارە دەکاتەوە بەڵام بێهوودە دەبێ، چونکە وادیارە حوشترەکە هۆش و گۆشی هەر لەلای بەچکەکەی خۆیەتی و هەموو جارێ دێتەوە ئەو شوێنەی کەمەبەستی خۆی لەوێیە! ئەلا ئی مەجنوون!! پاشان بەناچاری حوشتری گۆزین وێڵ دەکات و دەڵێ: وادیارە مەبەستی من و تۆ لەیەکتر جیان و، ئەوجار بەپێیان بەرەو مەنزڵ و هەواری دۆستەکەی دەکەوێتە ڕێ و دوای ڕێگابڕین دەگاتەجێ.

بەڵێ...بێگومان (مەبەست) زۆر یارمەتی‌ی ئینسان دەدات کەڕێگا ببزر نەکات و بەملاو بەولاشدا لانەدات. کەوابێ دەتوانین بڵێین: مەگەر چۆن دەنا ڕێلێونبوون و هەتڵەبوون بەڵگەی نا (مخلص) بوونی ئینسانە، بەرلەوەی نیشانەی نەشارەزابوونی بێ لەئیسلامدا!

## ج - هۆکارو ئامرازەکان ناگونجێ شەرعی نەبن:

بەڵێ...بەڕاستی خراپێ‌مەبەست‌بوون لەکارو چالاکی‌دا والئینسان - چ تاك چ کۆمەڵ - دەکات و بگرە ناچاری دەکات کەهیچ کاتێك هەر بیریش لەهۆو ئامرازی ناشەرعی نەکاتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرك و کاروباره شەرعی‌یەکانی چجای دەستیان بۆ درێژ بکات، چونکە وەك زانایانی پێشینمان فەرموویانە: (إن الله تعالى تعبدنا بالأسباب والوسائل كما تعبدنا بالغايات والمقاصد)، دیارە مەبەستی شەرعیش هۆو وەسیلە شەرعی‌یەکان پەلکێش دەکات و، بەپێچەوانەوەش هەر ڕاستە.

مادام وابێ، بەئەندازەی ئەوە کەئینسان پەنا دەباتە بەر هۆو ئامرازە ناشەرعی‌یەکان دیارە بەدپەسەندکەشی هەر وایە، ئەگەرنا هەرۆەك چۆن کەسێك بزانێ بۆ کوێ دەچێ

دەشزانێ بەکوێدا دەچێ! دیسان دەڵێین: (هەرکەسێك بزانێ چی‌دەکات دەشزانێ چۆنی دەکات) !

## د - تەمەن بەفیڕۆ ناچێ:

جاچۆن کەسێك - یان کەسانێك - بۆ خوا بژیەن‌و بەتەمای شادبوون بەدیداری خوار گەیشتن بەرەزامەندی‌و پاداشتی بێ‌وێنەو بەخششی بێ‌سنووری بێت، ڕێگا بەساتەکانی تەمەنی کورتی دنیایی دەدات کەهەروا بێ‌هوودەو بێ‌بەرهەم تێپەڕن‌و لەدەستی دەربچن! مەگەر نرخی - یان ڕاستتر بڵێین هۆی - ئەو بەدیداری‌خواشادبوون‌و خوا لێ‌ڕازی‌بوون‌و لەبەهەشت سەقامگیربوونە هەر ئەو بەندایەتی‌و خواپەرستی‌و چاکەکاری‌و فیداکاری‌یە نیە کەدەبێ حەتمەن لەدوو توێی ئەم تەمەنە پێنج‌و دوو ڕۆژی‌یەی ژیانی دنیای‌دا ئەنجامیان بدات ؟! هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ قد أفلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون والذين هم عن اللغو معرضون ﴾ المؤمنون (١-٣).

کەوابێ: بەئەندازەی ئەوە کەئینسان‌و کۆمەڵی مسوڵمان بەقسەو ڕەفتاری پووچ‌و بێ‌هوودەوە سەرگەرم دەبن، شایەتی ئەوە لەسەر خۆیان دەدەن کەزۆر جیددی نین لەوەدا کەدەڵێن: بەس بۆ خوا دەژین‌و بۆلای وی دەچین؟ شاعیرێکیش جوانی گوتووە:

| | |
| --- | --- |
| تعصي الإله وتزعم حبه | لعمر الحق هذا في المقال بديع |
| لوكان حبك صادقا لأطعته | فإن المحب لمن يحب مطيع، |

## هـ - ژیانی دنیا لەگەڵ گچکەبوونەوەشیدا گرنگ‌و بایەخدار دەبێ:

بێگومان هەرکەسێك بەچاوی دڵ سەرنجی ژیانی دنیا بدات بەگجار کەم‌و گچکەو نابووتی دێتە بەرچاو، چونکە لەلایەنی کات (زمن) ەوە لەچاو تەمەنی بوونەوەر بەس چاوترووکانێکەو هیچی‌تر، وەلەلایەنی شوێن (مکان) ەوە لەچاو بوونەوەری پان‌و پۆڕو کەهکەشانە زل‌و زەبەلاحەکانی گەردیلەیەکەو هیچی‌تر، وەلەلایەنی ماهیەت‌و چۆنیەتی‌یەوە هەتا بڵێی پڕ کەم‌و کوڕی‌و ناخۆشی‌و تەنگەو چەڵەمەیەو ئینسان لەسەریشی قەرزار دەبێتەوە! هەربۆیەش خوای دادگەرو میهرەبان ژیانی دنیای زۆر پێ لەوە گچکەتر بووە کەپاداشتی چاکەکاران‌و سزای خراپەکارانی تێدا بداتەوە! بەو جۆرە بۆ بەندە وەفادارو چاك‌و پاك‌و خۆشەویستەکانی بەهەشتێکی ئامادە کردووە کەلەڕووی کاتەوە هەمیشەیی‌و بێ‌سنوورە: ﴿ خالدين فيها أبدا ﴾ البينة (٨)، وەلەڕووی شوێنەوە هەر پانایی‌یەکەی هێندەی ئاسمانەکان‌و زەمینە: ﴿ عرضها السموات والأرض ﴾ آل‌عمران (١٣٣)، لەڕووی ماهیەتیشەوە: ﴿ وفيها ماتشتهيه الأنفس وتلذ الأعين ﴾ الزخرف (٧١).

دیارە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لەم فەرموودەیەدا ڕیسوریەتی جیاوازی نێوان

ژیانی دنیاو بەهەشت تۆزێك لەعەقڵی سنوورداری ئێمە نزیك بخاتەوە: ﴿ ماالدنيا في الأخرة إلا مثلما يجعل أحدكم اصبعه في اليم فلينظر بم يرجع ﴾ رواه مسلم، بەڵام کەلەوەسفیدا فەرموویەتی: ﴿ .فيها مالاعين رأت ولا أذن سمعت ولاخطر على قلب بشر ﴾ رواه البخاري، ئەوە وێستوویەتی حەقیقەتیمان بۆ باس بکات کەبۆ ئێمەی ئەهلی دنیای سەر زەوی ئەو ژیانە بەرزو بێوێنەیە دەبێتە شتێکی نامۆ (غريب) و نەزانراو (مجهول) !!.

بەڵام وێرای ئەم ڕاستییەش ـ واتە وێرای زۆر گچکەو نابوت نواندنی ژیانی دنیا لەچاوی ئینسانی بڕواداردا کەبەچاوی عەقڵ و دڵ بەهەشت دەبینێ و لەگەڵ دنیادا ناچێتە تەرازووەوەو پێکەوە قیاس ناکرێن ـ ئینسان و کۆمەڵی موسڵمان هەرچەندە ژیانی دنیایان بێئارایە کەباسمان کردو حەقیقەتیش هەروایە، ئەمما لەژانی خۆشیدا یەکجار بەلایانەوە گرنگ و بایەخدارە، چونکە ژیانی هەمیشەیی دوارۆژی بەهەشت یان خواندخواستە دۆزەخ، بەم تۆزە ژیانەو چۆنیەتی گوزەراندن و بەڕێکردنیەوە بەستراوەو، ئەم ژیانە کەمەو کورتەی ئێرە پێشەکییەو ئەوەی ئەوێ ئەنجام و بەرهەمیەتی، ئاشکراشە ئەنجام و بەهەمێك هەرچەندە زۆر گەورەش بێت هەبێ پێشەکییەکەی هەرچەندە زۆریش گچکەو کەم بێ نایەتەدی، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە هەمیشە ئەنجام لەجینسو ڕەگەزی پێشەکییەکەیەتی چ چاك چ خراپ، چ هەڵە چ ڕاست. هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لاتسبوا الدنيا فإنها نعم مطية المؤمن ﴾. واتە: جنێو بەدنیا مەدەن چونکە باشترین وڵاخی سواری ئینسانی بڕواداره (واتە: هەروەك چۆن بابای ڕێبوار بەهۆی سواری وڵاخەکەیەوە دەگاتە مەنزڵ و قۆناغی خۆی بڕواداریش بەهەمان شێوە بەهۆی ژیانی دنیاوە دەگاتە مەنزڵ و هەوارگەی بەهەشت).

## و ـ بابای مسوڵمان لەسایەی ئەو تاقە مەبەستە بەرزەوە کەسایەتی یەکی دامەزراوی دەبێ:

ئەمەش جگە لەچەندان دەقی قورئان و سوننەت. واقیعی ژیانی بڕواداران بەتایبەتی دینداران بەگشتی دەلالەتی لەسەر دەکات و ئیسپاتیشی دەکات. خوای بێهاوتا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ الا إن أولياء الله لاخوف عليهم ولاهم يحزنون الذين آمنوا وكانوا يتقون لهم البشرى في الحياة الدنيا وفي الأخرة لاتبديل لكلمات الله ذلك هو الفوز العظيم ﴾ يونس (٦٢.٦٤)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إن الإنسان خلق هلوعا إذا مسه الشر جزوعا وإذا مسه الخير منوعا إلا المصلين الذين هم عن صلاتهم دائمون ﴾ المعارج (١٩ـ٢٣).

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ من كانت الدنيا أكبر همه فرق الله عليه امره وجعل فقره بين عينيه ولم يأته من الدنيا إلا ماكتب له، ومن كانت الأخرة نيته جمع الله له أمره وجعل غناه في قلبه وأتته الدنيا وهي راغمة ﴾ رواه ابن

ماجة باسناد رواته ثقات عن زيد بن ثابت رضي الله عنه، واته: هەرکەسێك ئاوات‌و هیوای دنیا بێت، خوا کاروباری لێ پەرژوبڵاو دەکات، وەهەژاریی دەخاتە نێوان هەردووك چاوەکانیەوە، دنیاشی بۆ نایەتە پێش مەگەر ئەو ئەندازەیەی کەبۆی نووسراوە، هەرکەسێکیش نیازو مەبەستی دوارۆژ بێت، خوا کاروباری بۆ کۆ دەکاتەوەو دەوڵەمەندیی دەخاتە دڵیەوە، وەدنیاش بەملکەچی دێتە بەردەستی.

لەفەرموودەیەکی دیکەش فەرموویەتی: ﴿ يقول الله: ابن آدم تفرغ لعبادتي أملأ صدرك غنى وأسد فقرك، وإلا تفعل ملأت صدرك شغلا ولم أسد فقرك ﴾ رواه ابن ماجة والترمذي وحسنه وابن حبان وصححه عن أبي هريرة، واته: خوا دەفەرمویّ: ئادەمیزاد! بۆ پەرستنی من یەکلا ببەوە، سینەت پڕ دەکەم لەدەوڵەمەندیی‌و کەلێنی نەداریت پڕ دەکەمەوە، خۆ ئەگەر وانەکەی سینەت پڕدەکەم لەسەرقاڵی‌و کەلێنی نەداریشت پڕناکەمەوە.

# هـ ئایا ڕەزامەندیی خواو داواکردنی بەهەشت پێکەوە ناکۆکن؟!

لەبەرهەم‌و شوێنەواری هەندێك لەئەهلی عیرفان‌و (تصوف) دا مەسەلەیەك باس‌کراوە کەبریتی‌یە لەوەی: (ئیمانی موسڵمان چەند لەڕازی‌کردنی خوا - سبحانه وتعالى - نابێ هاندەرو پاڵنەرێکی دیکەی هەبێ بۆ خواپەرستی‌و فەرمانبەری (طاعة)، چونکە خوا زۆر لەوە بەرزترو مەزنترە کەلەبەر خاتری بەهەشت یان لەترسی دۆزەخ بەندایەتی بۆ بکریّ‌و بپەرستریّ).

جا ئایا ئەم مەسەلەیە لەتەرازووی شەرعدا چۆنە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: وەك لەبەشی یەکەمی ئەم بەرنامەیەدا بەناوی (سەرچاوەی وەرگرتن) گوتوومانە: (دین) ئەوەیە کەلەقورئان‌و سوننەتدا هاتووەو غەیری ئەم دوو سەرچاوەیەو ئەوەی ئەمان دەلالەتی لەسەر دەکەن، ئێمە سەرچاوەیەکی ترمان نیە کەئاینی لێ‌وەربگرین، مادام وابێ زانار پێشەواو عاریفان هەرچەندە زۆر بەرزو بەرێزو ناودار بن، قسەو بیرو بۆچوونەکانیان هەر هەتا ئەو کاتە ئیعتیباریان هەیەو لێیان وەردەگیرێن کەلەمەحەکی قورئان‌و سوننەت دەربچن، ئنجا سەبارەت بەو قسەیەی سەرەوەش بەڵێ ڕاستە ئەگەر تەنانەت خوای پەروەردگار هیچ بەهەشت‌و دۆزەخیشی نەخوڵقاندبایە بێگومان شایستەی پەرستن‌و بەندایەتی بۆکردن بوو، چونکە (خوا) یە (جل جلاله)، بەڵام مادام پێغەمبەران‌و صالحان لەقورئانی‌داو پێغەمبەری خۆمان لەسوننەتی خۆیدا داوای بەهەشتیان لەخوای بەرزو مەزن کردووەو، پەنایان بردۆتەبەر لەترس‌و بیمی ئەشکەنجەو ئێشی دۆزەخ، مانای وایە ئەمە هەڵوێستی ڕاست‌و درووست‌و شەرعی‌یەو غەیری ئەوە مالی‌قەڵبیەو سەربەخاوەنیەتی.

کۆتایی ئەم باسەش بەم کۆمەڵە ئایەتەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دێنم: ﴿ إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لأيات لأولي الألباب. الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والأرض: ربنا ماخلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار. ربنا إنك من تدخل النار فقد اخزيته وماللظالمين من أنصار. ربنا إننا سمعنا مناديا ينادي للإيمان ان آمنوا بربكم فآمنا ربنا فاغفر لنا ذنوبنا وكفر عنا سيآتنا وتوفنا مع الأبرار. ربنا آتنا ماوعدتنا على رسلك ولاتخزنا يوم القيامة إنك لاتخلف الميعاد ﴾ آل‌عمران (١٩٠ـ١٩٤).

پێغەمبەری پێشەواشمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ اللهم إني أسالك موجبات رحمتك وعزائم رحمتك والسلامة من كل إثم والغنيمة من كل بر والفوز بالجنة والنجاة من النار ﴾ رواه الحاكم وقال حديث صحيح على شرط مسلم، واتە: ئەی خوایە، من داوات لێدەکەم هۆیەکانی پێویستبوونی ڕەحمەتت و هۆیەکانی لێبووردنی حەتمیی بەقسمەت بکەی، هەروەها سەلامەتی لەهەر گوناحێك و دەستکەوتم لەهەر خێرو چاکەیەك پێببەخشی، وەدارای گەیشتن بەبەهەشت و قوتاربوون لەئاگر ـ ی دۆزەخ ـ ت لێدەکەم.

ئەی خوای پەروەردگارمان! ئێمەش کەشوێنکەوتەو پەیڕەوانی پێغەمبەری تۆین ئەو چی لێداوا کردووی ئێمەش لێت داوا دەکەین، ئومێدەواریشین چیت بەو بەخشیوە لەقەدەر خۆی ئەوەش لەقەدەر ئێمە ببەخشی، خۆ ئەگەر خۆشمان شایستەیی ئەوەمان نەبێ مەگەر بەندەی تۆو ئوممەتی ئەو نین!! دەجا خوای پەروەردگار بمانخە بەر ڕێژنەی ڕەحمەت و لوتفی خۆت و سایەی شەفاعەتی ئەوەوە لەت لەت ڕەحمەت و لوتف و کەرەمی خۆتمان لێدوور مەخەرەوە..ئامین.

■ ■ ■

سوپاس بۆ خوای میهرەبان و بەخشەر، ئەم شەو سەعات دەوری (١٢) ی شەو لەپاکنووس کردن و دووبارە نووسین و پالاوتنی ئەم بەرنامە فیکرییە بوومەوە کەلەساڵی (١٤١٣ك ـ ١٩٩٣ز) لەسەر چیای (ماکۆك) لەبنکەیەك لەبنکەکانی ئیسلام لەحاڵەتێکی ڕووحی تایبەتیدا دەستم بەنووسینی کرد، ئێستاکە خوای بەبەزەیی یارمەتی لێبووردنەوەی دام.

خوایە پیت و پێزی تێبخەو بیکە مایەی زیاترو چاکتر گەشەکردنی کاری ئیسلامی لەکوردستان و غەیری ئەویشدا.

٣ـ٤/شەوال/١٤١٦، ٢٢ـ٢٣/شوبات/١٩٩٦، هەینی

مەریوان

# ناوەرۆک

● ●   ● ●   ● ●

# ئەم کتێبە...

ئەنجامو بەرهەمی بیرکردنەوەو رِامانو لێکۆڵینەوەو نزاو پارِانەوەی چەند ساڵێکەو هیوادارم بەسەرپێیی موتالاّ نەگرێ گرنگیو بایەخی شایستەی خۆی پێبدرێو ئەوەندە کاتەی لەگەڵ بەسەر ببرێ کەبایی لێحاڵیبوونو هەزمکردنیو ـ ئەگەر تواناش بوو ـ هەڵسەنگاندنی بکات.

﴿ بەشێك لەپێشەکیی کتێبەکە ﴾

ژمارەی سپاردنی بەکتێبخانەی نیشتیمانیی هەرێمی کوردستان (١٤٤) ساڵی ١٩٩٦

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستان